چاپی پێنجەم

# چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان

**بەرگی یەکەم و دووەم**

**وەرگێڕانی**

**دەستەیەک لە مامۆستایان**

بسم الله الرحمن الرحيم

# چیرۆكی

# ڕەوشتە جوانەكان



# چیرۆکی

# رەوشتە جوانەکان

ئامادەکردن و وەرگێڕانی:

دەستەیەک لە مامۆستایان

بەرگی

یەک و دوو

## چاپی پێنجەم

٢٠١٢ ١٤٣٣

بسم الله الرحمن الرحیم

**ناوی کتێب:** چیرۆکی رەوشتە جوانەکان

**نوسین و وەرگێڕانی:** دەستەیەك لە مامۆستایان.

**سەرپەرشتی چاپ و پێداچوونەوە:** ناصح محمد شریف

**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

**تایپ:** محمد ئیبراهیم

**دیزاین:** احمد عبدالله

**نۆبەتی چاپ:** چاپی پێنجەم

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٤٧٣)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی پیێ دراوە.



ناوەندی بڵاوکردنەوە
کتێبخانەی سارا
سلێمانی بازاڕی ڕاپەڕین
٠٧٤٨ ١٢٢٩٩٢٣

# پرۆژەی هیوا هەوڵێکی دڵسۆزانەیە بۆ :

١- دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی بە کتێبی ئاینی و ڕۆشنبیری و پەروەردەیی هەمەجۆر

٢- پاراستنی بەرهەمو نووسینی زانایان و نوسەرانی ئیسلام خوازە لە تیاچوون و گەیاندنی بە دیدی خوێنەرانی کورد زوبان.

لە خوا دەخوازین بەرهەمەکان بکاتە خێرێکی هەمیشەیی بۆ گیانی کاکە هیوا و هاوکارانی پرۆژە.

بسم الله الرحمن الرحيم

## وتەیەك لەسەر ئەم كتێبە:

خوێنەری بەڕێز ئەم پەراوەی بەردەستت (چیرۆكی ڕەوشتە جوانەكان) كە چەند نامیلكەیەكی عەرەبی یە، پرۆژەی هیوا بە هاوكاری چەند مامۆستایەكی بەڕێزكردنی بە كوردی، بەشی یەكەم لە چەند بەرگێكدا بە چاپ گەیەنراو پاشان بەشی دووەم، دواتر هەردوو بەرگەكە بە یەك بەرگ چاپ كرا، سوپاس بۆ خوا جێگەی سودو ڕەزامەندی خوێنەران بوو، بەلام هەستم كرد كەمو كوڕیەك لە كتێبەكەدا هەیە، چونكە تەنها باسی كورتە چیرۆكو بەسەرهاتە لەسەر ڕەوشتە جوانەكان و كەمتر ئایەتی قورئانو فەرمودەی تیایە، بۆ ئەو مەبەستە بە پێویستم زانی كە لەسەرەتای هەر بەشێك دا، پێناسەیەكی ڕەوشتەكەو هەندێ ئایەتی قورئانو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) و وتەی هاوەڵانو زانایان و هەندێ شیعر دەربارەی ئەو رەوشتە زیاد بكەم، وە چەنجیش فریا كەوتمو پێراگەیشتم چیرۆكو بەسەرهاتەكانم (تأصیل) كردو ئاماژەم بە ڕیوایەتو سەرچاوەكەی كرد، بۆ ئەم كارەش سودی زۆرم لە كتێبی (نضرة النعیم) وەرگرتووە، ئەمەش مانای وانیە كتێبەكە هیچ كەمو كوڕی تیا نیە چونكە هەرچیەك بێت كاری ئێمەی بەندە ناگاتە پلەی تەواوەتی هەركەسیش كار نەكات هەڵە ناكات.

بە ئومێدی سودمەندبوونو بەشداری كردن لە دەوڵەمەندكردنی كتێبخانەی كوردی، پرۆژەی هیوا سوپاسی هەموو ئەو براو خوشكە بەڕێزانە دەكات كە پشتگیریو هاوكارمان بوون لە پێشخستنی پرۆژەكەدا.

ناصح محمد شەریف موبرەیی

٢٠١٠ ڕاپەڕین

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی (بۆخوا بوون) دڵسۆزی

**نوسینی**

شعبان مصطفی قزامل

**وەرگێڕانی**

ئەبوبەکر محمد شاربادێری

# ﴿دڵسۆزی و بۆخوابوون﴾

دڵسۆزی: واتە کارێك کە پاڵفتە بێت لە ڕوپامایی و خۆدەرخستن و ریاکاری، هەروەك چۆن شیری ئاژەڵ لە ناو سکیدا بە پاڵفتە دێتە دەرەوە و بۆن و ڕەنگی نەگۆڕاوە ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ﴾ (النحل:٦٦)

خوای گەورە فەرمانی کردووە بە دڵسۆزی خواپەرستی ئەنجام بدرێت ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ﴾ (البينه ٥)

پێغەمبەران دڵسۆز بوون و کارین بۆ خودا کردووە: دەربارەی یوسف (علیه السلام) ﴿وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ ۖ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَا أَنْ رَأَىٰ بُرْهَانَ رَبِّهِ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ ۚ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾ (یوسف ٢٤)

دەربارەی موسا (علیه السلام): ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَىٰ ۚ إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَبِيًّا﴾ (مریم ٥١)

دەربارەی ئیبراهیم (علیه السلام): ﴿وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ أُولِي الْأَيْدِي وَالْأَبْصَارِ﴾ (ص٤٥)

جگە لە دڵسۆزان کەس لە فێڵی شەیتان ڕزگاری نابێت ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾ (ص ٨٣)

بەهەشت بۆ دڵسۆزانە ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ (الصافات: ٤٠)

لە كاتی نەمانی هۆكارە دنیاییەكان مرۆڤ تەنها هاوار بۆ خوا دەبات ﴿فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلۡفُلۡكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ إِذَا هُمۡ يُشۡرِكُونَ ۝٦٥ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ وَلِيَتَمَتَّعُواْۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾ (العنكبوت ٦٥-٦٦)

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (ما قال عَبدٌ لا إله إلا الله قطُّ مخلصاً، إلا فُتحت لَه أبواب السماء حتى تُفضي الى العرش ما اجتنبت الكبائر) الترمذي.

پێشوا مكحول دەفەرموێت: (ما أخلصَ عَبدٌ قط أربعينَ يوماً إلا ظهرت ينابيعُ الحِكمة من قلبه و لسانه) مدراج السالكين ٢/٩٦

جونەيد دەفەرموێت: ئیخلاص نهێنی نێوان خواو و بەندەیە، فریشتە نازانێ تا تۆماری بكات وە شەیتانیش نازانێ تا تێكی بدات، ئارەزوش نایدۆزێتەوە تا ڕێگەی لێ ون بكات و لای بدات) الفوائد.

لبيد دەڵێ: (ألا كل شيءٍ ما خلا الله باطلُ و كل نعمة لا محالةَ زائل)

# ﴿یەکەم سزادراوان لە قیامەتدا﴾

یەکەم کەس لەقیامەتدا کەدەچنە ناوئاگری دۆزەخ ئەمانەن خوێندەوارو خاوەنی ماڵو سامان، وەتێکۆشەری ڕێی خوا، خوای گەورە دەفەرموێ بەخوێندەوارو زانا چیتکرد بەو زانستو عیلمەی کەفێرم کردی؟ دەڵێ: خوایە بەشەو بەڕۆژ کارم پێدەکرد بڵاوم دەکردەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: درۆتکرد بەڵکو بۆئەوەت کرد پێت بڵێن خوێندەواری، پێت وتراوە ئەوە پاداشتت بوو. وەخاوەنی ماڵ دەهێنن، خوای گەورە دەفەرموێ: من لەدونیا ماڵو سامانم پێدای بێ نیازم کردی لەخەڵکی چیتکرد بەو ماڵو سامانە؟ دەڵێ: خوایە صیلەی ڕەحمم جێبەجێ دەکردو خێرم لێ دەکرد لەبەرتۆ.

خوای گەورە دەفەرموێ: درۆتکرد لەبەر من نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوەی پێت بڵێن فلانەکەس سەخییە، بەخشندەیە ئەوە پێت وترا لەدونیاو لێرە پاداشتت نییە، وەهەروەها لەڕۆژی دواییدا ئەو کەسە دەهێنن کەلەڕێی خوادا کوژراوە خوای گەورە لێی دەپرسێ بۆ کوژرای؟

دەڵێ خوایە لەپێناوی دینی تۆدا خۆم بەکوشتدا، تێکۆشام لەبەرتۆ تاکوژرام. خوا دەفەرموێ: درۆتکرد لەبەرمن نەبوو لەبەر ئەوە بوو پێت بڵێن ئازایت پێت وترا، ئەوە پاداشتەکەت، پاشان خوا فەرمان دەکات بیانبەن بۆناو ئاگرو فڕێ دەدرێنە ناوئاگر.

# «بەهەشت و شەهید»

عـەمری کـوڕی ثابـت پیـاوێکی نـەوەی (عبـد الاشـهل) بـوو ناسـرابوو بـە (ئەصیرەم) ئەم پیاوە هەرکەسێك داوای موسوڵمان بوونو قبوڵ کردنی ئیسلامی لێدەکرد، ئەو بەرپەرچی دەدایەوەو ئامادەنەبوو بێتە ناو ئیسلام، لەکاتی غەزای نوحـوددا لـەبڕیارێکی کتـوپڕدا شمشـێرەکەی هـەلگرتو چـووە سـەنگەری موسـولّمانانو لەگـەڵ بـێ باوەڕانـدا کەوتـە جـەنگ، زۆر مەردانـە کوشـتارێکی گـەورەی ئەنجامـدا، تاسـەرەنجام لەچـەند شـوێنێکەوە بەسـەختی برینـدار کـراو کەوتە سەرزەوی.

لەکۆتایی جەنگەکەدا پیاوانی نەوەی (عبـد الاشـهل) کەوتنـە گـەڕان بەشـوێن کوژراوەکانیاندا. بینیان وا (ئەصـیرەم) لـەپێش دەمیاندایـەو بەسـەختی برینـدار بـووە، لـەم دیمەنـە سەرسـام بـوون، چـونکە ئـەوان پـێش جەنگەکـە کەبـەجێیان هێشت موسوڵمان نەبوو بـوو وەئامـادەش نـەبوو، بۆیـە لێیـان پرسـی: ئایـا لەبـەر غیرەی نەتەوەیی ئەم کارەی کردووە یـان بـەهۆی هاتنـە نـاو ئیسـلامو موسـوڵمان بووینەوە؟

وتی: بەڵکو حەزم بەناو ئیسلام کـردو بـاوەڕم بـەخواو پێغەمبەرەکـەی کـردو تەسـلیم بـووم، پاشـان شمشـێرەکەم هـەلگرتو لەخزمـەتی پێغەمبـەری خـوادا کەوتمە جەنگ هەتا بەو شێوەم لێهات کەدەبینن، پاش کـەمێك لەبـەر دەسـتیاندا گیـانی سـپارد، کـاتێ گەڕانـەوە ئـەو باسـەیان بـۆ پێغەمبـەر گێڕایـەوە، ئـەویش فەرمووی: بەدڵنیاییەوە ئەو ئەهلی بەهەشتە.

## «هۆکاری گریان»

ڕۆژێکیان عمری کوری خطاب (ﷺ) چوو بۆ مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) معاذ کوڕی جەبەلی بینی لای گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەکوڵ ئەگری.

ئیمامی عمر پرسیاری لێکرد: ئەی معاذ بۆ دەگری چی دەتگرێنی؟ معاذ فەرمووی: فەرمایشتێ کەلە پێغەمبەرم بیستووە دەمگرێنێ کە پێغەمبەر دەیفەرموو: (الیسیر من الریاء شرك.. ومن عادى أولياء الله فقد بارز الله بالمحاربە، إن الله يحب الابرار الاتقياء الاخفياء الذين إن غابوا لم يفتقدوا، وإن خضروا لم يعرفوا، قلوبهم مصابيح الهدى).

واتە: بچوکترین و کەمترین ڕیا هاوەڵ بڕیاردانە بۆخوا، هەرکەس دوژمنایەتی ئەولیاو خۆشەویستانی خوا بکات ئەوە زۆرانبازیو شەڕی لەگەڵ خوادا ڕاگەیاندووە، خوای گەورە چاکەکارو ئەهلی تەقوای خۆشدەوێت، ئەوانەی شاراوەن کەسانێك ئەگەر دیار نەبوون کەس بۆیان ناپرسێ، ئەگەر دیاربوون ناناسرێن، دڵەکانیان وەك چرای هیدایەت وایە.

## «دڵسۆزی لە وشەدا»

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەر دانیشتبوو لەگەڵ هاوەڵەکانی فەرمووی هەرکەس بڵێ: (لا اله الا الله مخلصاً دخل الجنة) دەچێتە بەهەشت پرسیاریان کرد کامەیە دڵسۆزی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: (خۆ پاراستن لەبەزاندنی سنورەکانی خوا)

جا مرۆڤ هەروتەیەك کەدەیڵێ مەبەستی دڵی خوابێ، شیرکی تیانەبێ ئەوە عیبادەتو خواپەرستی ڕاستو قبوڵە، ئەوەیە خوا مەبەستیەتی لە ئایەتی ﴿فاعبدوا الله مخلصاً له الدين﴾.

پێغەمبەر دەفەرموێ هەرکەسێ بڵێ (لا الـه الا الله) بەڕاستی و دڵسۆزی بەدڵنیایی خوا دەرگای ئاسمانی بۆ دەکاتەوە تا دەگاتە عەرشی خوا مادەم خۆی لەگوناهی گەورە پاراستبێ. کەواتە نیەتی چاك و کارکردن بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا هەوێنی وەرگرتنی کردارەکانی مرۆڤە لای خوای گەورە.

## «ڕوخساری جوان»

جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لەیەکێ لەغەزاکان دژی بێ باوەڕان چوو بۆ غەزا، یەکێ لەهاوەڵان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من پیاوێکی ڕەش پێستم، وە بۆ نیشم ناخۆشە، دەمو چاوم زۆر ناشیرینە، هیچ سەروەتم نیە ئەگەر بجەنگێم دژی بێباوەڕان تا دەکوژرێم دوایی من لەکوێ دەبم؟

ئەو پیاوە زۆر ڕاستگۆ بوو لەقسەکانیدا، وەنیەتی خوای بەدڵسۆزی هەبوو، پێغەمبەر پێی فەرموو: لەدوای ئەوەی کوژرای وای لەبەهەشتدا.

کابرا ڕۆیشت جەنگا هەتا شەهیدکرا، پێغەمبەر (ﷺ) بەلایدا ڕۆیشت بینی وا شەهیدکراوە فەرمووی: خوا دەمو چاوی سپی کرد، وەبۆنی خۆشکردو ماڵی زۆرکرد. پاشان فەرمووی بەهاوەڵەکانی:

بینیم هاوسەرەکەی لە (حور العین) جبەیەکی لەخوری بۆ دروست دەکرد، لەنێوان هاوسەرەکەیو جبەکەیدا دەچووە بەهەشت.

## «نوێژی وەرنەگیراو»

ڕۆژێك پێغەمبەر هاتەناو هاوەڵەکانی فەرمووی: ئەی خەڵکینە ورياتان دەکەمەوە، وریای هاوبەشی پەیدا کردن بن، هاوبەشییەك کەنادیارەو نایزانن، شیرکی پەنهان ئەوەیە نیەتی مرۆڤ لەکارەکەی خەڵکی بێ وتیان: چۆن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: کابرا نوێژەکەی دەکا تاخەڵکی ببینن‌و سەیری بکەن، ئەوە شیرکی پەنهانە.

پێغەمبەر (ﷺ) ئاگادارمان دەکاتەوە وریای ئەوەبین کابرا نوێژ ئەکا زانی خەڵکی سەیری دەکەن جوان نوێژەکەی دەکاو پەلەپەل ناکات، بەڵام زانی کەسی لێنیەو کەس چاوی لێی نیە بەسادەیی‌و ئیهمالی دەیکا، چونکە بەڕاستی مرۆڤ واجبە نوێژەکەی لەبەرخوای گەورەبێ، نوێژەکەی لەبەر خوا بەجوانی بکات، نەك لەبەر ئەوەی خەڵکی چاوی لێیەتی جوان بیکات.

# «هاوبەشی نادیار»

جارێکیان ئەبی موسای ئەشعەری وتاری ئەدا لەناو خەڵکدا فەرمووی: خەڵکینە، بترسن لەهاوبەشی دانان بۆ خوا، چونکە لەمێرووله نادیارترە!! لەناو خەڵکەکەدا دوو پیاو هەڵسانەوە وتیان: ئێمە ئەم قسەی تۆ تەواو قەناعەتی پێناهێنین، سکالآیان بردە لای ئیمامی عومەر تا بەڵگەیان بۆ بهێنێ لەسەر ئەم قسەیەی کردی.

ئەبی موسا فەرمووی: رۆژێکیان پێغەمبەر وتاری دەدا بۆمان فەرمووی: خەڵکینە (اتقوا هذا الشرك فإنه أخف من دبيب النمل) یەکێ لەهاوەڵآن وتی: چۆن خۆمانی لێبپارێزین کەئەو دەنگی لەمێرووله بچوکترە فەرمووی ئەم دوعایە بکەن.

(اللهم إنا نعوذ بك من أن نشرك بك شيئاً نعلمه ونستغفرك لما لا نعلمه)

واتە: خوایە پەنادەگرین بەتۆ لەهاوبەشی دانان بۆتۆ، هاوبەشیەك ئاگاداربین لێی، وەپەنات پێدەگرین لەوەی کەبێ ئاگاین و نایزانین کەهاوبەشی تیایە.

# «خواپەرستی و دوو دینار»

جارێکیان خواپەرستێ لەخوا پەرستەکانی بەنی ئیسرائیل بینی کەخەڵکی خەریکی پەرستنی دارێکن، بەپیرۆزی دەزانن و توشی شیرك بوون، بۆیە بڕیاریدا ئەو دارە ببڕێ تاخەڵکی لەو گوناهە ڕزگار بکاو ڕووبکەنەوە خوای گەورە، تەورەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت لەڕێگادا (ئیبلیس) لەشێوەی کابرایەکی پیر چووە سەر ڕێ وتی: کابرا بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: دەڕۆم خەڵکی تووشی گوناه و شیرك بوون ئەو دارە دەبڕمەوە، ئیبلیس ویستی نەیەڵێ و ڕێی لێگرت، پەلاماریدا خواناسەکە ئیبلیسی خستەسەر زەوی ئیبلیس وتی: بگەڕێرەوە، لەبڕینی ئەو دارە وازبهێنە من لەبری ئەوە ڕۆژی دوو دینارت دەدەمێ! لەسەر ئەوە ڕێکەوتن خواناسەکە لە ڕۆژی یەکەم و دووەم دوو دیناری لەماڵەکەی دەست دەکەوێ، بەڵام لەڕۆژی سێهەم نەما بۆیە بڕیاریدا بڕوا بیبڕێتەوە دووبارە تەوری هەڵگرت ئیبلیس چووە ڕێی لەشێوەی کابرایەکی پیر، دووبارە کەوتە قسەکردن ئەو دارە نەبڕێ، بەڵام کابرا سوور بوو، پەلاماری یەکیان دا ئەم جارە خواناسەکە کەوتە سەرزەوی وتی: باشە چۆن ئەم جارە زاڵبووی بەسەرمدا، ئیبلیس وتی: تۆ یەکەمجار لەبەر خوا تووڕە بوویت و هاتی خوا لەمن پاراستیتی ڕزگارت بوو، وەتوانیت من بدەیت بەزەویدا، بەڵام ئەمجارە تووڕەبوون و هاتنەکەت لەبەر نەمانی دوو دینارەکە بوو بۆیە من زاڵبووم بەسەرتا.

# «خاوەنی دەمامك»

لەیەكێ لەغەزاكانا، سوپای موسوڵمان دەورەی قەڵایەكیان دابوو نەیان دەتوانی بچنە ئەو دیوی قەڵاكەوە، بڕیاریاندا دەوریان بگرن تا تەسلیم دەبن.

لەیەكێ لەبەیانیەكاندا موسڵمانان هەستیان كرد ڕێیەك هەیە كەبیان گەیەنێتە ئەودیووی ئەو دیوارە دیاربوو موسوڵمانێك ئەوكارەی كردبوو، فەرماندەی سوپاكە وتی: كێ بوو ئەوكارەی ئەنجامدا كەس وەڵامی نەدایەوە، سوێندی خوارد كەبێتەدەرەوە، پاش كەمێك كەسێكی دەم و چاو پێچراو هاتەدەر داوای لێكرد خۆی ئاشكرا بكات، بەڵام ئامادەنەبوو، كەئەمیرەكە سەیری كرد خاوەنی ئەو دەمامكە نایەوێ خۆی ئاشكرا بكات سوێندیدا كەبچێت بۆلای لەكاتێكی تاریك لەشەودا.

كەشەو داهات كابرا هات بۆلای فەرماندەكە دەم و چاوی داپۆشی بوو ئەمیرەكە وتی تۆ خاوەنی دەمامكەكە بووی؟ وتی: بەڵێ.

وتی: دەم و چاوت ئاشكرا بكە. بابت ناسم تۆ كێیت؟ كابرا وتی: بەسێ مەرج دەم و چاوی خۆمت نیشان دەدەم، یەكەم باكەسی غەیری تۆ نەمناسێ، دووەم هیچماڵی زیاترم نەدەیتێ كەلەحەقی سەربازەكان زیاتربێ، سێیەم دەمەوێ سەربازێكی ون بم و نادیار! سەركردەكە بەڵێنی پێدا، خۆی نیشاندا، ئەم پیاوە بەڕاستی كارو تێكۆشانی تەنها لەبەرخوا بوو، نەك بۆ ناوو شۆرەت.

# «پیاوێکی دڵسۆز»

پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك بەهاوەڵانی فەرمووو: پیاوێك ویستی خێرێك بکات، وتی من خێر دەکەم ڕۆیشت خێریکرد دوایی دەرکەوت ئەو پیاوەی خێرەکەی پێکردوەوە دز بووە وتی: خوایە سوپاس بۆتۆ، کەمن خێرەکەم دز وەری گرتووە، خێرێکی تر دەکەم، دووبارە خێریکرد، بەیانی ئاشکرا بوو ئەوەی خێرەکەی داوەتێ ئافرەتێکی زیناکاربووە! وتی: سوپاس بۆخوا لەسەر ئەوەی خێرەکەم بەر زیناکار کەوتووە، دەبێ خێرێکی تر بکەم.

سێ بارە چووەوە خێری ئەنجامدا کردیە دەستی دەوڵەمەندێ بەیانی کەئاشکرا بوو باسیانکرد کەخێر بەدەوڵەمەند کراوە!!

وتی: سوپاس بۆتۆ خوایە لەسەر ئەوەی خێرم بە دزو زیناکارو دەوڵەمەند کەوتووە ئەوان وەریان گرتووە!

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵیدا کەئەو پیاوە خوا هەواڵی داوەتێ کەخێرەکەت لای خوا وەرگیراوە لەبەر ئەوەی نیەتی خوابووە وەڕاستی کردووە لەگەڵ خوا بۆ ئەو کارەی.

هەندێك دەیانووت خێرەکەت کردووە بەدزێك بەڵکو ببێتە وازلێهێنان لەدزی، وەهەروەها زیناکەر کەخێرت پێکردووە بەڵکو ببێتە هۆی ئەوەی وازلە زیناکردن بهێنێ، خۆی بپارێزێ لەزینا، وەهەروەهائەو دەوڵەمەندەی خێرت پێکردووە بەڵکو ببێتە هۆی ئەوەی دەرس وەرگرێو ببەخشێ لەوەی خوا پێیداوەو ببێتە کەسێکی سەخیو بەخشندە.

# ﴿کۆچی ئوم قەیس﴾

کۆیلەیەك لەکۆیلەکانی مەککە دەیویست ژن بهێنێ، ئەوەی دیاریکرد بوو ئافرەتی یەکێ لەبنەماڵەکانی عەرەب بوو ناوی (ئوم قەیس) بوو، بەلاّم کەسوکاری ئافرەتەکە قبوڵیان نەبوو ئەو هاوسەرگیرییە بکرێو کچەکەیان بدەن بەو کۆیلەیە.

کاتێك دینی ئیسلام هاتو ئافرەتەکە موسوڵمان بوو، پاشان بڕیاردراو مۆڵەتی موسوڵمان درا کۆچ بکەن بۆ مەدینە (ئوم قەیس) کۆچی کرد، ئەو پیاوەی دڵێلێ بوو ئەویش کۆچی کرد کاتێك بینیان کەوا هاتووە بۆ مەدینە نیەتی ئەوەیە تائەو ئافرەتەی دەست کەوێ و مارەیبکا، هاوەڵەکان ناویان نا کۆچێك کەلەبەر ئوم قەیس کراوە، چونکە کۆچەکەی لەبەر ئەوەیە کەئەو ئافرەتەی دەست کەوێو بیخوازێت، کۆچەکەی لەبەر خواو پێغەمبەری خوا نەبووە، ئەمە ئەوە دەردەخات کەنیەتی مرۆڤو مەبەستی کاری بەستراوە بەیەکەوە ئەوسا کارەکانی قبوڵ دەکرێ لەلای خوا.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (إنما الاعمال بالنيات وإنما لكل امرىء مانوى فمن كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله ومن كانت هجرته الى دنيا يصيبها أو امرأة ينكحها فهجرته الى ماهاجر اليه).

# «پاداشتی دڵسۆزی»

پێغەمبەر (ﷺ) لەیەکێ لەغەزاکاندا خەڵکی هاندا کەوا بڕۆن بۆ جیهادو تێکۆشان، یەکێ لەموسوڵمانە هەژارەکان هاتە خزمەتی پێغەمبەر، هیچ هۆکاری نەبوو کەبیگەیەنێتە ئەو شوێنەی دەچن تاجیهادی تیابکەن، پرسیاریان لەپێغەمبەر دەکردو داوای هۆکاریان دەکرد، وەکو (وڵاخ) و پێداویستی ڕێگە تاپێی بڕۆن بۆ جیهاد، بەڵام پێغەمبەر هیچی لانەبوو ، بەنەرمێکەوە (تاخەفەت نەخۆن) فەرمووی: کەهیچی لانیە بۆ ئەوان، ئەوانیش بەدڵی پڕ لەخەفەتو چاوی پڕ گریانەوە گەڕانەوە ماڵ، حەزیان دەکرد بچن بۆ ئەو غەزایە.

بەڵام خوای گەورە ئاگای لەدڵو نیەتیانە کەڕاست دەکەن، بۆیە بەشداری کردن لەئەجرو پاداشتی ئەو غەزایەدا، بەشیان هەیە بەهۆی نیەتەکەیان.

وەپێغەمبەر هەواڵی دا بەهاوەڵەکانی کەخوا ئەو پاداشتو ئەجرەی بەوانیش داوە، فەرمووی ئەوانەی لەدوامانەوە واتە لەناو شارماون نەهاتوون، چەند شاخو ڕێو دۆڵمان بڕیووە ئەوان لەگەڵمانا بوون لەئەجردا، چونکە کەبەهۆی عوزرەوە نەهاتبوون بەشداری بکەن لەم غەزایەدا. قورئانیش باسی فرمێسکی چاوی ئەو کەسانەی کرد کە هیچیان نەبوو بیبەخشن لە ڕێی خوادا، موسڵمانانیش هیچیان نەبوو تا وەری بگرن، ئیتر بە ناچاری گەڕانەوە.

# «ڕزگاربوون بەهۆی دڵسۆزییەوە»

جارێکیان سێ نەفەر چوونە ئەشکەوتێ بۆ ئەوەی خۆیان لەسەرماو باران بپارێزن، کتوپڕ بەردێکی گەورە لەشاخەکەوە بەربۆوە، دەرگای ئەشکەوتەکەی لەوانگرت، داوایان لەخواکرد تابەهۆی کرداری باشیان کەبۆخوایان کردبێ ڕزگاریان بکا لەو بەردە.یەکیان وتی: من باوك و دایکێ پیرم هەبوو نانم نەدەخوارد هەتا ئەوانم تێر دەکرد، ئێوارەیەك درەنگ گەڕامەوە بۆ ماڵ مەڕەکانم دۆشی کەهاتمە ژوورەوە خەوتبوون، منیش وەستام بەپێوە لەلایان هەڵم نەساندن تا خەبەریان بۆوە ئینجا شیرەکەیان خواردەوە.

دووەمیان وتی: من کچێ مام هەبوو زۆرم خۆش دەویست، ڕۆژێ پێویستی بەمن هەبوو هات داوای یارمەتی لێکردم منیش وتم: ئەگەر کاری ناشەرعیم لەگەڵدا نەکەی هیچت نادەمێ! ئەوساڵە ساڵی گرانی بوو چەند جارێك رازی نەبوو بەڵام دواجار ناچار بوو، داواکەم جێبەجێ بکات، بەڵام کاتێ چوومە پێشەوە لێی بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە بیری خستمەوە وتی: لەخوا بترسە کاری وامەکە!! چونکە من حەڵاڵی تۆنیم، شەرم لەخوا بکەو ئەو سنورە مەبەزێنە، منیش ترسام لەخواو ئەوکارەم ئەنجام نەداو ماڵەکەم دایە و گەردنم ئازاد کرد.

سێیەمیان وتی: پیاوێ لەلای من بەکرێ ئیشی بۆدەکردم ڕۆیی‌و منی جێهێڵا بەرلەوەی کرێکەی بدەمێ منیش پارەکەم بۆ خستە کاسبیەوە زۆر بوو، پاش چەند ساڵێك گرانی هات و هەژاری زۆر بوو هاتەوە داوای کرێکەی لێکردم منیش هەموو ئەو ماڵ‌و پارەم دایەوە وتم ئەوە هی تۆیە.، کابرا باوەڕی نەدەکرد، بەڵام من دڵنیام کردو ئەویش هەموو ماڵاتەکەی برد.

هەریەکەیان کە ڕووداوەکەی دەگێڕایەوە دەیوت: خوای گەورە ئەگەر ئەو کارەمان لەبەرتۆ ئەنجام داوە، بەهۆی ئەو کارەوە رزگارمان بکە، هەموو جارێك بەردەکە کەمێك دەجوڵا تا دواجار بە تەواوی جوڵا و بواری هاتنەدەرەوەیان بۆ ڕەخسا.

# ﴿کیسەیەکی پڕ﴾

کاتێك ئیمانداران شارەکانیان ئازاد دەکردو فەتحیان دەکردن هەرچی ماڵو دەست کەوت بوایە کۆیان دەکردەوە کابرایەك هات کیسەیەکی پڕی گەورەی پێبوو، خستیە ناو دەست کەوتەکانەوە، موسوڵمانەکان زۆریان پێ سەیربوو ئەم کیسەیە چییە؟ چونکە دەست کەوتەکان شتی وای تیانەبوو، وتیان: ئەمە شتێکی تێدایە؟ ئەم پیاوە هەڵیگرتووە بۆخۆی! وتیان: چەندت بۆخۆت هەڵگرتووە لێی؟ کابرا وتی: وەڵا من لەبەر خوا نەبوایە نەم ئەهێنا بۆئێرە و هەموویم دەشاردەوە، کەچی ئێوە تۆمەتبارم دەکەن!؟

ئەوسا زانیان پیاوێکی دەست پاكو ئەمینە، وتیان: باشە ناوی خۆتمان پێ بڵێ تۆکێی؟ بابت ناسین، کابرا ئەو داوایەی قبوڵ نەکرد کەخۆی ئاشکرا بکات، تاکو کەس وەسفی نەکاو سوپاسو دەست خۆشی لێنەکەن، وتی: من سوپاسی خوا دەکەمو چاوەڕوانی پاداشت لەخوا دەکەم!!

کاتێك کابرا ڕۆیشت کەسێکیان نارد بەشوێنیدا تابزانن کێیە ئەم بەڕێزو دڵسۆزە، کاتێك دەرکەوت هاوەڵی بەڕێز (عەبد کوڕی قەیس) بوو.

# «گەیشتنەوە بەخوا»

پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من دەمەوێ بجەنگم لەپێناوی خوادا، بەلام حەز دەکەم کەس نەزانێ تواناو ئازایەتی من چەندە.

پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو هیچ وەلامی نەداوە، تاخوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

[قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا] الكهف ١١٠

واتە: جا ئەوەی دەیەوێت بەدیداری پەروەردگاری شاد بێت، بەخۆشنودیەوە با کاروکردەوەی چاكو دروست ئەنجام بدات بەهیچ شێوەیەك لەپەرستنیدا هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵو شەریك بۆی.

ئابەو شێوە قورئان فێرمان دەکات کەخوا هیچ کاروکردەوەیەك قبوڵ ناکات هەتا بەپاکیو بێ ڕیاو شیرك بۆ خوای گەورە ئەنجام نەدرێت لەفەرموودەی قودسیدا هاتووە، خوا دەفەرموێ: (أنا أغني الشركاء عن الشرك، فمن عمل عملاً اشرك فيه غيري، فأنا منه بريء وهو للذي اشرك)

واتە: من بێ پێویستم لەهاوەڵ دانان بۆم لەکارو کردەوەتان، هەرکەسێ کارێ بۆخوا بکات مەبەستی غەیری خوای گەورەی تیابێ بۆ غەیری خوای بکات، خوای گەورە پێویستی پێی نیەو ئەو کارەی بۆ ئەو کەسە کردووە کەکردویەتی بەهاوەڵی خواو خوا ئەوکارەی ناوێت.

# لەکۆتاییدا

دڵسۆزیو بۆخوا بوون لەکارماندا ڕەوشتێکی جوانو گەورەیە خویەکە لە خووە جوانەکانی ئیماندارانی ڕاستو دروست، دڵسۆزی ئەوەیە مرۆڤ کردەوەو کاری بۆ خوابێ، ئەوەتا خوای گەورە ڕوو لەپێغەمبەرانی دەکات کەکارەکانیان بەدڵسۆزی بۆ خوا ئەنجام بدەن، وەهەروەها ئیماندارانیش، خوای گەورە ڕوو لەپێغەمبەری ئازیزمان دەکات: ﴿قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ﴾ الزمر ١١.

واتە: ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: بەڕاستی من فەرمانم پێدرا کەهەرخوا بپەرستمو لەهەموو ژیانمدا ملکەچو فەرمانبەرداری دینو ئاینو بەرنامەی ئەوبم.

ئا بەوشێوەیە فەرمانی خوا جێبەجێ دەکاو ڕوودەکاتە خوا ﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ الانعام ١٦٢

واتە: (ئەی پێغەمبەر ئەی ئیماندار) بڵێ: بەڕاستی نوێژو حەجو دروشمەکانیو (سەرجەم چاکەو بەندایەتیم) هەروەها ژیانو مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە.

چەند جوانە مرۆڤ دڵسۆزبێو بەدڵسۆزی کارەکانی بکا بۆ خوا چاوەڕوانی پاداشت تەنها لەخوابێ.

ئەمە چەند چیرۆکێ بوو باسی دڵسۆزی دەکا، تافێری دڵسۆزی بینو پەندو سودی لێوەرگرین بۆ خۆمان.

# کۆمەڵە چیرۆکێك
# لەبارەی ئەمانەت پارێزی

**ئامادەکردنی**

**یاسر عەلی نور**

**وەرگێڕانی**

**ئەبوبەکر محەمەد رۆستەم**



# ﴿ئەمانەت پارێزی﴾

**ئەو هەموو شتانەی خوا فەرزی کردوون لەسەر بەندەکانی ئەمانەتن وەك نوێژ و رۆژوو زەکات و حەج و قەرز و وەکالەت و نهێنی پاراستن و پاراستنی ماڵ و شەرەف و....ئەمانەت رەوشتێکە لە دەروونـدا جێگیر دەبێت، مرۆڤ دەپرایزێ لە شتانێك کە ماف وئەو نییە وە هەموو ئەرکی سەرشانی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا جێ بەجێ دەکات.**

**بۆیە پێغەمبەران هەموویان ئەمین بوون، بەبێ زیاد و کەم ئەرکەکانیان جێبەجێ کردووە. ئەوەتا نوح و هود و صالح و لوط و شوعەیب بە گەلەکەیان فەرمووە** ﴿اني لكم رسول أمين﴾ **الشعراء.**

**پێغەمبەر (محمد)ﷺ بە (صديق امين) ناسراوە..جوبرەئیل ئەمین بووە لە هێنانی وەحی بۆ پێغەمبەران** ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ﴾ **(الشعراء ١٩٣ )**

**پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:** (أدّ أمانة الى مَن أئتمنك، ولا تَخن من خانك) **ابو داود و الترمزي.**

**پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت** (إذا حدث الرجل الحديث ثم التفتَ فهي أمانة)الترمزي.

**باوەردار کەسێکە خەڵك ئەمین بن لە زیان گەیاندنی لە خوێن و ماڵیاندا**
(المؤمن من أمِنه الناس على دِمائهم و أمالهم) **الترمزي.**

**نهێنی سەرجێگەی ژن ومێرد ئەمانەتە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت** (إنّ من أعظم الامانة (أي أعظم خيانة الأمانة) عند الله يومَ القيامة: الرجل يُقضي الى إمرأته و تُفضي اليه ثُمّ يَنشُرُ سرها) **مسلم**

**کاربەدەستی و لێپرسراوی ئەمانەتە: کاتێك ئەبو زەر داوای لە پێغەمبەرﷺ کرد بیکات بە کاربەدەست، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:** (يا أبا ذر إنك ضَعيف، و إنّها أمانةٌ و إنها يَومَ القيامة خزيٌ و ندامة، إلا مَن أخذها بِحَقّهاو أدى الذي عليه فيها) **مسلم.**

# «بەهێزو سەر ڕاستو دەست پاك»

لەڕۆژێکی زۆر گەرمدا عوسمان کوڕی عەففان (ﷺ) لەدەرەوەی شار لەژێر سێبەرێکدا لەگەڵ خزمەتکارەکەی دانیشتبوو.

لەدوورەوە پیاوێکی بینی، دوو وشتری پێش خۆی دابوو فەرمووی: چی ئەم پیاوەی بەم گەرمایە هێناوەتە دەرەوە بۆ چاوەڕێ ناکا تادونیا فێنك دەبێت؟ کاتێك نزیك بوویەوە زانی ئەوە ئەمیری موسوڵمانانە (عومەری کوڕی خەتاب) ڕۆیشت بۆ پێشوازی، بەڵام زۆر نارەحەت بوو بەگەرماکە گەڕایەوە بۆ ژێر سێبەرەکە، تاعومەر گەیشتە بەردەمی، فەرمووی: چی هێناویەتیە دەرەوە بەم کاتە؟ فەرمووی: دوو وشتری صەدەقە جێمابوو ترسام بفەوتێ، لەقیامەتا خوای گەورە پرسیارم دەربارەیان لێدەکا گەڕام بەشوێنیا تا دۆزیمەوە، ویستم بیانگەڕێنمەوە ناو مێگەلەکەیان (ئەوشێنەی وشتری خێریان لێ دەلەوەڕان) عوسمان فەرمووی: وەرە ئەی خەلیفە تۆ مەیبە کەسێکی تر لەبری تۆ دەیبا، بەڵام (ئیمامی عومەر) قبوڵی نەکرد، وشترەکانی پێش خۆی داو بردنی تا گەیاندنیە ناو مێگەلەکە.

عوسمان فەرمووی: کێ پێی خۆشە سەیری (بەهێزو سەر ڕاستو دەستپاك بکات) باسەیری ئەو پیاوە بکات، پەنجەی بۆ ئیمامی عومەر ڕاکێشا (ﷺ).

# «پارچەدارو سواری پشتی»

یەکێك لەبازرگانەکان ویستی سەفەربکات بۆ بازرگانی، بەلاّم ماڵێکی کەمی پێبوو، ڕۆیشت بۆلای پیاوێكو داوای هەزار دیناری لێکرد،کابرا ڕێکەوت بیداتێ، بەلاّم مەرجی ئەوەی دانا کەوا شاهیدێكو کەفیلێك ئامادەبکات، کابرا وتی: کەس ناناسم خوا شاهیدو کەفیلم بێت! بازرگانەکە وتی: ڕاست دەکەی ماڵەکەی دایەو ڕێکەوتن لەسەر کاتی دانەوەی قەرزەکە، بازرگانەکە گەشتی کرد بۆ ئەو شارەی ویستی، کڕینو فرۆشتنی کرد، زۆر قازانجی کرد، کاتێك وادەی دانەوەی قەرزەکەی نزیك بۆوە ڕۆیشت بۆکەناری دەریا، گەڕا تاکەشتیەکی دەست کەوێ پێی بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی، بەلاّم دەستی نەکەوت، ئەو ڕۆژەش وادەی تەسلیم کردنەوەی قەرزەکەی بوو، چەند جاری تر ڕۆیشت بۆ کەناری ئاوەکە، بەلاّم هیچ بەلەمێك نەبوو تا کابرا پێی بڕواتە ئەوبەر!!

سەیری ئەم لاو ئەولای کرد پارچە دارێکی بینی، گرتیەوەو ئامادەی کردو پاشان (هەزار دینارەکەی کردە ناوی، وەلەگەڵیدا نامەیەکی بۆ خاوەن پارەکە نووسی، پارەکەو نامەکەی کردە ناودارەکەوەو فڕێی دایە ناو ئاوەکەوە، داوای لەخواکرد کەبیگەیەنێتە خاوەن قەرزەکە کەقبوڵی کرد خوا شاهیدو کەفیلی ئەوبێت.

شەپۆلی دەریا پارچەدارەکەی هەلگرتو بردی تا لەچاوی بازرگانەکە ونبوو، لەدڵی خۆیدا وتی: من خوام کرد بەشاهیدو کەفیل وائێستا ناتوانم لەوادەی خۆیدا پارەکە بدەمەوە بەخاوەنەکەی، تەنها ئەوەندەم دەسەلاّتە، دواتریش دەچمو پارەکەی بۆ دەبەمەوە.

ئەو ڕۆژە، خاوەن پارەکە ڕۆیشت بۆ کەناری دەریا، چاوەڕوانی بازرگانەکەی دەکرد، بەلاّم دیار نەبوو، کاتێك ویستی بگەڕێتەوە دارێکی لەناوەکەدا بینی، هەڵی گرتەوە تا لەماڵەوە بۆ سوتان بەکاری بهێنن، کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە هەستیکرد واپارچە دارەکە، هەڵکۆڵراوەو شتێکی تیایە، کە کردیەوە لەناویدا پارەکەیو

نامەیەکی تیابوو کەکابرا نوسی بووی، (خوایە من تۆم کرد بەشاهیدو کەفیل، ئێستاش تۆ بەشاهیدبە کە ویستم لەوادەی خۆی پارەکە بگێڕمەوە بۆ خاوەنەکە، بەلاّم بەلەمو کەشتیم دەستنەکەوت وا دەیسپێرم بەتۆ بۆ ئەوەی بەدرۆ نەکەومەوەو شایەتی تۆش نەشکێنم) سوپاسی خوای گەورەی کرد کەئەو موعجیزەی نیشانداوە.

لەپاش ماوەیەك بازرگانەکە گەڕایەوە، ڕۆیشت بۆلای پیاوەکە داوای لێبوردنی لێکرد، هەزار دیناری خستە بەردەمی، کابرا بەدەم پێکەنینەوە بەکابرای وت: خوا ماڵەکەی پاراست کە خستبووتە ناو دارەکەوە، خوا پاداشتت بداتەوە ئەی سەر ڕاستو دەست پاك، کابرا زۆر دڵخۆش بوو، سوپاسی خوای کرد.

# «گەنمی شێدار»

ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) چووە بازاڕ ویستی هەواڵی بازاڕ بزانێو گوزەرانی خەڵك چیە لەکاسبیەکەیاندا.

بەلای کابرایەکدا ڕۆیشت گەنمی دەفرۆشت، سلاّوی لێکرد بەوردی سەیری گەنمەکەی کردو پاشان دەستی کرد بەناویدا دەستی تەڕبوو بەهۆی ئاوەوە پێغەمبەر توڕەبوو، پاشان سەیری کابرای دووکان داریکرد فەرمووی: تەڕی گەنمەکەوە هەیە، کابرا ئەم گەنمە بۆ تەڕە؟!

کابرا داوای لێبوردنی کردو بەهانەی بەوە هێناوە کەباران تەڕی کردووە، بەلاّم پێغەمبەر ئەم بەهانەی قبوڵنەکرد لێی، وەئامۆژگاری کرد تاڕاستگۆو سەر ڕاست بێ لەمامەڵەدا وەنوقسانی خواردنەکانی ئاشکرا بکات بۆ کڕیارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بۆ ئەو تەڕییەت نەکردۆتە بەشی سەرەوەی تاخەڵکی بزانن کەتەڕە، وەهەروەها پێغەمبەر فەرمووی: (من غش فليس منى) واتە هەرکەس غەشو فێڵ بکات لەئومەتی من نیە.

# «ئاڵتونی شاراوە»

پیاوێك خانوویەکی لەیەکێ کڕی، ڕۆژێکیان پیاوەکە چاڵێکی لەناو ماڵەکەی هەڵکەند کوپێکی پڕ لەئاڵتونی دۆزییەوە، سەری سوڕما وەبیری کردەوە، بەخۆی وت: من چی لەم ئاڵتوونە زۆرە بکەم؟!

لەوکاتەدا بیری کابرای کەوتەوە کەخانووەکەی لێکڕیبوو خێرا چوو بۆلای کابرای کە خانوەکەی لێکڕیبوو، لەو کاتەدا کوپەکەی بەدەستەوە بوو، وتی : تۆ خاوەنی ئەم کوپەی، چونکە لەو ماڵە دەستم کەوت کەلەتۆم کڕی بوو، من زەویم لەتۆ کڕیووە، نەك ئاڵتون!

کابرا وتی: من خانووەکەم بەوەی وا لەناویدا هەیە پێم فرۆشتووی ئاڵتوونەکە مافی خۆتەو پەیوەندی بەمنەوە نییە!!

هەردووکیان بەردەوام بوون گۆفتوگۆ، سەرەنجام بڕیاریان دا بچن بۆ لای زانایەك داوایان لێکرد کە دادوەری لەنێوانیاندا بکات، مامۆستا زۆر سوپاسی هەڵوێستی جوانی هەردوکیانی کرد، پاشان کابرا وتی: ئایا هەرکام لەئێوە منداڵی هەیە؟

یەکێکیان وتی: من کوڕێکم هەیە ئەوی تریان وتی: من کچێکم هەیە، کابرای زاناو ژیر بۆچوونی خۆی پێ وتن، کە کچەکە مارەبکەن لەو کوڕەو ئەو ئاڵتوونە ببەخشن بەهەردووکیان.

هەردوو کابرا لەسەر ئەو بڕیارە ڕێککەوتن، هەریەکەیان ئەوی تری سوپاسکرد و خێزانێکی تازەیان لە نێو خۆیاندا دروست کرد.

# «سپاردەیەکی کەم وێنە»

یەکێ لەبازرگانەکان کۆمەڵێ کرێکاری زۆری بەکرێ گرت تائیشی بۆ بکەن، کاتێك تەواو بوون لەکارەکەیان بازرگانەکە هەرکەسەو پاداشتی کاری خۆی دایە، تەنها یەکێك لەوان وەری نەگرت، چونکە بەکەمی دەزانی، بازرگانەکە بۆی هەڵگرت و کرێکەی پاراست، بازرگانی بەپارەکە کرد تا بووە ماڵێکی زۆر.

لەپاش ماوەیەك کابرا هات و داوای کرێکەی لە بازرگانەکە کرد، بازرگانەکە پەنجەی بۆ مێگەلێکی گەورە لە وشتر و مانگاو مەڕو بزن درێژکرد، وتی: ئەوە هەمووی هی تۆیە! کابرا وتی: لەخوا بترسەو گاڵتەم پێمەکە، من ڕۆژێ ئیشم بۆتۆ کردووەو ئێستا داوای کرێ دەکەم، کابرا وتی: دڵنیابە گاڵتەت پێناکەم، ئەوەی وتم بەڕاستمەو هەموو ئەو مێگەلە بەپارەکەی تۆ دروست بووە، بڕۆ بیبەو گەردنت ئازاد بێت، کابراش بەوپەڕی شادی هەمووی بردو ڕۆیشت.

لەیەکێ لەڕۆژەکاندا، ئەم دەوڵەمەندە لەگەڵ دووهاوەڵیدا گەشتیان کرد، لەبەر باران بارین چونە ئەشکەوتێکەوە هەتا ئیسراحەتی تیابکەن، بەردێکی گەورە ترازاو کەوتە بەردەمی ئەشکەوتەکە ڕێی هاتنە دەرەوەیان نەبوو، کەوتنە بێتاقەتیەکی زۆرەوە، یەکێ لە هاوەڵەکان وتی: با داوا لەخوا بکەین بەپاکترین کارو کردەوەمان، تاخوا ڕزگارمان بکات هەریەك لەدوو هاوەڵەکە داوایان لەخوا کرد تارزگاریان بکا لەبەر چاکترین کارو کردەوەیان، کەمێ بەردەکە جولا، بەلام ڕێیان نەبوو بێنەدەرەوە، کاتێك سەرەی بازرگانەکە هات کەداوا لەخوا بکات ڕزگاریان بکات، داوای لەخوا کرد، خوایە من ئەو کارەم لەگەڵ کرێکارەکەدا لەبەر ڕەزامەندی تۆ کرد، خوایە بۆخاتری ئەوکارە ڕزگارمان بکە. بەردەکە جولاو هاتنە دەرەوە لەئەشکەوتەکە.

# «فرۆشەری شیر»

شەوێك پێشەوای موسوڵمانان عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) لەگەڵ خزمەتکارەکەی (ئەسلەم) دەڕۆیشتن بەناو شاری مەدینەدا تادڵنیابێ لە گوزەرانی خەڵکی، لەپاش ماوەیەك ماندوو بوو بەهۆی زۆر گەڕانەوە لەپاڵ یەکێك لەدیواری ماڵەکاندا دانیشت تاپشوو بدات، گوێی لەدەنگی پیرەژنێ بوو بەکچەکەی دەوت کەوا شیرەکەیان ئاوی تێبکات، کچەکە بەدایکی دەوت: دایە پێشەوای موسوڵمانان عومەری کوڕی خەطاب قەدەغەی کردووە کە ئاوبکرێتە شیرەوە بەخەڵکی ڕاگەیاندووە کەئەم کارە نەکەن، چونکە خیانەتە لە موسوڵمانانو خواش حەرامی کردووە.

دایکەکە سور بوو لەسەر داواکەی، وتی بەکچەکەی: ئێستا عومەر کەی لێرەیە، خۆ ئاگای لێمان نیە؟! کچە خواناسەکەش وتی ئێمە بەگوێی خەلیفە دەکەین لەبەر چاوی خەڵکیو بەڵام لەنهێنی دا بێفەرمانی دەکەین، جائەگەر خەلیفە ئاگای لێمان نییە، خۆ خوای گەورە ئاگای لێمانەو دەبێ لەو بترسین!! خەلیفە کەگوێی لەو کچەبوو، سەرسام بوو لە ئیمانو دەست پاکی. بۆ سبەینێ پرسیاری کرد تابزانێ ئەو ئافرەتە کێیە زانی کە ئەوە (ئومو عەمارەیە) کچی سوفیانی کوڕی عەبدولاّی سەقەفیە، وەزانی کە ئەو کچە شووی نەکردووە، خواستی بۆ کوڕی خۆی (عاصم) خوا بەرەکەتی ڕشت بەسەریانا لەنەوەو وەچەی ئەو ئافرەتە خەلیفەی دادپەروەر عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پەیدابوو.

# «پۆشاك و كاروانی»

ڕۆژێکیان یەکێ لەبازرگانە سەرڕاستەکان چووە گەشت، یەکێ لەکرێکارەکانی دانا تالەبری ئەو شت بفرۆشێ، کابرایەکی جوولەکە هات پۆشاکێکی لێکڕی بەڵام نوقسانی هەبوو.

کاتێك بازرگان هاتەوە ئەو پارچە پۆشاکەی لێنەماوە لەدوکانەکەدا، پرسیاری کرد لەکرێکارەکەی، وتی: فرۆشتم بەپیاوێکی جولەکە بەسێ هەزار درهەم، بەنوقسانیەکەشی نەزانی.

کابرای بازرگان تووڕەبوو، وتی: کوا کابرا چی لێهات؟ وتی: ڕۆیشت بازرگانی موسوڵمان پارەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت تا بەوکاروانیە بگاتەوە کەکابرای جولەکە لەگەڵیانا گەشتەکەی دەکا، لەدوای سێ ڕۆژ پێیان گەیشت، پرسیاری کابرای جولەکەی کرد، کاتێ بینی وتی: کابرا تۆ لەدوکانەکەی من پۆشاکێکت کڕیووە. نوقسانی پێوەیە، فەرموو پارەکەت وەربگرەوەو پۆشاکەکەم بدەرەوە، زۆر بەلایەوە سەیربوو کابرای جولەکە پرسی: بۆ واهاتی بەشوێنم دا؟ بازرگان وتی: چونکە دینەکەم فەرمانم پێدەکات دەست پاکبم وەرێی فێڵ و خیانەتم لێدەگرێ، پێغەمبەر دەفەرموێ: (من غش فلیس منی) هەرکەس فێڵ و غەش بکات لەئومەتی من نیە. جولەکەکە سەری سوڕماو وتی: ئەو پارەی منیش پێمدابوو تەزویر بوو!! ئینجا کابرا پارەکەی بۆ کرد بەپارەی ڕاستی، پاشان ئیمانی بەخوا هێناو وتی: (اشهد أن لا اله إلا الله وأشهد ان محمداً رسول الله)

# «پاکی ماڵ»

پێشەوا ئەبی حەنیفەی نوعمان (ﷺ) خەریکی کاری بازرگانی بوو ڕۆژێك پێشەوا ئەبی حنیفە شەریکەکەی نارد چەند شتومەکێك بفرۆشێ لەبازاڕ، بەڵام لەناو ئەو شتانەدا پۆشاکێکی تیابوو نوقسان بوو، وەداوای لەشەریکەکەی کرد بەهەرکەسی فرۆشت نوقسانیەکەی پێ بڵێت، گەر ڕازی بوو بەنوقسانیەکەو ویستی ئەوسا بیدەرێ.

گەر نەی ویست بیهێنەرەوە، کابرا ڕۆیشت بۆ بازاڕ هەموو شتومەکەکانی فرۆشت، بەڵام بیری چوو ئەو نوقسانیە بۆ کڕیارەکە ئاشکرا بکات، کاتێك بیری کەوتەوە بەدوای کڕیارەکەدا گەڕا، بەڵام نەیدۆزییەوەو دەستی نەکەوت.

پاشان گەڕایەوە بۆلای پێشەوا ئەبی حنیفە، هەواڵو ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە، بەڵام پێشەوا ئەبی حەنیفە بڕیاریدا پارەی هەموو فرۆشراوەکان بکات بەخێر، تاماڵێكو پارەیەك نەیەتە ماڵیەوە کەگومانی تیابێت!

بەم شێوە پێشەوا ئەبی حنیفە نموونەی بازرگانی سەرڕاستمان نیشان دەدات، کەبەدەست پاکیو سەرراستی لەبازرگانیەکەیدا کار دەکات.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (بازرگانی سەرڕاست و ئەمین لە قیامەتدا لەگەڵ پێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیدانە)

## ﴿نهێنی پێغەمبەر (ﷺ)﴾

ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) منداڵێکی بچکۆلە بوو یاریدەکرد لەگەڵ منداڵانی شار، ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت بەلایانداو سڵاوی لێکردن وەئەنەسی نارد بۆ کارێکی تایبەتی ئەنەس خزمەتی پێغەمبەری دەکرد کاتێك ئەنەس پێویستیەکەی پێغەمبەری تەواو کرد گەڕایەوە بۆ ماڵ بەڵام دواکەوتبوو، دایکی پرسی هۆی دواکەوتنەکەی چییە؟ وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردمی بۆ پێویستی خۆی، دایکی وتی: پێویستیەکەی چی بوو؟ ئەنەس وتی: ئەوە نهێنی یە!!

دایکی بەردەوام نەبوو لەسەر پرسیار تا نهێنیەکە بزانێ چیە زۆر دڵی بەکوڕەکەی خۆش بوو، دڵنیا بوو کە کوڕەکەی ژیرو هۆشیارو ئەمانەت پارێزە.

ئینجا هانیدا لەسەر پاراستنی نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) پێی وت: کەباسی نهێنی پێغەمبەر بۆکەس نەکات.

بەو شێوەیە ئەنەس پارێزەری نهێنی پێغەمبەرو خەڵکی بوو بەگشتی.

## ﴿پۆشاکی بەنرخ﴾

جارێك ئافرەتێك هات بۆلای پێشەوا ئەبی حنیفە (ﷺ) کراسێکی حەریری پێ بوو تاپێی بفرۆشێ، ئەبی حەنیفە فەرمووی: ئەم کراسە نرخەکەی چەندە، وتی: سەد درهەمە فەرمووی: نەخێر، ئەوە زیاتر لەسەد درهەم دەهێنێ!!

ئافرەتەکە زۆر بەلایەوە سەیر بوو ئەم کڕیارە نرخ لەسەر خۆی بەرز دەکاتەوە، نرخی کراسەکە سەد درهەمە سەد درهەمی بۆ زیاد کرد، ئەنجا ئافرەتەکە وتی: بیگرە بەچوار سەد درهەم بۆتۆ! فەرمووی لە دە زیاتر دەکا! ئافرەتەکە وتی: گاڵتەم پێدەکەی؟ فەرمووی: بمدەرێ با پیاوێ نرخەکەیمان بۆ دیاریبکا، پیاوەکە وتی: پێنج سەد درهەم دەژی، ئەبی حەنیفە بەو نرخە کڕی، ئافرەتەکە ئەو نرخەی وەرگرتو زۆر پێی خۆش بوو، پاشان ڕۆیشت زۆر سوپاسی ئەبی حەنیفەی کرد لەدەست پاکیو ڕاست گۆیی.

# «کراسێ لە ئاگر»

دوای جـەنگی خەیبـەر، موسـوڵمانان ڕوویـانکردە شـوێنێ پێیـان دەوت (وادی القری) گەیشتنە ئەوێو پاشان کەلو پەلەکەیان لەسەر پشـتی وشـترەکان داگـرتو شوێنەکەیان ئامادەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) خزمەتکارێکی بوو ناوی (میدعم) بـوو ڕۆیشت تاشتومەکی پێغەمبـەر دابگـرێ لەوکاتـەدا یـەکێك لـەبێ بـاوەڕان تیرێکـی لێداو کوشتی، خەڵکی وتیان: خۆشیو شادی بەهەشتی دەست کەوت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخێر سوێند بەوکەسەی گیـانی منـی بەدەستە ئـەم پیـاوە ڕۆژی خەیبــەر کالآیــەکی هــەلگرت کەپارچــە قوماشـێکە خــەڵکی لەخۆیانی دەپێچن، لەناو دەست کەوتی جەنگ هەڵیگرت، لەڕێگەی بەشکردنەوە دەستی نەکەوتبوو، بەڵکو ئاگری بۆخۆی خۆشکرد.

پێغەمبــەر هــەواڵی دا کەلەمــەودوا بــەئاگر ســزادەدرێت، چــونکە پارچــە قوماشێکی لەنێو دەستکەوتی جەنگ هەلگرتووە پێش ئەوەی دەستکەوت دابـەش بکرێت!

کاتێك موسوڵمانان گوێیان لەمـەبووە، لـەخۆیان ترسـان لەترسـی ئـاگر، خێـرا هەرکەسێکیان ڕۆیشت سەیری کەلوپەلی کرد بزانێ شتێکی تیانیە دەست کەوتی جـەنگ بێـت، پیاوێـك هـات قـەیتانێ یـادوو قـەیتانی نـەعلی پـێ بـوو پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: قەیتانی ئاگرە.

# پیلان

قورەیش لەتاریکی شەودا، لەهەموو هۆزێك پیاوێکی بەهێزیان دیاریکردو شمشێرێکی برندەیان پێدان، لەیەك شوێنا کۆبوونەوە، بەڕێکەوتن تاگەیشتنە بەردەم ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەردەرگا وەستان بڕیاری کوشتنیان دەرکرد، کەبەشمشێرەکان بەیەك جار لێی بدەن وەك یەك کەس لێی دابێ، تاخوێنەکەی بڵاو بێتەوەو بکوژی دیارنەبێت.

خوای گەورە نیگای بۆ کردو هەواڵی پیلانەکەی پێدا، وەفەرمانی پێدا کەمەککە بەجێ بهێڵێ‌و ڕووبکاتە (مەدینە) کەناوی (یثرب) بوو ئەوکاتە.

بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ماڵ‌و شتومەکی زۆری خەڵکی مەککەی لابوو بەئەمانەت، کاتێك بڕیار هاتەسەر ڕۆشتن داوای لە ئامۆزاکەی عەلی کوڕی ئەبی تاڵب (رضي الله عنه) کرد لەجێگەی پێغەمبەر بخەوێ، پاشان لەدوای ئەم ئەمانەتەکانی خەڵکی مەککە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، پێغەمبەر (ﷺ) نموونەی جوانمان بۆ نیشان دەدا کەچاك بیت لەگەڵ سپاردەی خەڵکی، هەتا لەدوای خۆی موسوڵمانان چاوی لێبکەن، ئەزیەت‌و ئازاری خەڵکی مەککە نەبووە هۆی ئەوەی ماڵەکەیان نەداتەوەو تۆڵەیان لێ بکاتەوە، بەڵکو زانی ئەمە لای ئەو سپاردەی خەڵکە لەگەردنی پێویستە بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەوانەی ئازاریان دەدا، لەبەر ئەوە سەیرنیە ناوی بە محمدی ڕاستگۆو دەست پاك دەرکردبوو.

# «دیاریی»

جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) پیاوێکی نارد بۆ لای هۆزی سولەیم تا خێرو زەکاتەکانیان کۆبکاتەوە.

لەپاش ماوەیەك ئەم پیاوە گەڕایەوە خزمەتی پێغەمبەرو لەناو هاوەڵاندا دانیشت، پێغەمبەر ڕویکردە هاوەڵەکەو ئەویش هەندێ ماڵو یارمەتی کەماڵی زەکاتو صەدەقە بوو دانا، هەندێ ماڵی تری لا مابوو، پێغەمبەر فەرمووی: ئەوانە چیەلات، وتی: ئەوانە دیارییە بەخشیویانە بەخۆم!!

پێغەمبەر (ﷺ) سەیری کرد ویستی فێری بکات ئەوە ئەمانەتەلای، فەرمووی: ئەوانەی دیارییان بەخشیووە بەتۆ لەبەر ئەوە بووە زانیویانە تۆ نێردراوی پێغەمبەری ئەگەر وانە بوایە هیچیان نەئەدایتێ، کەواتە هەمووی هی خەزێنەی موسوڵمانانە.

بەم شێوەیە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێنمایی کرد کەموسوڵمان دەست پاكو سەرڕاست بێت لەبەرامبەر ماڵی موسوڵمانان هیچ مەبەستی تری نەبێت، هەمووی بداتەوە دەست خاوەنەکەی نابێ موسوڵمان خیانەت لەیەکتری بکەن، چونکە خوا تۆڵەی لێدەسەنێتەوە لەڕۆژی قیامەتدا.



# «ئاڵتوونی زۆر»

لەزەمانی پێشەوا عومەری کوڕی خطاب (رضي الله عنه) سوپای بەڕێکرد بۆ ئازادکردنی (المدائن) کەپایتەختی فارسەکان بوو، خوای گەورە سەری خستن بەسەر سوپای فارسدا.

لەپاش کۆتایی جەنگەکە موسوڵمانان دەستکەوتە گەورەکانیان کۆکردەوە، زۆربەی پێك هاتبوو لە پۆشاکەکانی کیسراو ئاڵتوونەکانی، کاتێك پێشەوا عومەری کوڕی خطاب (رضي الله عنه) ئەم هەڵوێستەی بینی زۆر دڵی خۆش بوو بەدەست پاکی بڕوادارانی سوپاکەی زانی کەدنیا توشی حەرام خۆری و لەسنور دەرچوونی نەکردوون بەڕاستی شیاوی سەرکەوتنی خوایین.

لەناو هاوەڵاندا پێشەوا علی کوڕی ئەبی طالب (رضي الله عنه) فەرمووی: خۆت خۆپارێزیو ژێر دەستەکانیشت بەهەمان شێوە وادەبن خۆیان دەپارێزن، گەر خۆت ڕۆچویتایە لەنازو نیعمەتا ئەوانیش ڕۆدەچوون (گەر تۆ زیاد لەخۆت هەڵگرتایە ئەوانیش وەهایان دەکرد).

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت: هەڵسوکەوتی سەرکردە و کاربەدەست ڕەنگدانەوەی لە ژیانی شوێنکەوتەکانیدا دەبێت.



# لەكۆتاییدا

ئەمانەت خوو ڕەوشتێكی گەورەو گران‌و جوانە، پێویستە هەموو بڕوادارێك خۆی پێ برازێنێتەوە، بەجوانی جێبەجێیكا بەگوێی فەرموودەی خوای گەورە بكات كە دەفەرموێت.

﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ النساء ٥٨.

واتە: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات كەهەموو ئەمانەتەكان (سپاردەكان) بگەڕێننەوە دەست خاوەنەكانیان‌و هەركاتێكیش دادوەریتان كرد لەنێوان خەڵكیدا، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بكەن، چونكە بەڕاستی خوا بەجوانی‌و چاكی‌و تەواوی ئامۆژگاری‌و فەرمانتان پێدەدات، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام بیسەرو بینایە.

موسوڵمانی ڕاست‌و پارێزەری سپاردە، ئەوەیە خەڵكی لێی دڵنیابن لەهەموو شتێكدا، ئەمین بن لێی لەكڕین‌و فرۆشتندا، لەكێشانەو پێوانەدا، كاتێك خەڵكی دەڕۆن بۆلای تا باسی گرفتەكانیان بكەن، ئەو نهێنی یە كانیان ئاشكرا نەكات.

گەورەترین‌و گرانترین سپاردەو ئەمانەت (دینی ئیسلامە) كە مرۆڤەكان بڕیاری هەڵگرتنیان داوە، كەنوێژبكەن‌و حەقی ماڵیان بدەن (زەكات) وەڕۆژوی ڕەمەزان بگرن، حەجی ماڵی خوا بكەن، ئەمانە هەمووی (ئەمانەتە) سپاردەیە و ئەندامەكانی لاشە هەمووی خوا بەئەمانەت پێی داوین، وە ئەمانەت ڕەوشتێكی جوان‌و نیشانەی خۆپارێزی مرۆڤە، وەدڵسۆزی ئاگالێبوونی خوا كەزاناو دانایە بەسەرمانەوە، چەند جوانە موسوڵمان ئاگای لەسپاردەكانی خوای گەورە بێت، وەلەگەڵ خەڵكی‌و لەگەڵ خودی خۆی ڕاست‌و ئەمین بێت.

ئەم چیرۆکانە مەبەست دارن، کەهەڵمان بژاردووە لەمێژوو کەلتوری ئیسلام، گەورەیی سپاردەو ئەمانەت ڕۆشن بێت چونکە هەر کات ئەمانەت نەپارێزرا و خیانەتی لێکرا، ئەوە نیشانەی بەرپابونی قیامەت و دوارۆژە، یان یان نیشانەی کۆتایی هاتنی ئارامی و دادپەروەری و ئاسایش و خۆشییە لە وڵاتدا، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کات خیانەت لە ئەمانەت کرا چاوەڕێی قیامەت بکە، وتیان: چۆن ئەمانەت نامێنێ؟ فەرموی: کار دەدرێتە دەستی کەسانی نەشارەزا و ناشایستە)



# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی لە خۆبوردەیی

**ئامادەکردنی**

عا طف عبـد الـرشيـد

**وەرگێڕانی**

ئەبوبەکر محمد شارباژێری

# ﴿لە خۆبوردەیی: الایثار﴾

**إیثار: پێشخستن.**

**واتە: پێشخستنی بەرژەوەندی خەڵك و موسڵمانانی تر بەسەر بەرژەوەندی خۆتدا بە مەبەستی رەزامەندی خوای گەورە.**

**خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿فأما من طغى و آثر الحياة الدنيا فإنّ الجحيم هي المأوى﴾ **(النازعات ٣٧ )**

**خوای گەورە ستایشی هاوەڵانی (أنصار) دەکات کە خاوەنی رەوشتی لە خۆبوردویی بوون لە ئایەتی ٩ی سورەتی الحشر.**

﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ **(الحشر ٩ ).**

**غەزالی دەڵێت: (الإیثار أعلى درجات السخاء) أحياء علوم الدين**

**إبن عمر فەرمووی: پیاوێك دیاریەکی برد بۆ هاوەڵێکی پێغەمبەرﷺ وتی: فلان کەسی برام منالی زۆرترە و پێویستی زیاترە بۆ ئەوە، بەم شێوەیە حەوت ماڵ دیارییەکەیان نارد بۆ ماڵێکی تر، تا سەرەنجام گەڕایەوە بۆ ماڵی یەکەمجار، بۆیە ئایەتی** ﴿ويؤثرون على أنفسهم﴾ **دابەزی (الدر المنثور ١٠٧/٨).**

# ﴿هەموویان لەچاکانن﴾

مالکی کوڕی دینار دەفەرموێت: پێشەوا عومەری کوڕی خطاب (رضي الله عنه) خزمەتکارەکەی بانگ کردو کۆمەڵێ پارەی دایە کەچوار سەد دیناربوو، فەرمووی: ئەمە بەرە بۆ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح (رضي الله عنه)و ماوەیەك لەوێ بمێنەرەوە تابزانی چی لەوپارەیە دەکات! خزمەتکارەکە پارەکەی برد بۆ ئەبو عبیدە (رضي الله عنه) وتی: ئەمە پێشەوا عومەر بۆتۆی ناردووە تابۆ هەندێ پێویستی بەکاری بهێنی.

فەرمووی: خوا ڕەحم بەپێشەوا عومەر بکات.

پاشان خزمەتکارەکەی بانگکردو فەرمووی: ئەم پێنج دینارەم بۆ بەرە بۆ فلاَن کەس، ئەم حەوت دینارەم بۆ بەرە بۆ فلاَن کەس، ئەم پێنج دینارەم بۆ بەرە بۆ فلاَن کەس تا هەموو پارەکەی بەم شێوەیە بەخشی.

خزمەتکارەکەی پێشەوا عومەر گەڕایەوە بۆ خزمەتی‌و هەموو ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، پاشان بەئەندازەی ئەوەی پێشووی دایەوە بە خزمەتکارەکەی وتی: ئەمەیان ببە بۆ مەعازی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه).

خزمەتکارەکە بەهەمان شێوە پارەکانی برد بۆ معاذ (رضي الله عنه) وتی: کە پێشەوا عومەر ئەم پارانەی بۆ ناردووی تا بۆ پێویستی خۆت سەرفی بکەیت، ئەویش دوعای خێری بۆ پێشەوا عومەری کردو پاشان خزمەتکارەکەی خۆی بانگ کردو ئەو پارەی بۆی هاتبوو دایە دەست خزمەتکارەکەی‌و فەرمووی: ئەوەندەی بەرە بۆ مالّی فلاَن کەس لەم پارەیە، وەئەوەندەی تریشی بەرە بۆ مالّی فلاَنکەس خێزانی معاذ بەوەی زانی کەپارەی لایە وتی: وەلاّ ئێمە خۆشمان زۆر هەژارین بەشی خۆشمان بە، پاشان سەیری کرد چەندی لاماوە هیچی وانەمابوو تەنها دوو دینار نەبێ، ئەوەی دا بەخێزانی بۆ خۆیان.

خزمەتکارەکە گەڕایەوە بۆلای پێشەوا عومەرو ڕووداوەکەی بۆ باسکرد، پێشەوا عومەر فەرمووی ئەوانە دلّیان پەیوەستە بەیەکەوەو برای ڕاستەقینەن. (القرطبی ١٩/١٨)

# «خواردن لەتاریکیدا»

کۆمەڵێك پیاو ڕۆیشتن بۆ سەردانی هاوڕێیەکیان کەژمارەی میوانەکان لەسی کەس زیاتر بوون، بەڵام لەماڵی هاوڕێکەیان نانی کەمی لێبوو کەبەشی نەدەکردن، یەکێ لەهاوڕێکان پێشنیاری ئەوەی کرد کە هەموو خواردنەکە لە قاپێکدا دانێن تابەشیان بکات.

یەکێکی تریان پێشنیاری ئەوەی کرد لەکاتی خواردن چراکە بکوژێنێتەوە هەتا هەرکەسەو ئەوەندە بخوات بەقەدەر پێویستی خۆی، تاکەس هەست بەناڕەحەتیو شەرم نەکات، بەڵێ خواردنەکەیان هێناو لەناوەڕاستدا دایان ناو لەدەوری کۆبوونەوە، ئینجا چراکەیان کوژاندەوە، ماوەیەك مانەوەو لەپاشان هەڵیانکردەوە، بەڵام شتێ زۆر سەیریان بینی، ئەویش ئەوە بوو ئەو خواردنە چۆن دانرابوو ئاوەها هیچ کەمی نەکردووە، چونکە هەموویان لەخۆیان بوردن، زاڵ بوون بەسەر نەفسی خۆیاندا، کەسیان دەستیا بۆ ئەو خواردنە نەبردبوو، بەبرسێتی مابوونەوە، هەموویان وازیان لێهێنا بوو تابرادەرەکەی تری بیخوات.

# ﴿سێ دەنکە خورما﴾

جارێکیان دایکی بڕواداران عائیشە (ﷺ) گوێی لەدەنگی دەرگابوو کاتێک چوو بینی ئافرەتێکی هەژارو دووکچی منداڵی پێیەو داوای خواردن دەکات، لەماڵی عائیشە لەو ڕۆژەدا لەسێ دەنک خورما زیاتری لێنەبوو، هێنای دای بەئافرەتە هەژارەکە، دایکەکەش هەردەنکە خورمایەکی دا بەمنداڵێکیانو سێهەم خورمای بۆخۆی هەڵگرت.

منداڵەکان خورماکانی خۆیان خواردو سەیری دایکیان دەکرد کەخورمای بەدەستەوەیە، دایکەکەش بێ دوودڵی کردی بەدوولەتەوەو هەرمنداڵەی لەتێ خورمای دایە، لەبەر منداڵەکانی خۆی بەبرسی هێشتەوە، عائیشە (ﷺ) زۆری لاسەیر بوو ئەم دایکە چۆن وایکرد بۆ منداڵەکانی.

کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە عائیشە (ﷺ) بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد کە ئەو دایکە چەند هەڵوێستی جوانو سەیری بوو لەخۆی بورد لەبەر منداڵەکانی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إن الله قد أوجب لها بها الجنة).

خوای گەورە بەهۆی ئەوکارەوە بەهەشتی پێبەخشی.

## «لە خۆبردوویی هەتا مردن»

لەغـەزای یەرمووكـدا (حـارث كـوڕی هیشـام)و (عكرمـەی كـوڕی ئـەبی جـەهل)و (عیاش كوڕی ئـەبی ڕەبیعـە) بەسـەختی برینـدار بـوون لـەناو خێمـەی بریندارەكانـدا كەوتبوون، حارث داوای ئاویكرد پیاوێ ئاوی بۆ هێنا كاتێك نزیكی كردەوە لـەدەمی تابیخواتەوە، حارث سەیری كرد عكرمە سەیری ئاوەكە دەكا، زانـی ئـەویش تینویـەتی دەیەوێ ئاو بخوات، حارث وتی: ئەم ئاوە بـەرە بـۆ عكرمـەو بیدەبـەو كاتێك ئاوەكـەی برد بۆ عكرمە، لەپەنایدا عیاش كەوتبوو، عكرمـە حـەزی زۆر لـەئاوبوو تێبینـی كرد عیاش سـەیری ئاوەكە دەكا عكرمـە بـەو پیاوەی وت: بیبـە بـۆ عیـاش، كاتێك كـابرا ئاوەكەی برد بۆ عیاش بینی مردووە.

گەڕایەوەو ئاوەكەی بـردەوە بـۆ عكرمـە بینـی ئـەویش مـردووە، گەڕایـەوە بـۆ لای حارث بینی ئەویش مردووە هەموویان شەهید بوون.

هەركەسەو ئیثاری كرد بـۆ براكـەی تـری، تـا ئـەو ئاوەكە بخواتـەوە تەنانـەت لـەو چركەسـاتەی ژیانـدا كـەزۆر هەسـتیارە. (تفسـیر إبـن كـثیر/٣٣٨/٤ ، نظـرة النعیم/ج٣/٦٣٩).

## «بەشە درهەم»

ڕۆژێ عەبدوڵا كوڕی زوبێـر (ﷺ) سـەد هـەزار درهـەمی نـارد بـۆ (عائشـە)ی پوری (دایكی بڕوا داران) عائیشە (ﷺ) وەری گرتو بەخزمەتكارەكەی فەرموو بیكە بەچەند بەش خزمەتكارەكـەی ئامـادەی كـرد، عائیشـە (ﷺ) هـەمووی دانـاو دابەشـی كـرد بەسـەر هـەژاران‌و موسـوڵمانانی ئاوشـاردا، تاهـەموو درهەمـەكان تـەواوبوو هـیچ نـەماوە. ئـەو ڕۆژە عائیشـە بـەڕۆژو بـوو كاتێـك ئێـوارە كـاتی بـەربانگ هـات خزمەتكارەكـەی ئـاوو زەیتـی بـۆ هێنـا، خزمەتكارەكەی بەعائیشـەی وت: ئـەی دایكی ئیمانداران، بۆ لەو هەموو درهەمەی ئەمڕۆ دابەشتكرد درهەمێكت دانـەنا بـۆ خۆمـان تاگۆشتمان بێ بكڕیایە بـۆ بـەربانگ، عائیشە (ﷺ) فـەرمووی: گـەر لەوكاتـەدا بـیرت بخستمایەتەوە وامدەكرد.

# «لە گیانی خۆی بورد»

سەرانی قوڕەیش لەسەر کوشتنی پێغەمبەر (ﷺ) ڕێککەوتن، بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵێ شمشێر بەدەستیان حازرکرد لەبەردەم ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) تاشەهیدی بکەن، بەڵام خوا پاراستی لەفێڵی بێ باوەڕان، خوا وەحی بۆ کرد کۆچ بکات بۆ مەدینەی منەوەرە.

پێغەمبەر (ﷺ) داوای لەعەلی کوڕی ئەبی تالبی ئامۆزای کرد تا لەشوێنی ئەو بخەوێ، هیچ دوودڵ نەبوو خێرا قبوڵی کرد، خۆیکرد بەقوربانی پێغەمبەر (ﷺ) لەشوێنەکەی خەوت، عەباکەی پێغەمبەری دا بەخۆیدا، کەزۆر دڵنیا بوو بێباوەڕان وادەزانن پێغەمبەرەو دەیکوژن، پێغەمبەر (ﷺ) بەسەلامەتی لەناویان ڕۆیشت ئەوان بێ ئاگابوون، کاتێك بێ باوەڕەکان لەدەرگاوە سەیریان دەکرد، وایان گومانبرد پێغەمبەر (ﷺ) هێشتا خەوتووە، کات درەنگ بوو، بڕیاریاندا بڕۆنە ژوورەوە، شمشێریان لەکێلان دەرهێناو دەرگایان کردەوە، عەباکەیان لادا بینیان وا عەلییە خەوتووە.

عەلی(ﷺ) بەم هەڵوێستەی لەخۆی بوردو فەزڵی پێغەمبەری(ﷺ) دا بەسەر خۆیدا.



# «دراوسێیەتی دوو خۆشەویست»

پێشەوا عومەری کوڕی خطاب (ﷺ)پێش نوێژی بەیانی ڕووەو مزگەوت ڕۆیشت تا جەماعەتی بەیانی بکاو ئیمامی موسوڵمانان بێ، ئەبو لۆلۆی مەجوسی ناپاك لەنوێژدا خەنجەرێکی ژەهراوی دالە ئیمامی عومەرو زۆر بەسەختی بریندار کرد لەناو نوێژەکەیدا، کاتێك پێشەوا عومەر (ﷺ) هەستی کرد ئەجەلی نزیکە حەزیکرد لەپەنای پێغەمبەرو (ﷺ)و ئەبوبەکر بنێژرێ، عەبدولای کوڕی نارد بۆ لای دایکی ئیمانداران عائیشە (ﷺ) تارێگەی عومەر بدات لەنزیکی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەکر بنێژرێ.

عەبدولا ڕۆیشت بۆماڵی عائیشە (ﷺ) سەلامی لێکرد، پاشان ئیجازەی چوونە ژوورەوەی وەرگرت، عەبدولا فەرمووی: عومەری کوڕی خطاب سەلامت لێدەکاو ڕوخسەت دەخوازێ کەرێگەی بدەن لەپەنای دوو هاوەڵەکەی بنێژرێ، عائیشە ڕازی بوو لە کاتێکدا بۆ خۆی دانابوو تالەپەنای مێردی واتە (پێغەمبەر)و (باوکی) بەرێزی ئەبوبەکر بنێژرێ، بەلام لەخۆی بوردو ئەو دراوسێیەتیە پتەوەی بەخشی بە عومەر (ﷺ). (البخاري/ الفتح٣/١٣٩٢).

## ﴿قونبور و پێشەوا عەلی﴾

دەگێڕنەوە ئیمامی عەلی (ﷺ) لەگەڵ خزمەتکارەکەی (قونبوورە) چون بۆ بازاڕ ئیمامی عەلی خزمەتکارەکەی وەستان لەلای پۆشاك فرۆشێك، فەرمووی: ئەی گەنج ئەو دوو پارچە قوماشەمان پێ بفرۆشە بە پێنج درهەم (لەو پێنج درهەمە زیاتری پێنەبوو) گەنجەکە دووپارچە قوماشەکەی دانیو یەکیان بەسێ درهەم ئەو تریان بەدوو درهەم.

پێشەوا عەلی (ﷺ) هەردوو پۆشاکی هەلگرتو پۆشاکە گرانەکەی دایە خزمەتکارەکەی، بەلام (قونبوور) قبوولی نەکرد، وتی: ئەی پێشەوا تۆ ئەو پۆشاکە چاکەیان هەڵبگرە، چونکە تۆ لەسەر مینبەر ڕادەوەستی، قسە بۆ خەڵکی دەکەی، بەلام پێشەوا عەلی زۆر سووربوو، کەدەبێ خزمەتکارەکەی پۆشاکە چاکە گرانەکە هەلگرێ، پێشەوا عەلی فەرمووی: تۆ گەنجی من شەرم دەکەم لەخوا خۆم لەتۆ جیابکەمەوە.

ئیسلام شێوازی مامەڵەی لەگەڵ بەندە و خزمەتکاردا گۆڕی و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوانە (واتە خزمەتکار) برای ئێوەن، خۆتان چیتان خوارد، ئەوەش بەشی ئەوان بدەن، وەك خۆتان پۆشاکیان بۆ بکەن، یارمەتییان بدەن و کاری قورس و گرانیان پێمەکەن).

# ﴿لەخۆ بوردوییەك بەلای خواوە سەیرە﴾

پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) داوای خواردنی لێکرد، کابرا برسی بوو پێغەمبەر ناردی بۆلای خێزانەکانی داوای خواردنی لێکردن بۆ ئەم پیاوە، بەلاَم هیچ شتێ نەبوو لەماڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوەڵەکانی فەرموو (کێ ئەمشەو میوانداری دەکات) پیاوێکی مەدینەیی فەرمووی: من ئەی پێغەمبەری خوا، کابرای میوان لەگەڵ هاوەڵەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆشتەوە بۆ ماڵەوە.

کاتێ هاوەڵەکەی پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆلای خێزانەکەی پرسی: هیچ شتێکمان هەیە؟ خێزانەکەی وتی: نەخێر تەنها بەشی منداڵەکانمان هەیە، پیاوەکە وتی: منداڵەکان سەرقاڵ بکە بەشتێ یان کاتی خواردن بیانخەوێنە، کاتێ خواردنت هێنا بۆ میوانەکە چراکە بکوژێنەرەوە تا واهەستکا ئێمەش لەگەڵیدا نان دەخۆین، کابرای ئەنصاریو خێزانەکەی ئەوەی لەسەری ڕێککەوتبوون وایانکرد، میوانەکەیان تێری خوارد، کابرا لەگەڵ ژنو منداڵەکانی خەوتن بەبرسی تا بەیانی، کاتێك کابرای ئەنصاری هات بۆ مزگەوت، پێغەمبەر (ﷺ)هەواڵی دایە کەخوای گەورە بەلایەوە سەیر بوو کەچۆن ڕێزی میوانەکەتان گرتوو لەمافی خۆتان بوردن. (البخاري و مسلم).

# «لەخۆ بوردویی و داوێنپاکی»

کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە ئەوەی منەوەرە برایەتی دروستکرد لەنێوان کۆچەریەکان و پشتیوانەکان (المهاجر والانصار) هەر ئەنصاریەک میوانداری برایەکی کۆچەری دەکرد.

سەعدی کوڕی ڕەبیع میوانداری عەبدولرەحمانی کوڕی عەوفی بەرکەوت، پێی وت: ئەی برام ئەمە نیوەی ماڵەکەم و نیوەی سەروەتەکەم وەئەوە دوو هاوسەرم هەیە، کامیانت پێ باشە تەڵاقی دەدەم! مارەی بکەرە وە لەدوای تەواوبوونی وادەی شەرعی؟!!

عەبدولرەحمان کوڕی عەوف زۆر سوپاسی سەعدی کرد لەسەر ئەو بەخشین و لەخۆ بوردوییەی، وەبەسەعدی وت: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ناوماڵ و سەروەت و خێزانتەوە، بازاڕم نیشان بدە.

پاشان عەبدولرەحمان چوو بۆ بازاڕو دەستی دایە کەسابەت و کڕین و فرۆشتن پەیوەست بوو بەئاکارو ڕەوشتی موسوڵمانی بازرگانەوە لەگەڵ ڕۆشتنی ڕۆژگاردا عەبدولرەحمان بوو بەیەکێک لەهەرە دەوڵەمەندەکانی شار.

بەم شێوە پشتیوانان لەخۆیان بوردن و کۆچەرییەکانیش ئامادە نەبون ببن بەئەرک بەسەر براکانیانەوە.



# «لەخۆ بوردویی و بەخشین»

ڕۆژێکیان یەکێك لە ئافرەتە صەحابیەکان بڕیاریدا پۆشاکێ جوان دروست بکات، ماوەیەکی زۆر خەریکی بوو تا تەواویکرد، زۆر جوان دروستی کرد، کاتێ تەواو بوو هەڵی گرتو بەدیاری بردی بۆ پێغەمبەر (ﷺ)و پێی بەخشی وەکو دیاری، وە پێغەمبەریش دیاریەکەی قبوڵ کردو سوپاسی کرد، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) پۆشاکەکەی لەبەرکرد، یەکێ لە هاوەڵەکان بەلایەوە جوانو سەیر بوو، داوای لە پێغەمبەر کرد کەئەو پۆشاکەی پێ ببەخشێ، پێغەمبەر (ﷺ) عادەتی وابووە داوای چی لێکرابێ بەخشیویەتی‌و ڕەدی نەکردۆتەوە، چونکە زۆر بەخشندەو سەخی بووە، لەبەخشین‌و سەخاوەتدا وەکو شنەبای فێنك بووە، بەخشیویەتی‌و لەهەژاری نەترساوە، پێغەمبەر (ﷺ) پۆشاکەکەی داناو بەخشی بەپیاوەکەو لەخۆی بورد.

هەندێ لەخەڵکی وتیان: بۆ لێت وەرگرت پێغەمبەر خۆی پێویستی پێیەتی.

کابرا بۆی ڕوونکردنەوە بۆ ئەوەم ناوێ لەبەری بکەم، بەڵکو دەمەوێ بیکەن بەکفنم کاتێ مردم تا بەر بەرەکەتی پێغەمبەر بکەوم، بەڵێ ئەم هاوەڵە کاتێ مرد لەپۆشاکەکەی پێغەمبەردا کفن کرا، لەو کفنە پاکە جوانە. (البخاری/ فتح/١٠/٦٠٣٦ ، نظرة النعیم/ج٣/٦٢٨)

# «بازرگان و سەگ»

دەگێڕنـەوە بازرگانێـك سـەگێكی بـەوەفای هـەبوو، خزمـەتی زۆری دەكـردو پاسەوانی دەكرد، كابرای بازرگانیش زۆر مامەڵەی جوان بـوو لەگەڵی خزمـەتی سەگەكەی دەكرد ڕۆژ بەڕۆژ سەگەكەیش وەفای زیاتر دەبوو بۆ بازرگانەكە.

ڕۆژێ كابرای بازرگان داوای لە خزمەتكارەكەی كرد خـواردنی بـۆ ئامادەبكات ئەویش پەلەی كردو خێرا خواردنێ كەحەزی لێـی بـوو بـۆی ئامادەكردو لەسـەر سفرەكە داینا.

سەگەكەی نزیكی سفرەكە وەستابوو سەیری دەكرد دیمـەنێكی سـەیری بینـی زۆر ترسـناك بـوو، وامـارێ هاتـە ژوورەوە لەدەرگاكـەوە چـووە سـەر سـفرەكەو هەندێ خواردنی خواردو وەنەختێ لەژەهری ڕشتە ناو خواردنەكەوە، سـەگەكە كەوتە شوێن مارەكە، بەڵام مارەكـە خێـرا ڕۆیشـتو خـۆی شـاردەوە چـووە كونێ لـەناو باخەكـەدا، پاشـان كـابرای بازرگـان هـات، دانیشـت تـا نـان بخـوات، بینـی سەگەكەی وا لەپاڵیدا سەیری دەكاو دەیـەوێ هـەواڵی ڕووداوەكـەی بـداتێ كەچـی ڕوویداوە. بـەڵام كابرا حـاڵی نـەبوو چی بـووە، وای زانـی سـەگەكەی برسـییەتی هەنـدێ خـواردنی بۆدانـا، بـەڵام سـەگەكە دووركەوتـەوە لەخواردنەكـەو لێـی نەخواردو كەوتە وەڕین.

كابرا بەلایـەوە سـەیر بـوو، بـەڵام گرنگـی پێنـەداو دەسـتی درێـژكرد تـا نـان بخوات، خێرا سـەگەكەی خـۆی هەڵدایـە سـەر سـفرەكەو لەخواردنەكـەی خـواردو كـەوت، كـابرا خواردنەكـەی لەبەردەسـتا مایـەوە بـێ ئـەوەی لێـی بخـوات، وەزۆر بەسـەر سـامییەوە وەسـتا بـوو سـەیری دەكـرد چـی ڕوویـدا، ئەمـەش نیشـانەی ئەوەیە گیانـدارانیش لەخۆ بوردوییان هەیە.

# «گەنجێك و سەگێك»

دەگێڕنەوە جارێکیان گەنجێك باخەوانی باخێکی دارخورمابوو ئەم گەنجە زۆر لەخواترس بوو بڕوایەکی زۆر بەهێزی بوو، ڕەوشتی زۆر جوان بوو.

ڕۆژێك کاتی نانخواردن خواردنەکەی ئامادەکرد بوو سێ کولێرە بوو، دەستی برد کولێرەیەکیان بخوات ناوی خوای برد پێش خواردنی، لەپڕێکدا چاوی کەوت بەسەگێك بەرەو لای ئەو هاتو دەوەڕی کاتێك نزیك بووەوە بینی سەیری دەستی ئەم دەکات، حاڵی بوو کەئەم سەگە زۆر برسییە یەکێ لەکولێرەکانی خۆی دایە، سەگەکە خواردی، پاشان بۆ جاری دووەم سەیری گەنجەکەی کردەوە ئەویش کولێرەی دووەمی دایە، بۆ جاری سێیەم سەگەکە سەیری گەنجەکەی کردەوە ئەویش کولێرەی سێیەمی دایەو خواردی‌و پاشان سەگەکە ڕۆیشت.

ئەم دیمەنە سەیرە کابرایەکی خواناس دەوڵەمەند و بەخشندە چاوی لێی بوو، بێ ئەوەی گەنجەکە ئاگای لەو پیاوە بەناوبانگە بەخشندەیە بێ، کابرا نزیك بۆوە لەگەنجەکەو پرسیاری لێکرد خواردنی ڕۆژانەی تۆ چەندە ئەی گەنج؟ گەنجەکە وتی: سێ کولێرەیە خاوەنی ئەم باخە دەمداتێ هەموو ڕۆژێ.

کابرا وتی: بۆ واتکرد لەگەڵ ئەو سەگەدا خواردنەکەت دایە؟

گەنجەکە وتی: لەبەر ئەوەی ئەم ئەرزە هیچ سەگێکی لێنازی زانیم ئەم سەگە لەشوێنێ دوورەوە هاتووە بەدوای خواردندا دەگەڕێ‌و برسێتی زۆری بۆ هێناوە بۆیە منیش پێم ناخۆش بوو بەبرسێتی بگەڕێتەوە کابرا وتی: باشە ئەمڕۆ تۆ چی دەخۆی؟

گەنجەکە وتی: هیچ ناخۆم ئارام دەگرم تاسبەینێ، پاشان کابرا باسی خۆی کرد کەخەڵکی بە بەخشندە ناوی دەبەن وتی: سوێند بەخوا ئەم گەنجە زۆر لەمن بەخشندەترە، پاشان کابرا گەنجەکەی جێ هێڵاو ڕۆی بۆلای خاوەنی ئەو باخەی

گەنجەکە ئیشی تێدا دەکات، باخچەی لەخاوەنەکەی کڕی و کابرای کردە شاهید و باخەکەی کرد بە دیاری بۆ گەنجەکە بەهۆی بەخشندەییەوە.

چونکە گەنجەکە هەستی کرد بەبرسێتی سەگەکە، چی خواردنی لابوو بەخشی بەسەگەکە، ئەو ڕۆژەی بەبرسێتی، بەسەربرد.

## لەکۆتاییدا

لەخۆ بوردویی یەکێکە لە ڕەوشتە جوانەکان کەموسوڵمان لەزەتیان لێوەرگرتووە بەڕاستی بەخشیویانە لەوەی خوای گەورە پێیداون، بازۆر لەناڕەحەتیو پێویستیشدا بووبن.

لەخۆبوردویی ئەوەیە موسوڵمان پێویستی برای موسوڵمان پێش پێویستی خۆی بخات، لەبەر پاداشتی گەورە لای خوای گەورە، لەخۆبوردویی پاڵنەرێکی گەورەیە بۆ بەستنەوەی دڵەکان بەیەکەوەو بەهێزکردنیان، وەتۆوی خۆشەویستیو پێکەوە ژیان لەناو دڵەکان دەڕوێنێ.

دەیانکات بەیەك لاشە کەهەموویان هەست بە کەمو کووڕی ئەوی تریان بکات.

خوای گەورە ستایشی باوەڕداران دەکات کە ڕەوشتی لەخۆبوردوویان تیایە، لەمافی خۆیان دەبوورنو دەیدەن بەبراو خوشکەکانیان (ويؤثرون على أنفسهم ولوكان بهم خصاصه).



# چەند چیرۆکێك لەبارەی چاکەکردن

ئامادەکردنی

ئیبراهیم خەلیل

وەرگێڕانی

ئەبوبەکر محەمەد شاربازێری

# ﴿چاكەكردن﴾

الاحسان والبر: چاكەكردن دژی خراپە كردنە

ئەنجامدانی كارو كردەوەیەك كەجوان وچاك بێت،لەدنیادا ستایش ولە قیامەتدا پاداشت بەدوای خۆیدا بهێنێت.

إحسان،لەخواپەرستیدا وایە كەوابزانی خوای گەورە دەبینی،ئەگەر هەستت بەمە نەكرد دڵنیابیت كەخوای گەورە تۆ دەبینێ وچاودێرتە.

*پێغەمبەرﷺبە(عەلی كوڕی ابی گالبی)ی فەرموو: (الا أدلك على أكرم أخلاق الدنيا والاخرة؟ أن تصل مَن قطعكَ، وتعطي مَن حرَمكَ، وذاكَ هوَ الاحسان)

*چاكەكردن بازنەیەكی فراوانەو هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، بەتایبەت بازنە نزیكەكان لە مرۆڤەوە وەك : دایك وباوك،هاوسەرو منداڵ،دراوسێ، خزم و سیلەی رەحم، كەسانی بێ باوەڕ، هەژاران، رێبواران،بەندەو ژێردەستەكان...

*خوای گەورە فەرمانی بەچاكە كردووە :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾(النحل ٩٠).

*بە بەندەكانم بڵێ، لەكاتی قسەكردندا ئەوە بڵێن كە چاك بێت:﴿وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ ٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ يَنزَغُ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٗا مُّبِينٗا﴾(الاسراء ٥٣).

*چاكە كاربە هەروەك خوا لەگەڵ تۆدا چاكە كار بووە:﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ ( القصص ٧٧).

★چاکە کاربە خوای گەورە چاکە کارانی خۆش دەوێت :﴿وَأَنفِقُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۛ وَأَحْسِنُوٓاْ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾(البقره١٩٥)

﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْاْ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾(ال عمران ١٧٢).

﴿بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾(البقره ١١٢).

(هەر کەس ملکەچی خوابێت و چاکە کار بێت پاداشتی لای خوایە.

پێغەمبەرﷺدەفەرموێت :(إِنَّ اللهَ كَتَبَ الإِحسان على كُل شىء ،فإذا قتلتُم فأحسِنوا القِتلَةَ وَإذا ذبحتُم فأحسنوا الذبحَ،وَليُحدَ أحدكُم شَفرَتَهُ فليُرح ذَبيحَتهُ)(رواه مسلم).

واتە: خوای گەورە چاکە کردنی لەگەڵ هەموو شتێکدا نوسیوە وەفەرمانی پێکردووە،بۆیە ئەگەر گیان لەبەرێکتان کوشت شێوازەکەی باچاك بێت وزۆر ئازاری مەدەن،ئەگەر گیان لەبەرێکتان سەر بڕی جوان سەری ببڕن وچەقۆکە تیژ بکەن وزوو کارەکە ئەنجام بدەن با بەئازارەوە نەمێنێتەوە.

شاعیر دەڵێت:

أحسن الى الناس تستعبد قلبهم فطالما إستعبد الانسان إحسان

(عنوان الحكم)

واتە:چاکە کاربە لەگەڵ خەڵکیدا دڵیان ڕادەکێشی،چونکە مرۆڤ بەندەی چاکە لەگەڵ کردنە.

## «چاکەیەکی گەورە»

لەکاتی خۆیدا عەلی کوڕی حسێن (ﷺ) زۆر گوێڕایەڵی دایکی دەکرد، نازی دەکێشاو خۆشی دەویستو زۆر چاودێری دەکرد، بەلاَم هەرگیز لەگەڵ دایکیدا لەناویەك قاپدا خواردنی نەدەخوارد.

هەندێ خەڵك پێیان وت: تۆ چاکترین کەسی بۆچی لەگەڵ دایکت خواردن ناخۆی لەسەر یەك قاپ؟

لەوەلاَمدا عەلی کوڕی حسێن وتی: دەترسم من دەستم بەرم بۆ خواردنێ لەناو قاپەکەدا لەپێشدا دایکم سەیری کردبێ، بەوەی من ئەو خواردنە بخۆم دایکم ئازاری بگاتو ئەزیەتی بدەم!!

## «گوێدرێژ»

ڕۆژێکیان عەبدولاَ کوڕی عمر (ﷺ) گەشتی کرد بۆ مەککە، مێزەرێکی لەسەر بەستبوو، وەگوێدرێژێکی پێ بوو بۆ سواری.

لەڕێگا تووشی کابرایەکی دەشتەکی بوو عەبدولاَ وتی: ئایا تۆ فلاَن کەسی؟ وتی: بەڵێ.

عەبدولاَ لەسەر گوێدرێژەکە دابەزیو مێزەرەکەی دانا بەکابرای وت: سواری گوێدرێژەکە بەو، ئەم مێزەرە ببەستە لەسەرت، هەندێ هاوەڵی وتیان خوا لێت خۆشبێت تۆ ئەو کارەت بۆ کرد، ولاَخەکەش‌و مێزەرەکەشت دایە، عەبدولاَ نهێنی ئەوەی بۆ ئاشکراکردن وتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە فەرمووی: (إن من أكبر البر أن يصل الرجل أهل ود أبيه بعد أن يموت)

چاکترین چاکە ئەوەیە کە پیاو چاکە بکات لەگەڵ دۆستانی باوکی لەدوای ئەوەی ئەو باوکە وەفاتی کردبێ، چونکە ئەم پیاوە باوکی هاوەڵی باوکمبوو واتە: عمری کوڕی خطاب (ﷺ).

## «چاكە هۆی چوونە بەهەشتە»

حارسەی كوڕی نعمان (ﷺ) زۆر چاك بوو لەگەڵ دایكیو چاكەی گەورەی بەرامبەری دەكرد لەبەر ئەوە پاداشتی بەهەشتی بوو.

ڕۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) خەوتبوو بینی كەوا حارسە لەناو بەهەشتدایە، گوێی لێ بوو دەنگی دەهات كەقورئانی دەخوێند، فەرمووی ئەمە كێیە؟ وتیان: ئەوە حارسەی كوڕی نعمانە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەمە بەهۆی چاكەكردنی بوو لەگەڵ دایكی بۆی ئامادەكراوە.

## «چاكە دوای مردن»

كابرایەك هەبوو زۆر چاكەی لەگەڵ دایكو باوكی دەكردوو خزمەتی دەكردنو دڵی ڕادەگرت بەجوانترین شێوە، لەدوای ئەوەی باوكی مرد ڕۆشت بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئایا هیچ چاكەیەك ماوە من بیكەم لەدوای مردنی باوكم؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، دوعایان بۆ بكە، داوای لێخۆشبوونیان لەخوا بۆبكە، چی بەڵێنیان داوە بۆیان جێبەجێ بكە.

ڕێزی هاوڕێكانیان بگرە، وەپەیوەندی ئەو كەسانە مەپچڕە كە بەهۆی ئەوانەوە پەیوەست بوون پێتەوە، ئەوە چاكترین منداڵە كەسور بێ لەسەر چاكەكردن بۆ دایكو باوكی لەژیانیاندا كە مابوون وەلەپاشاندا بۆ دوای مردنیان باشترین چاكەیە.

## «پاداشتی زۆر گەورەیە»

دەگێڕنەوە پیاوێ دایکی هەڵگرتبوو لەسەر شانی بەدەوری ماڵی خوا (کەعبەی پیرۆز) تەوافی پێدەکرد.

لەدوای تەواو بوونی دەورانی ماڵی بەیت، کابرا چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا حەقی دایکمم داوە بەم کارەم؟، چونکە کابرا وای گومان دەبرد ئەم هەڵگرتنەو تەواف پێکردنی چاکەیە بەرامبەر ئەجری دایکی چاکەی تەواوی لەگەڵ کردووە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوەڵا بەوکارەت نابیتە هۆی پاداشتی تەنها یەك ئازارو ژانی لەدایك بوونت! ئەمە تۆ کردت بەقەد ئەومنیە لەوکاتە نارەحەتانەی دایکت لەکاتی هاتنە دونیات دیویەتی.

خوا دەفەرموێ: [ووصينا الانسان بوالديه إحساناً حملته أمه كرهاً ووضعته كرهاً وحمله وفصاله ثلاثون شهراً] الأحقاف ١٥.

## «چاکی دایك»

خاوەنی دوو پشتێن (ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق) خوا لەخۆی‌و باوکی ڕازی بێت.

ئافرەتە صەحابیەکی بەڕێزبوو، لەگەڵ باوکیدا موسوڵمان بوو، تەنها دایکی بەبێ باوەڕی‌و موشریکی مابوو، ڕۆژێ ئەسما (ﷺ) لەماڵەوە بینی دایکی واهات ئەمیش حەزی کرد چاکەی لەگەڵ بکات، بەڵام ترسا ئەسما کەچاکە لەگەڵ دایکی بکا، چونکە ئەو بێ باوەڕ بوو.

بۆیە ئەسما زۆر بیری کردەوە چی بکات، ئایا چاکە بکات لەگەڵ دایکی یان پەیوەندی لەگەڵ بچڕێنێ، ئەسما ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی، ئایا من چی بکەم لەگەڵ دایکم؟

پێغەمبەر فەرمانیدا کەچاکە بکات لەگەڵ دایکی، فەرمووی بەڵێ:چاکە بکە لەگەڵ دایکت‌و پەیوەندی مەپچڕێن

# خۆبەخت کردنێکی گەورە

ئیبراهیمی پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێ) حەزو هیوای هەبوو کەخوا منداڵیان پێ ببەخشێ دوای ئەوەی خوا منداڵی پێ بەخشین زۆر کوڕەکەی خۆشدەویست واتە ئیسماعیل. شەوێك ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێ) لەخەودا بینی ئیسماعیل سەردەبڕێ، ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) زانی ئەم خەوە ڕاستەو حەقە دەبێ ئەنجامی بدات، چونکە دڵنیابوو کەئەمە نیگاو وەحیە لەلایەن پەروەردگارەوە تا بڕواو ئارام گرتنی دەربکەوێ تاقیکردنەوەی خوای بوو بۆ ئیبراهیم ئەویش فەرمانی خوای جێبەجێ کردو بە ئیسماعیلی کوڕی وت:

[يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى] الصافات ١٠٢

واتە: ئیبراهیم ڕویکردە ئیسماعیل و فەرمووی: کوڕی خۆم لەخەودا بینیم تۆم سەر دەبڕی جا بزانە ڕەئی تۆ چییە؟ دەڵێی چی؟

ئیسماعیل وەڵامی باوکی دایەوە بۆ ئەم فەرمانە، بڕوای بەخوا پتەوبوو دڵنیا ئەوە فەرمانی خوایە، بە باوکی وت: [قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ] (الصافات ١٠٢).

واتە: ئەی باوکی بەڕێزم چی فەرمانت پێکراوە ئەنجامی بدە ئینشائەڵا من لەسەر ئەو فەرمانە ئارام دەگرم. کاتێك ئیبراهیم ئامادەی جێبەجێ کردنی کارەکە بوو تا ئیسماعیل سەرببڕێ گوێی لەدەنگێك بوو وتی:

(يا إبراهيم قد صدقت الرؤيا إنا كذالك نجزى المحسنين).

ئەی ئیبراهیم بەڕاستی خەوەکەت هێنایەدی ئێمە هەرئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

ئیبراهیم بینی وا بەرانێکی سپی خوا بۆینارد لە ئاسمانەوە، تا ئەمە بکات بەقوربانی لەباتی ئیسماعیلی کوڕی، بەم شێوەیە خوای گەورە پاداشتی دانەوە، لەئەنجامی چاکەو گوێڕایەڵیو بڕوایەکی بەهێز بەخوا.

# «چاکە لەگەڵ پوردا»

جارێکیان پیاوێ گوناهی کرد پاشان زۆر بێتاقەتو پەشیمان بوو، سەرزەنشتی خۆی دەکرد بۆ وامکرد، بیری لەخۆیو ئەو تاوانە دەکردەوە ئایا تەوبەم بۆ هەیە یان نا؟ بۆیە کابرا ناچار ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوناهێ گەورەم ئەنجام داوە ئایا پەشیمانیو تەوبەم بۆ هەیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا دایكو باوكت هەیە؟ كابرا فەرمووی: نەخێر، فەرمووی: ئەی پورت هەیە؟

کابرا وتی: بەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دەی بڕۆ چاکە لەگەڵ ئەودا بکە ئابەو شێوەیە پێغەمبەر (ﷺ) فێرماندەکا کەچاکە کردن گوناه دەسڕێتەوە باهەمووومان سوربین لەسەری تاخوای گەورە لەگوناهەکانمان خۆش دەبێت.



# ﴿چاکەکردن و بانگەواز﴾

ئەبو هورەیرە (ﷺ) موسوڵمان بوو دایکی هەربەبێ باوەڕی مایەوە، دوعای بۆ دەکرد خوای گەورە هیدایەتی دایکی بدات، جارێکیان بانگی کرد بۆ ئیمان دایکی جنێوی بە پێغەمبەر دا، (ئەبو هورەیرە) بێتاقەت بوو ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و بەگریانەوە هەواڵی بۆ گێڕایەوە کە لەگەڵ دایکیدا چی ڕوویدا! داوای لە پێغەمبەر کرد کەدوعا بۆ دایکی بکات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خوایە هیدایەتی دایکی ئەبی هورەیرە بدە، ئەبی هورەیرە زۆر دڵخۆش بوو بەدوعاکەی پێغەمبەر (ﷺ) خێرا گەڕایەوە بۆماڵەوە، بینی دەرگاکە داخراوە، هەستی کرد دایکی والەوێ، واخۆی دەشوات دایکی داوای کرد چاوەڕوان بێ جارێ، کاتێك دایکی جلەکانی لەبەرکردو خۆی گۆڕی هاتە دەرەوە وتی: (أشهد أن لا اله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله) ئەبی هورەیرە زۆر دلی خۆش بوو، چووەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعام بۆبکە منو دایکم خۆشەویست بین لای بڕواداران، وەئەوانیش لای ئێمە خۆشەویست بن: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أللهم حبب عبدك هذا وأمه الى عبادك المؤمنين) واتە: خوایە ئەم بەندەیەت واتە ئەبو هورەیرەو دایکی خۆشەویست بکە لای بەندە باوەڕ دارەکانت.



# «چاکی پێغەمبەر»

فاتمەی کچی ئەسەد خێزانی ئەبی طالب ئامۆژنی پێغەمبەر (ﷺ) کەلەجێی دایك بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) زۆر چاکەی لەگەڵ دەکرد، نەك تەنها لەژیانیدا بەڵکو کاتێك کۆچی دوایی کرد باشترین چاکەی لەگەڵداکرد.

دەگێڕنەوە کە فاتمە وەفاتی کرد پێغەمبەر (ﷺ) چوو کراسەکەی خۆی کردە بەری‌و لەناو گۆڕەکەیدا ڕاکشا هاوەڵەکانی وتیان: نەماندیوی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ کەس بەم شێوەبی‌و ئاوای بۆ بکەی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەدوای نەمانی ئەبی تالب کەس چاکەی لەگەڵ من نەکردووە بەئەندازەی ئەم ئافرەتە، بۆیە ئەم عەبایەی خۆمم تێوەپێچا تابیێتە هۆی ڕازاندنەوەی لەبەهەشتدا، بۆیە لەناو گۆڕەکەیدا ڕاکشام تا ئازارو نارەحەتی ناوگۆڕی لەسەر سوك بێت.

# «چاکەکردن کلیلی خۆشییە - کوڕێکی چاکەکار»

پیاوێك هەبوو کوڕێکی چاکی هەبوو کەزۆر لەگەڵ باوکیدا باش بوو ئەم کوڕە بەردەوام لەهەوڵی ڕازیی کردنی باوکیدا بوو بۆیە باوکی زۆری خۆشدەویست هەتا ئەوەندەی کوڕەکە بەوەناسرابوو کە زۆر لەگەڵ دایك‌و باوکی چاکە خەڵکی پرسیاریان دەکرد لەنێوان خۆیاندا دەبێ ئەم کوڕە چی کردبێ تابێتە نموونە لەچاکەکردندا لەگەڵ دایك‌و باوکدا؟

جارێك یەکێك باوکی کوڕەکەی بینی وەپرسیاری کرد لەبارەی هەڵسووکەوتی کوڕەکەی لەگەڵیدا، باوکەکەش لەوەڵامدا وتی: کەوا کوڕەی هەرکات لەڕێدا لەگەڵیدا بڕوا پێش ناکەوێ‌و بەڵکو تەنها لەدواوەی دەڕوا ئەمە وەکو ڕێزو حورمەت بۆ باوکی، لەشەودا لەپێشیەوە دەڕوا تاچاوساغی ڕێگای بێت.

وەهیچ کات نەچووەتە سەر سەربانی خانوویەك کەباوکی لەژێریدا دانیشتبێ.

# «تەنها بێ باوەڕی»

سعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) یەکێکە لەو کەسانەی کەسەرەتا موسوڵمان بوو، بەڵام سەعد (ﷺ) زۆر گوێڕایەڵی دایکی بوو چاکەی لەگەڵدا دەکردو زۆری خۆشدەویست، هیچ بێ فەرمانی و سەرزەنشتی دایکی نەدەکرد، بەڵام دایکی لەسەر بێباوەڕەی‌و پەرستنی بتەکان بەردەوام بوو، زۆر بێتاقەت‌و خەمبار بوو بەموسوڵمان بوونی سەعدی کوڕی، زۆری لێدەکرد کەپاشگەز بێتەوە، وەهەروەها سوێندی لێخوارد کەقسەی لەگەڵ ناکات هەتاماوە تا پەشیمان بێتەوە لەدینی خوا وەبگەڕێتەوە سەر دینی باوباپیرانی، چونکە دایکی دەیزانی کەلەدینی ئیسلام دا ئامۆژگاری خوای تێدایە کەچاك بن لەگەڵ دایك‌و باوکیان بۆیە وتی: من دایکتم فەرمانت پێدەکەم کەپاشگەز بیتەوە، دایکی سەعد گومڕا بوو وتی: نەنان دەخۆم نەئاو (٣) ڕۆژ هیچ ناخۆم تا زۆر نارەحەت بم، وایگومان دەبرد ئەمە دەبێتە هۆی پاشگەز بوونەوەی سەعد لەئیسلام، بەڵام کاتێك دایکی بینی وەختە بمرێ، کەچی سەعد بەگوێی دایکی نەکردو پاشگەز نەبۆوە.

خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە پشتگیری بۆ چوونەکەی سەعدی کرد لەسەر هەڵوێست‌و پەشیمان نەبوونەوەی فەرمووی: [وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ] العنكبوت ٨.

واتە: ئێمە فەرمانمان داوە بەئادەمیزاد کە چاك ڕەفتاربێت لەگەڵ دایك‌و باوکیدا، خۆ ئەگەر زۆریان لێکردیت تاهاوەڵ‌و هاوبەشم بۆ بڕیاربدەیت بێئەوەی زانست‌و زانیاریت هەبێت دەربارەی ئەوە ملکەچیان مەبەو بەگوێیان مەکە دڵنیاش بن کەگەڕانەوەتان بۆلای منە، ئەوکاتە ئاگادارتان ئەکەمەوە لەوکردەوانەی کە ئەنجامتان داوە.

# «چاکە لەگەڵ بێباوەڕدا»

خوای گەورە ئیبراهیمی کرد بەپێغەمبەر، بەڵام باوکی بتی دروست دەکردو لەناو خەڵکدا دەیفرۆشت ئەوانیش سوجدەیان بۆ دەبردو دەیان پەرست، بڕوایان وابوو ئەم بتانە سودیان پێ نەگەیەنێتو ڕزقیان دەدەن، وەهەروەها زەرەریان پێ دەگەیەنێتو لەناویان دەبات لەکاتێکدا ئیبراهیم چاکەی لەگەڵ باوکی دەکردو بانگی دەکرد بۆ خواپەرستی ڕاستەقینە بەشێوازی جوانو نەرم دەیوت: ﴿إِذْ قَالَ لأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لا يَسْمَعُ وَلا يُبْصِرُ وَلا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا (42) يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا سَوِيًّا (43) يَا أَبَتِ لا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَنِ عَصِيًّا (44) يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ الرَّحْمَن فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا﴾ مريم ٤٢-٤٥.

واتە: باوکی بەڕێزم ئەوە تۆ بۆچی شتێك دەپەرستیت کە نەگوێبیستە نەکەس بەرچاو ڕوونو ڕۆشنبیری دەکات، نەهیچ سودێکت پێ دەگەیەنێت ئەی باوکی بەنرخم بەڕاستی ئەو زانستیو زانیاریەی کەبۆمن هاتووە دەربارەی دەسەڵاتو توانای بەدیهێنەری ئەم جیهانە بێگومان بۆتۆ نەهاتووە کەواتە پەیڕەوی من بکە ڕێنموویت دەکەم بۆ ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاستو دروست.

ئەی باوکی نازیزم شەیتان مەپەرستە، چونکە بەڕاستی شەیتان یاخییە لە خوای میهرەبانو سەرکەشی کردووە.

ئەی باوکی بەڕێزم بەڕاستی من دەترسم سزایەك لەلایەن خوای میهرەبانەوە یەخەت پێبگرێت نەوکاتە ئیتر دەبیتە یارو یاوەرو پشتگیری شەیتان، بەڵام باوکی ئیبراهیم ئەم ئامۆژگاریانەی قبوڵنەکرد، هەربەردەوام بوو لەسەر پەرستنی بتەکانی، هیچ گرنگی نەئەدا بەقسەکانی، بەڵکو ئیبراهیمی بەوە دەترسان کەبەرد بارانت دەکەم واز لەبانگەوازەکەت نەهێنی! داوای



لێـدەکرد وازی لێبهێنێـتو پشـت بکاتــە خواپەرسـتیەکەیو لەگـەڵ ئـەو بـت پەرستی بکات.

ئـەم قسـانەی بـاوکی هـیچ کاریگـەری نـەکردە ئیـبراهیمو ساردی نـەکردەوە لەچاکەکردن لەگەڵ باوکی.

هەرچەند باوکی بتپەرست بوو، ئەم هەرلەچاکەو ڕێزی باوکی بـەردەوام بـوو بەجوانی ڕەفتاری دەکرد دەیوت: [قال سلام عليك ساستغفر لك ربـي إنـه كـان بی حفياً] ئیبراهیم وتی: سلاّوت لێبـێ وامـن دەڕۆم لەمـەولا داوای لێخۆشـبوونو هیدایەتت لە پەروەردگار بـۆ دەخـوازم، چونکە ئەوزاتـە زۆر منـی خۆشـدەوێتو ڕێزی بۆ داناوم.

# ﴿چاكە لەگەڵ خوشكەكانی﴾

هاوەڵی بەڕێزو بەحورمەت (عەبدولای حەڕام) خوای لێ ڕازی بێت شەهیدكرا لەدوای خۆی نۆ خوشكی بچووكی جێهێلا، جابری كوڕی ویستی ژن بهێنێت تا خزمەتی خوشكەكانی بكاتو سەرپەرشتیان بكات، بۆ ئەو مەبەستە ئافرەتێكی بێوەژنی مارەكرد كەلەوەپێش شویەكی تری كردبوو، جابر چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی دایە كە ژنی هێناوە، ئەویش ئافرەتی بێوەژنە، پێغەمبەر (ﷺ) ویستی بزانێ بۆ فەزلی ئافرەتی بێوەژنی داوە بەسەر كچدا كەلەوپێش شوی نەكردبێ؟

بۆیە جابر هەواڵی دا بەپێغەمبەر (ﷺ) كەباوكی مردووە لەدوای خۆی كچی جێهێلاوە، بۆیە پێم خۆش بوو ئافرەتێ بخوازم تاسەرپەرشتیان بكات، وەگرنگی بدا بەكارەكانیان بۆیە من ئەوەم پێچاكتر بوو لەوەی كچێ گەنج بخوازم كەهاوتەمەنی خۆیانا بێت، باش نەزانێ ئاگای لەمندالّ بێ وەنەزانێ كارەكانیان بەڕێوەبەرێ، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر سەرسام بوو بەم كارەی جابر (ﷺ) وەچۆن چاكە لەگەڵ خوشكەكانی دەكات بۆیە فەرمووی: (بارك الله لك) خوا بەرەكەت بەسەرتا بڕێژێ.

## لەکۆتاییدا:

خوای گەورە فەرمان دەکا کەڕۆڵەکان چاك بن لەگەڵ دایكو باکیاندا لەبەر ئەوەی ئەوان زۆر مافو حەقی گەورەیان هەیە بەسەر ڕۆڵەکانیان.

بەڕاستی خوای گەورە گوێڕایەڵی کردنی دایكو باوکی بەستووە بەگوێڕایەڵی خواوە بەتەنها، ئەمە بەگەورە سەیر کردنی دایكو باوکە لەژیانی ڕۆلەکانیدا، چۆن خوای گەورە ئامۆژگاریمان دەکات کەنەرمو نیان بین لەگەڵیان، وەملکەچ بین بۆیان. بۆیە خوای گەورە لەڕێزو بەگوێکردنی خۆی بەستۆتەوە بەدایكو باوك تا خۆمان بپارێزین لەئازاردانیان، لەسەرتۆ پێویستە ئەی ئیماندار کەڕێزی دایكو باوکت بگری وەچاك ڕەفتار بیت لەگەڵیان تالەژیاندان وەکاتێکیش وەفاتیان کرد دوعای خێریان بۆ بکەیتو بێبەشیان نەکەیت لە خێر، چونکە بەڕاستی ڕازیبوونی دایكو باوك بەسراوە بەڕازی بوونی خوای گەورەو تەنها.

ئینجا چاکەکردن لەگەڵ خزمو کەسی نزیكو هاوڕێو دراوسێو گشت خەڵکی بەگشتی سیمای موسوڵمانە، مرۆڤی چاکەکار خوا پاداشتی زۆری بۆ ئامادەکردونو ئەو کەسانەی خۆشدەوێت (والله یحب المحسنین) کەواتە باچاکەکردن بکەینە سیماو ڕوخسارمانو پێغەمبەر (ﷺ) بکەینە نموونەو پێشەوامان لەم بوارەدا.

# چەند چیرۆکێك لەسەر هاوکاری

ئامادەکردنی
خالید عەبدولحەمید + محمد مەحمود القازی

وەرگێڕانی
ئومێد عومەر باوەمەردەیی

# ﴿هاوکاری ( التعاون )﴾

التعاون: هاریکاری کردن واته:یارمەتی دانی خەڵك لەسەر کاری چاك وخوا پەرستی و گوێڕایەڵی خواو دوورکەوتنەوە لەخراپەکاری،

*مرۆڤ بەگشتی دروست کراوێکی کۆمەڵایەتی یەو ژیانیان هەمیشە پێکەوە یەو پێویسیان بەهاوکاری یەکتر دەبێت بۆ دابین کردنی ژیانێکی شایستە ،بەهەمان شێوەی هاوکاری کردنی ئەندامەکانی لاشە بۆ ئەنجامدانی کارێك.

*ئەوەی پەیامی ئیسلام داوای دەکات هاوکاری هەبێت ،مەبەست یارمەتی دانی یەکترە ،بۆئەنجامدانی کارێك ڕەزامەندی خواو بەرژەوەندی خەڵکی تیا بێت. ﴿وتعاونوا على البر والتقوى﴾ بۆیە هەر جۆرە هاوکارییەك ئەو دوومەبەستەی تیا نەبێت خراپە ونەهی لێکراوە ﴿ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ﴾(المائده ۲).

*هاوکاری گەلان و میللەتان بۆ دژایەتی خراپەکاران هەروەك(ژی القرنین)یارمەتی وڵاتی (صین)دەدات بۆ دروست کردنی بەربەستێك تا لە خراپەکارانی گەلی (یأجوج و مأجوج)ڕزگار بن ﴿قَالُواْ يَـٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ هَـٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴿٩٨﴾ ﴾(الكهف ٩٤ ،٩٨).

*پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(إن للمساجد أوتاداً هُم اوتادُها لَهم جُلساءُ مِنَ الملائكةِ فإن غابوا سألوا عنهُم وَان كانوا مَرضى عادوهم ،وان كانوا في حاجة أعانوهُم)احمد واسنادهُ حسن.

**واتە:کەسانێك لەناو مزگەوتدا وەك پایەو کۆڵەکەی مزگەوت وان و پابەندن بە مزگەوتەوە ،فریشتەکان لەکۆڕیاندا دادەنیشن ،ئەگەر دیار نەبوون هەواڵیان دەپرسن ،ئەگەر نەخۆش بوون سەردانیان دەکەن ئەگەر کارێکیان هەبوو هاوکارییان دەکەن.**

(وَاللهُ في عون العبد ماكانَ العبد في عون أخيهِ)مسلم.

**خوا لە یارمەتی و هاوکاری بەندەکانیدایە مادام ئەوانیش لە هاوکاری براکانیاندا بن.**

(أُنصر أخاكَ ظالماً أو مظلوماً –قالَ :يارسولَ الله،هذا ننصرُهُ مظلوماً ، فكَيفَ ننصُرُهُ ظالماً؟قالَ:تأخذُ فوقَ يَديه)البخاري.

**واتە:براکەت سەربخەو هاوکاری بکە ، ستەمکار یان ستەملێکراو بوو!وتیان: ئەگەر ستەملێکراوبووهاوکاری دەکەین،ئەی ئەگەرستەمکار بێت چۆن هاوکاری دەکرێت؟فەرمووی:دەستی بگرە مەهێڵە ستەم بکات ئەوە هاوکاری کردنە!!**

*پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(وَلأن أمشي معَ أخٍ في حاجة أحبُ إليَ من أن أعتكف في هذا المسجد شهراً)(أي في مسجد المَدينة)الطبراني.

**واتە:بڕۆم بۆ هاوکاری برایەك لام خۆشترە لەوەی مانگێك لەمزگەوتی مەدینە خواپەرستی بکەم.**

*(مثل المؤمن في توادهم وتراحمهُم وَتعاطفهُم مثل الجسد إذا إشتكى فيه عضوٌ تداعى ،لَهُ سائرُ الجسد بالسهر والحمى)البخاري ومسلم.

***عطاء کوڕی رباح دەڵێت: لە سێ کاتدا براکانتان بەسەر بکەنەوە، ئەگەر نەخۆش بوون سەردانیان بکەن ئەگەر سەرقاڵ بوون هاوکاریان بکەن، ئەگەر بیریان چووبۆوە ،بیریان بخەنەوە.)احیاء.**

# ﴿کۆکردنەوەی کۆمەڵێ دار﴾

پیاوێکی پیر هەستی کرد بەنزیك بوونەوەی لەمردن، هەرسێ منداڵەکەی کۆکردەوە بۆ ئەوەی ئامۆژگارییان بکاتو سوود لەو ئامۆژگاریە وەربگرن لەژیانیاندا، کۆمەڵێ داریدایە دەستیان وەداوای لێکردن هەریەکەیان بەتەنیا بیشکێنێ، هەریەکەیان هەوڵی شکاندنی دا بەڵام نەیان توانی دارەکان بشکێنن، باوکیان دارەکانی لێوەرگرتنو وەلەیەکی کردەوە وەبۆ هەریەکەیان دارێکی پێدان بە ئاسانی وەشکاندیان باوکەکە پێی وتن:

کوڕەکانم ئێوە وەکو ئەم کۆمەڵە دارە وان ئەگەر یەکگرتوو بن وەیەك دەست بن، هەرکەسێك چەند بەهێزبێ ناتوانێ بەسەرتانا زاڵ بێت، ئەگەر لەیەك جیابوونەوە ئەوا بێهێز دەبن وەدوژمن بەئاسانی بەسەرتانا زاڵدەبێت، کەواتە کوڕەکانم هاوکاری یەکتر بن لەکارەکانتاندا بەهێز دەبن.

# ﴿کۆکردنەوەی دار﴾

کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ کۆمەڵێك لەهاوەڵاندا چوون بۆ گەشت، ویستیان مەڕێك سەرببڕن هەتا بیخۆن، ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کەیارمەتی یەکتر بدەن لەسەر ئامادەکردنی ئەو مەڕە وەهەریەکێکیان دەورێکی هەبێ لەئامادەکردنی، یەکێکیان وتی: سەری دەبڕم، یەکێکیان وتی: من کەوڵی دەکەم، یەکێکیان وتی: دەیکوڵێنم، پێغەمبەری خوا پێی خۆش بوو کە هاوکاریان بکات لەم کارەدا، فەرمووی: لەسەر من بێت کۆکردنەوەی دار!!

هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە دەتوانین ئەمە بکەین.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دەزانم کەئێوە لەجیاتی من کاردەکەن، بەڵام پێم خۆشە خۆم جیانەکەمەوە لەئێوە خوای گەورە ئەو کەسەی خۆش ناوێ کەخۆی جیابکاتەوە لەهاوەڵانی.

## «پشتیوانێك بۆ موسا (سەلامی خوای لێ بێت)»

خوای پاكو بێگەرد موسای كردە پێغەمبەرو فەرمانی پێكرد كەبچێت بۆلای فیرعەون بانگی بكات بۆ خواپەرستی، موسا (سەلامی خوای لێبێت) هەستی كرد بەڕاستی خوای گەورە كارێكی گەورەی پێ سپاردووە، دەستی بەرز كردەوە بۆ ئاسمان وتی: ئەی پەروەردگار سنگم فراوان بكەو كارەكانم بۆ ئاسان بكەو زمان بكەرەوە ڕەوان بێژم بكە وەكەسێكی نزیك بكە بەیارمەتی دەرم، هارونی برام هەتا پشتی پێببەستم وەلەكارەكانم دا یارمەتی دەرم بێ‌و هەتا ستایشی تۆ بكەین یادی تۆ زۆر بكەین بەڕاستی تۆش بینای بەنێمە [قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي (25) وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي (26) وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي (27) يَفْقَهُوا قَوْلِي (28) وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي (29) هَارُونَ أَخِي (30) اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي (31) وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي (32) كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا (33) وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا (34) إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا] (طه ٢٥-٣٥).

بەم شێوەیە موسا (سەلامی خوای لێبێت) داوایكرد لەخوای گەورەكە هارونی برای بكات بەپێغەمبەر خوای گەورە هاروونی برای كرد بە پێغەمبەرو هەریەكەیان بۆ ئەوی تریان یارمەتی دەربوو بۆ ملكەچی خوای گەورە وەهەردووكیان یارمەتی دەری یەكتر بوو لەبانگ كردنی فیرعەون‌و گەلەكەی بۆ خوا پەرستی.

# «پارمەتیدان هۆکاری ئازادییە»

سەلمانی فارسی (رضي الله عنه) کۆیلەیەکی خاوەندار بوو، گەورەکەی داوای لێکرد کە (٣٠٠) دارخورمای بۆ لێبداتو (٤٠) ئوقیە ئاڵتوونی بداتێ ئازادی بکات، سەلمان چووە لای پێغەمبەر (ﷺ) پێی وت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بەهاوەڵان (یارمەتی براکەتان بدەن) هاوەڵەکان کۆبوونەوە (٣٠٠) چڵە دارخورمایان پێداو وتیان برۆ چاڵیان بۆهەڵکەنەو لێیان بدە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەرکاتێ تەواو بوو بانگی من بکەن تا بۆت بنێژم، هاوەڵان یارمەتیان دا لەچاڵ هەڵکەندندا، کاتێ تەواو بوو چونە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش لەگەڵیاندا ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنە کەدارخورماکانیان لێدەدا، پێغەمبەر (ﷺ) بەدەستی پیرۆزی دارێکی ناشت سەلمان دەفەرموێ: سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە تەنها یەك داری لێوشك نەبوو، پێغەمبەری خوا پارچەیەك ئاڵتوونی پێدام کاتێ کە کێشام (٤٠) ئوقیە دەرچوو، بردم بۆلای گەورەکەمو ئازادی کردم.

# ﴿هەڵکەندنی چاڵ﴾

کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێگەیشت کە سوپایەکی گەورەی قورەیش و هاوپەیمانەکانیان بەرەو مەدینە بەرێکەوتون هاوەڵانی کۆکردەوەو ڕاوێژی پێکردن لەوبارەوە، سەلمانی فارسی (ﷺ) وتی: باچاڵێکی گەورە بەدەوری شاردا هەڵبکەنین بۆ خۆپاراستنمان لەو سوپایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ چوونەکەی بەگونجاو زانی، بۆیە ڕازی بوو، وفەرمانی بەهاوەڵان کرد دەست بەکاربن. موسوڵمانان پێکەوە هاوکارییان کردو گوێیان بەبرسێتی نەدەداو ماندوو بونیان نەدەزانی، پێغەمبەریش (ﷺ) هاوکاری کردن، بەشانی پیرۆزی گڵی دەگواستەوە، لەکاتی کارکردندا موسوڵمانان دەیانوت:

والله لولا الله ما اهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا
فأنزلن سكينة علينا وثبت الاقدام إن لاقينا
إن الاولى قد بغوا علينا إذا ارادوا فتنة ابينا

واتە سوێند بەخوا گەر خوا نەبوایە ڕێگەی ڕاستمان نەدەزانی وە نوێژمان نەدەکردو بەخشندە نەدەبووین خوایە ئارامی بنێرە سەر دڵمان، لەکاتی ڕووبەڕوو بونەوەدا دامەزراومان بکە، دوژمنەکانمان هاتونەتە سەرمان ئەوان شەڕو ئاشوبیان دەوێت. موسوڵمانان لەهەڵکەندنی چاڵەکە سەرکەوتوو بوون و بەچەند ڕۆژێکی کەم کارەکەیان تەواو کرد ئەمەش سەرەنجامی هاوکاری نێوانیان بوو خوای گەورەش شاری مەدینەی لەسوپای موشریکەکان پاراستن.

# ﴿هاوکاری مێرد﴾

زوبێر کوڕی عەوام (ﷺ) لەگەڵ ئەسمائی کچی ئەبوبەکر ژیانی هاوسەری پێکهێنا، زوبیر نەپارەی هەبوو نەبەندە، تەنها ئەسپێکی هەبوو، ئەسماء (ﷺ) باشترین هاوکار بوو بۆ هاوسەرەکەی بۆ هەڵگرتنی نارەحەتیەکانی ژیان، هەڵدەستا بەخزمەتکردنیو وەچاودێری ئەسپەکەشی دەکردو وەکاروباری ماڵەکەشی بەجوانترین شێوە بەڕێوە دەبرد، بەم شێوە ئەسماء نموونەی ئافرەتێکی ئارامگرو هاوکار بوو لەبەرامبەر هاوسەرەکەیدا، هەتا وایلێهات هەزار خزمەتکاری خۆیان هەبوو وەخوای گەورە ڕۆزی پاکی پێدانو دەرووی خێری لێکردنەوە.

# ﴿هاوکاری فریشتەکان﴾

لەغەزای بەدری گەورەدا سوپای موسوڵمانانو سوپای بێباوەڕان ڕووبەڕوی یەکتر بوونەوە، لەم غەزایەدا خوای گەورە فریشتەکانی ڕاسپارد کەبچن هاوکاری سوپای موسوڵمانان بکەن، لەکاتی ڕوبەڕوو بوونەوەکەدا پیاوێکی موسوڵمان لەدوای یەکێك لە بێباوەڕانەوە دەڕۆیشت کەدەیویست بیکوژێت، لەپڕ گوێی لەدەنگی قامچیەك بوو، گوێی لێبوو کەدەنگێك دەیوت: بۆ پێشەوە ئەی (حەیزوم) کەناوی ئەسپی فریشتەکە بوو.

پاشان کابرای بێباوەڕ کەوت بەزەویدا، شوێنی قامچیەکە بەسەرلوتیەوە دیاربوو.

کابرای ئەنصاری چووە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەواڵی پێگەیاند پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ڕاست دەکەیت ئەوە هاوکاری خوابوو کەلە ئاسمانی سێهەمەوە پێمان گەیشت.

# ﴿دروستکردنی مزگەوت﴾

گاتێك پێغەمبەر (ﷺ) چووە نـاو مەدینـەوە، خـەڵك لـەدەوری كۆمـەڵ بـوو، هەركەسێك دەیویست خۆی ڕەشمەی حوشترەكەی بگرێ بۆ دابەزین لـەماڵی ئـەو، دواتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: وازی لێبێنن ئەو فەرمان پێكراوە!

حوشـترەكە ڕۆیشـت لەمەدینـەدا هـەتا گەیشـتە ئـەو شـوێنەی مـوڵكی بـێ باوكێكی (بـەنی نجـار) بـوو حوشـترەكە لەوێـدا سمیـدا، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمووی: خاوەنی ئەم زەوییە كێیە؟

معاذی كوڕی عەفراء وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هی سوهەیلو سـەهل كـوڕی عەمرە دووبرای بێ باوكن، داینێ بۆ من ڕازییان دەكـەم، بـەڵام پێغەمبـەر (ﷺ) پـارەی زەوییەكـەی دانـاو فەرمانیـدا بەدروسـتكردنی مزگـەوتێك لـەو شـوێنە، موسوڵمانەكان كۆبوونەوە بۆهاوكاری لەم كارە گەورەیەدا وە پێغەمبەر (ﷺ) لـە دروسـتكردنیدا بەشـداربوو، موسـوڵمانەكان گۆرانیـان دەوتو دەیـان وت: ئەگـەر ئێمە دانیشینو پێغەمبەر كاربكات ئەمە كارێكی سەر لێشێواویە.

بـەم شـێوەیە موسـوڵمانەكان هاوكاریـان كـرد بـۆ دروسـتكردنی مزگەوتەكـەی پێغەمبەر (ﷺ).



# «هاوکاری لەسەر چاکە»

معاذی کوڕی عەمر کوڕی جموح یەکێك بوو لەموسوڵمانە پێشینەکان باوکی بێبڕوا بوو بیری کردەوە لەکارێك چوون قەناعەت بکات بەباوکی تابێتە ناو ئیسلامەوە، ئاگاداری هاوڕێیەکی کردەوە بەناوی معاذی کوڕی جبل بۆ یارمەتیدانی.

هەستان بەهەڵگرتنی بتێ کەعەمر دەیپەرست بۆ ئەوەی فڕێی بدەنە چاڵێك کەهەرچی پیسی هەبوو تیابوو، کاتێك لەبەیانیدا عەمر گەڕا بەشوێن بتەکەیدا تا بیدۆزێتەوە، بینی وا لەناو پیساییدایە، هەڵیگرتەوەو خاوێنی کردەوە، بردییەوە شوێنەکەی خۆی.

چەند جارێك ئەم کارەیان دووبارە کردەوە، عەمر لەشەوێکدا شمشێرێکی هەڵواسی بەملی بتەکەدا، تا پارێزگاری لەخۆی بکات، پاشان معاذو هاوڕێکەی لەشەودا هاتن، بتەکەیان خستە ناو پیسایەکەوە دوای ئەوە سەگە تۆپیوێکیان خستەسەری، بۆ ڕۆژی دوایی عەمر نەیدۆزییەوە دوای گەڕان سەیریکرد لەبێرکدایە لەگەڵ سەگەتۆپیوەکەو شمشێرەکەش هەرلەملیدایە، ڕویکردە بتەکەو وتی: شمشێرم لادانا بوویت تاپارێزگاری لەخۆت بکەیت، بەلام نەتکرد کەواتە چۆن پارێزگاری لەمن دەکەیت؟! ئابەم شێوەیە عەمر قەناعەتی کرد کەبتەکە سودو زیانی نیەو شیاوی پەرستن نییە، بۆیە موسوڵمان بوو، هاوکاری ئەم دوو هاوڕێیە هۆکاری موسوڵمان بوونی کەسێك بوو.

## «هاوکاری و هاوسەرگیری»

ڕەبیعەی ئەسلەمی (ﷺ) ئافرەتێکی ئەنصاری خواست نەیتوانی مارەی بداتێ، ڕەبیعە ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و هەواڵی پێدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیکرد بەهاوەڵە بەڕێزەکانی کەهاوکاری کۆبکەنەوە، هاوەڵە بەڕێزەکان بۆیان کۆکردەوە، ڕەبیعە هەڵی گرتو پێشکەشی هاوسەری کرد.

پاشان ڕەبیعە گەڕایەوە بۆ جاری دووەم بۆلای پێغەمبەرو هەواڵی پێدا کەناتوانێو هیچی نیە بۆ شاییەکەی، یەکێ لەهاوەڵە بەرێزەکانی بەرانێکی دایە، پێغەمبەریش فەرمووی: بڕۆ بۆلای خاتوو عائیشە هەندێ (جۆ)ی لێوەربگرەو بیکەن بەنان بۆ شاییەکە.

ئابەم شێوەیە موسوڵمانەکان هاوکاری براکەیان کرد بۆ تەواوکردنی ژنهێنان، براکەیان دڵخۆشو شادومان کرد.

## «هاوکاری و گوێڕایەڵی»

ئەبو هورەیرە (ﷺ) هاوکاری ژنەکەیو خزمەتکارەکەی دەکرد لەسەر خواپەرستی، شەوی کردبوو بەسێ بەشەوە نوێژو خواپەرستی دەکرد هەتا سێیەکی شەو تەواو دەبوو، پاشان ژنەکەی هەڵدەستان بۆ نوێژو خواپەرستی لەسێیەکی دووەمدا، دوای ئەویش دەڕۆی بۆلای خزمەتکارەکەی هەڵی دەسان بۆنوێژ لەسێیەکی کۆتایی شەودا.

ئائەمە فەرمانو کاری چاکەکارانە، زەیدی کوڕی حارث (ﷺ) شەوی دابەش دەکرد لەخواپەرستیدا لەنێوان خۆییو کوڕەکانیدا ئەگەر بیبینایە سستی لەیەکێکیاندا هەیە خۆی لەجیاتی هەڵدەساو کاتەکەی ئەویشی زیندو دەکردەوە

ئەمەیە خێزانی چاکو پاک کەیارمەتی یەکتر دەدەن لەنێوان خۆیاندا لەسەر خواپەرستیو ملکەچی.

## «بێ فەرمانی»

رۆژێ کاربەدەستی یەمەن یەعلای کوڕی ئومەییەی (ﷺ) نارد بۆلای پێشەوای ئیمانداران عومەر کوڕی خطاب (ﷺ) دەربارەی کۆمەڵێك خەڵك کەبەشداربون لەکوشتنی منداڵێکدا.

عومەر (ﷺ) فەرمانی کرد بەکوشتنی هەموویان، وەفەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر خەڵکی (صنعاء) بەشداربوونایە لەکوشتنی هەموویانم دەکوشت.

ئەو کەسەی هاوکاری یەکێ بکات لەبێ فەرمانیو خراپە وەکو ئەوە وایە خۆی کردبێتی، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەرکەس هاوکار بێت لەکوشتنی موسوڵمانێکدا بەنیوە وشەیەکیش کاتێك بەخوای گەورە دەگات لەنێوچاوی نوسراوە. (بێبەش لەڕەحمەتی خوا).

بۆیە خوای پاكو بێگەرد داوامان لێدەکات کەهاوکاری خراپە نەکەین وەکو دەفەرموێ: (وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ) المائدة ٢.

# «بەنداوی گەورە»

یەئجوج گەلێکی خراپەکار بوون لەسەر زەویدا لەسەر دەمی خۆیاندا پاشا یەك هەبوو، ناوی (ذوالقرنین) بوو خوای گەورە دەسەلاتێکی گەورەی پێدابوو هێزو دەسەلاتی زۆر بوو.

ڕۆژێ (ذو القرنین) بەسوپاکەیەوە رۆشت بۆ ئەو شوێنەی ئەم نەتەوە خراپەکارەی لێدەژیان.

لەم شوێنەدا نەتەوەیەکی بێهێزیش دەژیان، کاتی (ذو القرنین) یان بینی داوای یارمەتیان لێکرد بۆ ئەوەی لە یەئجوجو مەئجوج بیان پارێزێ بۆئەم مەبەستەش داوای دروستکردنی بەنداوێکیان لێکرد.

(ذو القرنین) ڕازی بوو بەدروستکردنی بەنداوەکە، داوای لێکردن کەهاوکاری یەکتر بکەن، بۆ ئەوە ئەم کارە بەدەست بهێنێ و بەنداوەکەیان بۆ دروست بکات.

فەرمووی: پارچە ئاسنم بۆ بهێنن هەتا ئەمبەرو ئەوبەری هەردوو کێوەکەی پڕکرد ئەوجا فەرمانیدا ئاگر لەژێریدا بکەنەوە تابتوێتەوە، پاشان (ذو القرنین) وتی: ئادەی مسی تواوەم بۆ بهێنن تا بیکەم بەسەریدا بەوشێوە بەربەستەکەی دروستکردو یەئجوجو مەئجوج نەتوانییان سەربکەون، نە توانییان کوناو دەری بکەن.



## «یارمەتی باوك و دایك»

خوای گەورە فەرمانی کرد بەپێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) کەهەستێ بەدروستکردنی (ماڵی بەیت) بۆ حەج کردن و سەردانی خەڵك لەهەموو شوێنەکەوە.

حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) ئیسماعیلی کوڕی (سەلامی خوای لێبێت) ئاگادار کردەوە بۆ ئەو کارە، ئەویش دڵسۆزانە یارمەتی باوکیدا ڕۆیشتن بۆ ئەوجێگا تایبەتیە بۆ دروستکردنی ماڵی بەیت و بەردیان کۆکردەوە، باوکی وەستای دروستکردنی بوو، کوڕەکەشی بەردەستی دەکرد تابەرز بووەوە، ئینجا حەزرەتی ئیبراهیم و کوڕەکەی داوایان لەخواکرد هاوکارییان بکات و کاریان قبوڵ بکات دەیانووت: (خوایە لێمان قبوڵ بکەی هەرتۆی بیسەرو زانا) البقرة ١٢٧.

خوای گەورە لێی قبولکردنو بەدوعاکەی ئەوان وایلێهات ئەم شوێنە پیرۆزە خەڵك لەهەموو لایەکەوە بۆ خواپەرستی و سوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا سەردانی ئەم شوێنەیان دەکرد، هاوکاری باوك و کوڕ بووە سونبولی خواپەرستی.

## «هاوسەرەکەت»

عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ) فاتمەی کچی پێغەمبەری خواست، لەماڵەکەیاندا خزمەتکارو یارمەتی دەر نەبوو، دایکی پێشەوا عەلی (فاتمە کچی ئوسامە) لەگەڵیان دەژیا لەبەر ئەوەی پێشەوا عەلی هەژار بوو توانای کرێی خزمەتکاری نەبوو، هەموو خێزانەکە هاوکاری یەکتر بوون لەکاری ماڵەوەدا.

پێشەوا عەلی (ﷺ) کارەکانی لەنێوان ژنەکەی و دایکی دابەش کردبوو، بەدایکی وت: تۆکاری دەرەوە ئەنجام بدە، فاتمەی هاوسەریشم کاری ناوماڵ بکات، فاتیمە باشترین یارمەتیدەری مێردەکەی بوو بۆ بەڕێکردنی ژیانی، هەویری دەشێلا، نانی دەکردو ماڵی پاك دەکردەوە پێشەوا عەلیش لەدەرەوە کاری دەکردو کۆششی دەکرد.

## لەکۆتاییدا:

هاوکاریو هاریکاری ڕەوشتێکی نایابو مەزنە، خۆشەویستی لەنێوان مرۆڤەکاندا بەرجەستە دەکات، گەلو وڵات بەرەو پێشکەوتن دەبات بەڵام هاوکاری دەبێت لەسەر خێرو چاکەو خواپەرستی بێت (وتعاونوا على البر والتقوى) وەنابێت لەسەر خراپە هاوکاری کەس بکرێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەزۆر کاتو شوێندا هاوکاری هاوەڵەکانی کردووە، ئەوانیش لەنێوخۆیاندا هەمیشە هاوکاربوون وەك دیوارێکی پۆڵاین پارێزگارییان لەیەکتر کردووە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (المسلمون يد واحدة).



# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی خاکی بوون (بێ فیزی)

**ئامادەکردنی**

عبدالعزیز سید هاشم

**وەرگێڕانی**

**ناصِح محمد شریف موبڕە یی**

# ﴿خاکی بوون( بیٚ فیزی )﴾

خاکی بوون: واتە خۆ بەکەم زانین وبیٚفیزی بەرامبەر خوای گەورە کەدەتەویٚت لەبەردەم گەورەیی دا بچوکی خۆت دەربخەیت،وەخاکی بوون لەگەڵ خەڵکدا.یان واتە:مل کەچ بوون لەبەرامبەر حەق و ڕاستی دا ورەخنە نەگرتن لەبڕیارەکانی شەرع، (تواضع) جیایە لەگەڵ (زەلیلی)،چونکە خۆبەکەم زانین لە ناسینی خواو سیفاتەکانی وگەورەیی وخۆشەویستی خواو ،ناسینی خود دروست دەبیٚت.بەڵام زەلیلی:سوکی ومل کەچ بوونە بۆ اخوازی یە دەرونی و شەیتانیەکان.خوای گەورە بەپیٚغەمبەرﷺدەفەرموویٚت: (وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ )(الحجر ٨٨).

واتە:بەسۆزو میهرەبانبە لەگەڵ باوەڕداران. وە فەرمان بەموسڵمان دەکات کەبەسۆزو میهرەبان و بیٚفیز بن بەرامبەر دایك وباوك. هەروەها خوای گەورە فەرمانی کردووە بە خۆکەم زانی وبیٚفیزی بەسەر زەویدا برۆین :﴿وَلَا تَمۡشِ فِى ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ﴿٣٧﴾ ﴾(الاسراء ٣٧).

پیٚغەمبەر ﷺدەفەرموویٚت: (إنَ اللهَ أوحى اليَ أن تَواضعوا حَتى لايَفخَر أحدٌ على أحَدٍ وَلا يَبغي أحَدٌ على أحد)(مسلم).

هەروەها دەفەرموویٚت:(مانقصت صدقَةٌ من مالٍ وَمازاد اللهُ عبداً بِعفوٍ إلا عِزاً وَما تواضع أحدٌ للهِ إلا رفَعَهُ الله)(مسلم).

پیاویٚك هات بۆ خزمەت پیٚغەمبەر ﷺ ووتی:(یاخیرَ البرية)پیٚغەمبەر ﷺفەرمووی:ئەوە ئیبراهیمە ؛ پیٚشەوا ابوبکر؛ دەفەرمویٚت:(وَجَدنا الكرم في التَقوى ،وَالغنى في اليَقين ،وَالشرف في التواضع)احياء علوم الدين.

عائیشە ؛دەفەرمویٚت:بیٚئاگان لە باشترین عیبادەتتان کە (مل کەچی وخاکی بوون و بیٚ فیزی یە).

حەسەنی بەصری دەفەرمویٚت: (التواضع :بریتی یە لەوەی کەلەماڵ دەردەچیت بەهەر موسڵمانیٚك گەشتی، وابزانیت لە تۆ باشترە)احياء علوم الدين.

# «ئەمیرەکە کۆڵ هەڵدەگرێت»

سەلمانی فارسی (ﷺ) بووە کاربەدەستی مەدائین، ڕۆژێك پیاوێك لەوڵاتی شامەوە هات بۆ ئەوشارەو بارێك (کا)ی پێ بوو، گەڕا بۆ کەسێك کە یارمەتی بدات لەهەڵگرتنی ئەو بارەدا، جگە لە سەلمانی فارسی کەسی نەبینی، واگومانی برد کە ئەو پیاوە حەماڵەو بۆ کاردەگەڕێت، بانگیکردو پێی وت: ئەم بارە هەڵگرە!

سەلمان کۆمەڵە کاکەی بۆ هەڵگرت و بەرەو ئەو ماڵەی پیاوەکە دەیویست ڕۆشت، لەڕێگەدا خەڵك بینیان واسەلمان ئەو بارەی بۆ ئەو پیاوە هەڵگرتووە، وتیان: ئەوەچیت کردووە ئەوە ئەمیرو کاربەدەستی شارەکەیە؟! پیاوەکە بەداوای لێبوردنەوە بەسەلمانی وت: بەڕاستی تۆم نەناسی بۆیە داوای لێبوردن دەکەم ئیتر ویستی خۆی بارە کاکە هەڵبگرێت.

سەلمان (ﷺ) وتی: نەخێر... هەتا نەیگەیەنمە شوێنی خۆی دایناینێم!

# «خەلیفە و ڕانەمەڕەکە»

پێشەوا (ئەبوبەکری صدیق) (ﷺ) لە گەڕەکێکی ئەنصار دەژیا، زۆر هاوکاری دەکردن و مەڕو ماڵات و مانگاکانی بۆ دەدۆشین، ئەمەش نیشانەی خاکی بوون و ڕەوشت بەرزی ئەو هاوەڵە بوو (ﷺ).

جاکاتێك ئەبوبەکر (ﷺ) پلەی جێنشینی وەرگرت گوێی لەدەنگی ئافرەتێکی گەڕەکەکە بوو دەیوت: ئیتر ئەبوبەکر مەڕەکانمان نادۆشێ!!

ئەویش پێی فەرموو: هەربەردەوام دەبم و مەڕەکان دەدۆشم، ئومێدەوارم بونم بەخەلیفە ئەو ڕەوشتانەم نەگۆڕێ.

# «پاشای حەبەشە»

رۆژێك نەجاشی (پاشای حەبەشە) لەسەر کورسی پاشایی دانیشتبوو لەپڕ هەڵساو کورسیەکەی بەجێهێشتو لەسەر زەویەکە دانیشت! وەزیرو هاوکارانی دەوری لەم کارەی نەجاشی سەرسام بوونو پرسیاریان لێکرد: بۆچی وایکرد؟ پێی وتن: بەڕاستی لەو پەیامەی کەخوای گەورە ناردوویەتی بۆ (عیسا) (سەلامی خوای لێبێت) بینیومە کە دەفەرموێت: (إذا أنعمت على عبدي نعمة فتواضع اليَّ أتممتها عليه).

واتە: هەرکات نیعمەتو بەخششێکم دا بەبەندەیەکم، ئەویش لە بەرامبەرمدا بێ فیزو خۆبەکەم زانو خاکی بوو، بەخششەکەی بۆ تەواو دەکەم.

جامنیش ئەمشەو خوای گەورە منداڵێکی پێ بەخشین بۆیە لەبەرامبەر خوادا ملکەچیم نواندو خۆم بەکەمزانی بۆ دەربڕینی سوپاسگوزاری بۆ خوای گەورەو میهرەبان.

# «حەقیقەتی مرۆڤی خۆبەزلزان»

رۆژێك "موهەللەب کوڕی ئەبی صوفرە" والی بەصرە جبەیەکی تازەی ئاوریشمی لەبەرکردو زۆر بەفیزو لەخۆ ڕازی بوونەوە ڕۆشتە دەرەوەو کەوتە ڕێ "موطیرف کوڕی عەبدولا"ی زاناو تابیعیو خواناسو زاهید لەڕێگە تووشی والی بوو، پێی وت: ئەی بەندەی خوا ئەم ڕۆشتنە خواو پێغەمبەرەکەی ڕقیان لێیەتی.!!

موهەللەب وتی: دەڵێی نامناسی؟!

وەڵامی دایەوەو پێی وت: چاکت دەناسم!

سەرەتاکەت ئاوێکی پیسە! کۆتاییەکەشت لاشەیەکی بۆگەنە! لەنێوان ئەم دوو قۆناغەشدا تۆ هەمیشە لەڕیخۆڵەکانتدا هەڵگری بەرماوەی خۆراکیت کەدوای مژینی مادده چاکەکانی، تەنها خراپو پیسەکەی دەمێنێ! ئیتر موهەللەب کە گوێی لەم قسانە بوو شێوازی ڕۆشتنەکەی گۆڕیو لەوساتەوە گەڕایەوە بۆ ژیریو وازی لەخۆ بەگەورەزانینو فیزکردن هێنا.

# «تۆ برامی»

پێشـەوا (عومــەر) (ﷺ) (حوزەیفــەی كـوڕی یـەمان)ی كـردە گــەورەو كاربەدەسـتی شـاری (مـەدائین) پـەیامێكی لەگەڵـدا نـارد بـۆ دانیشـتوانەكەیو فەرمانی پێكردن كە گوێڕایەڵی حوزەیفە بكەنو ئەوەی داوایـان لـێ دەكات بـۆی جێبەجێ بكەن.

حوزەیفـە (ﷺ) بـەرەو مـەدائین ڕۆشـت، لەوكاتـەدا بەسـواری گوێدرێـژێك ڕۆشـتو خـۆراكو پێداویسـتی لەسـەر بـوو، كـاتێ گەیشـتە مـەدائین خەڵكەكـە بەگـەرمی پێشوازییان لێكـردو ئـەویش پەیامەكـەی پێشـەوا عومـەری (ﷺ) بـۆ خوێندنەوە، وتیان: لە خزمەتداین، داوای چیمان لێ دەكەیت؟

وتـی: داوای خواردنێـك كـەبیخۆم، وە ئالیـك بـۆ وڵاخەكـەم، تـا ئەوكاتــەی لەناوتاندا دەبم!!

ڕۆژێـك پێشــەوا عومــەر (ﷺ) ویسـتی حوزەیفـە بـانگ بكـات تـابزانێ كاربەدەسـتی هـیچ هەڵسوكـەوتی گۆڕیـووە، كەسـێكی نـاردو داوای لێكـرد كـە بەحوزەیفە ڕابگەیەنێت گەورەی موسوڵمانان دەیەوێت بتبینێت.

كاتێ حوزەیفە لەشاری مەدینە نزیك بۆوە، پێشـەوا عومـەر (ﷺ) لەڕێگەدا خـۆی داگـرت، تـا بزانـێ حوزەیفـە چـۆن دەبینـێ، كـاتێ نزیـك بـۆوە بینـی وا حوزەیفە بەسەر هەمان گوێدرێژەوەیە كە پێی چوو بۆ مەدائین، بەپەلە ڕۆشت بۆلایو باوەشی بەحوزەیفـەدا كـردو پێشوازیەكی گـەرمی لێكـردو پێـی وت: تـۆ برای منیو منیش برای تۆم.

## ﴿هاوتا لە خۆبەكەم زانیندا﴾

دەگێڕنەوە كە زەیدی كوڕی ثابت (ﷺ) نوێژی لەسەر جەنازەیەك كرد، پاشان ویستی سواری وڵاخەكەی بێت، عەبدوڵا كوڕی عەباس (ﷺ) هاتو زینی وڵاخەكەی بۆ گرت، تا قاچی لەسەر دابنێتو سەركەوێت بۆسەر وڵاخەكە.

زەید زۆر داوایلێكرد كە زینی وڵاخەكەی بەربدات، پێی وت: ئەی كوڕی مامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وازبهێنەو زینەكە بەردە، شەرم دەكەم قاچ لەسەر زینێك دابنێم كەبەدەستی تۆوە بێت، بەڵام ئیبن عەباس وازی نەهێناو وتی: ئێمە فەرمانمان پێكراوە كەئاوا بەڕێزبین لەگەڵ زانایانو گەورەكانماندا، ئینجا زەیدیش (ﷺ) دەستی ئیبنِ عەباسی گرتو ماچی كرد وتی: ئێمەش فەرمانمان پێكراوە ئاوابین لەگەڵ ئالو بەیتی پێغەمبەرەكەمان (ﷺ).

## ﴿سزای مرۆڤی خۆ بەگەورەزان﴾

ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) خواردنێكی هێنا بۆ پیاوێك كابرا بەدەستی چەپی دەستی كرد بەخواردن، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: بەدەستی ڕاستت بخۆ، كابرا دەیتوانی بەدەستی ڕاستی بخوات، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێكرد، بەڵام هێندە بەفیزو خۆ بەگەورە زان بوو، فەرمانەكەی پێغەمبەری شكاندو بەدەستی ڕاستی نەیخوارد وتی: ناتوانم.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر نەتوانی، (چونكە لەبەر فیز وای وت).

خوای گەورە دوعاكەی پێغەمبەری وەرگرتو دەستی كابرا لەكار كەوتو ئیتر نەیتوانی بەرزی بكاتەوە بۆ دەمی، ئەویش سەرەنجامی فیزو خۆبەزل زانینو نكۆڵی كردنو بێ فەرمانی پێغەمبەر بوو (ﷺ).

# «وانەیەك لەخۆ بەكەم زانی»

رۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) رۆشتن بۆ بازاڕ، پارچەیەك قوماشی بەچوار درهەم كڕی، كاتێك خاوەنی قوماشەكە هات بۆ ئەوەی قوماشەكە بپێوێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بیپێوە بەزیادەوە، كابرا وتی: ئەم قسەیەم لەكەسی تر نەبیستووە.

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) وتی: بەسە، بۆ ئاوا ساردو سڕی؟ ئایا پێغەمبەرەكەت ناناسی؟! كابرا مەترەكەی فڕێداو كەوت بەسەر دەستی پێغەمبەردا تاماچی بكات .

پێغەمبەر (ﷺ) دەستی كابرای دوورخستەوەو فەرمووی: ئەوەچی دەكەی؟! ئەوە عەجەمەكان بەرامبەر پاشاكانیان دەیكەن، من پاشانیم بەڵكو من پیاوێكم لەئێوە.

ئینجا كابرا قوماشەكەی پێواو پێغەمبەر (ﷺ) لێی وەرگرت ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ویستی هەڵیبگرێت، پێغەمبەر (ﷺ) ڕازی نەبوو، پێی فەرموو: خاوەن شت شایستەترە كە شتەكەی هەڵبگرێت، مەگەر لاوازو بێتوانابێتو شتەكە نەتوانێت، ئەوكاتە برا موسوڵمانەكەی هاوكاری دەكات.



## «بێفیزی زانایان»

ڕۆژێك خەلیفەی عەباسی (هارونە ڕەشید) ناردی بەشوێن زانای پایەبەرز (ئەبی معاویە) بۆ میوانداری کردنی، ئەم زانا بەڕێزە پیاوێکی نابینا بوو، وەلامی میوانداری (هارونە ڕەشید)ی دایەوەو نانیان خوارد، پاشان هەڵسا بۆ ئەوەی دەستی بشوات پیاوێك ئاوی دەکرد بەدەستیدا، دوای تەواو بوونی لەدەست شتن خەلیفە پێی وت: ئەی باوکی معاویە، دەزانی ئەوە کێ بوو ئاوی کرد بەدەستتدا؟ وتی: نەخێر.. ئەی گەورەی باوەڕداران.

هاورنە ڕەشید وتی: ئەوەمن بووم!

ئەویش وتی: ئەی گەورەی باوەڕداران، ئەم کارەت کرد وەك ڕێزگرتن لە زانستو زانایان.

وتی: بەڵێ.

کاربەدەستانی ئوممەتی ئیسلام ئاوا ڕێزیان لەزانایان گرتووە!!

## «خەڵکی دۆزەخ»

دوو پیاو دانیشتبوون شانازییان بەسەر یەکتردا دەکرد هەریەکەیان شانازی دەنواندو باسی خۆی دەکرد کە ئەو کوڕی فلانی کوڕی فلان کەسی ناودارە تا نۆ باپیری خۆی ژماردو باسکرد، پاشان بەهاوەڵەکەی وت: ئیتر تۆ کێیتو چیت؟!

پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لەم قسانە بوو، ویستی فێری ڕەوشتی بێفیزییان بکات، لە ڕەگەز پەرستیو شانازی کردنی نابەجێ خۆیان بپارێزن.

بەو دووکەسەی فەرموو: لەسەردەمی موسادا (سەلامی خوای لێ بێت) دووپیاو لەخزمەتیدا شانازییان بە باوباپیریانەوە دەکرد، تایەکێکیان ناوی نۆپشتی خۆی وت، خوای گەورە: وەحی بۆ پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێبێت) کردو فەرمووی: بەو کەسە بڵێ کە شانازی بەنۆ پشتی خۆی کرد، کەهەر نۆ باپیرەکەی لەئاگردانو ئەویش دەبێتە دەهەمین کەسی ئەوان.

# ﴿هارونە ڕەشید و باڵول﴾

هارونە ڕەشیدی خەلیفە لەڕێگەی ڕۆشتنندا بوو بۆ حەج، باڵول کوڕی عەمر بینی، پێی وت: ئەی گەورەی باوەڕداران لەم سەفەرو گەشتەدا خۆ بەکەمزانین و بێ فیزیت باشترو شیاوترە لەخۆ بەگەورە زانینت !

هارونە ڕەشید دەستی کرد بەگریان، وتی: ڕاستت وت چیترت هەیە بۆمان؟

باڵول وتی: هەرپیاوێك خوای گەورە سامان و جوانی و دەسەڵاتی پێبەخشی، ئەویش لەسامانەکەی بەخشی، جوانیەکەی بەگوناه ناشیرین نەکردو پاکی خۆی پاراست، لەدەسەڵاتداریدا دادپەروەر بوو لەدیوانی خوادا ناوی لەناو چاکاندا تۆمار دەکرێت.

هارونە ڕەشید: دیارییەکی پێ بەخشی.

باڵول وتی: پێویستم پێی نیە، لەکێت سەندووە بیگەڕێنەوە بۆ ئەو: (واتە ئەو دیارییە لەوە ناچێت هی خۆت بێت، بیگەڕێنەوە بۆ خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی).

ئینجا وتی: کەواتە بامانگانەیەکت بۆ ببڕمەوە.

باڵول ئەویشی نەویست !

وتی: ئەی گەورەی ئیمانداران من و تۆ بەندەی خواین، شتێکی نەستەمە کەتۆی لەبیربێت و منی لەیاد بچێت !

# «بەندە و پێغەمبەر»

ڕۆژێـك فریشـتەی وەحـی "جبرەئیـل" سـەلامی خـوای لێبێـت، لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دانیشـتبوو، فریشـتەیەك لەئاسمانـەوە دابـەزیو بەپێغەمبـەری فـەرموو: ئـەی محمـد پـەروەردگارت منـی بـۆلای تـۆ نـاردووە، فەرموویـەتی: ئایـا دەتـەوێ خـوای گـەورە بتکـات بـە پاشـاو پێغەمبـەر، یـان بەندەیەکی ئاسایی‌و پێغەمبەر؟!

پێغەمبـەر (ﷺ) سـەیری جـوبرەئیلی کـرد وەك ئـەوەی ڕاوێـژی پێبکـات، جوبرەئیـل ئامـاژەی بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) کـرد کەلـە بەرامبـەر پـەروەردگار خۆبەکـەم زان‌و بـێ فیزبێـت، پێغەمبـەریش (ﷺ) ڕاوێژەکـەی جـوبرەئیلی وەرگرت‌و بەفریشتەکەی فەرموو: (بل عبداً رسولاً).

واتە: داوای ئەوە دەکەم بەندەیەکی ئاسایی‌و پێغەمبەر بم.

بەم شێوە پێغەمبـەر مرۆڤێکی ئاسایی هەڵبـژاردو بێفیـزی لەبـەردەم خـوای بالادەستدا نیشاندا.

خوای گەورەش لەبەرامبـەردا گـەورەیی‌و مـەزنی هەتاهـەتایی بەخشی بـەو پێغەمبەرەو ناوی لەنێو مرۆڤەکاندا بەرزکردەوە (ورفعنا لك ذكرك).

(ئیمامی بەغەوی لە (شرح السنة) هێناویەتی ابو یعلی دەفەرموێت (إسناده حسن)

# ﴿لێبوردن و بێفیزی﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەرکەوتووبی چووە شاری مەککەو فەتحی کرد، سوپایەکی گەورەی موسوڵمانان لەخزمەتیدا بوون کەژمارەیان دەهەزار جەنگاوەر بوو، هەموویان چەکیان هەڵگرتبوو، قەڵغانی ئاسنینیان پۆشیبوو بۆ خۆپاراستن، ترس‌وبیم دڵی موشریکەکانی قوڕەیشی گرتبوو، پیاوان لەپشتی دەرگای ماڵەکانیان یان لە مزگەوتی حەرام دا بەترسەوە چاوەڕێی ڕووداوەکان بوون، بزانن چی دەبێت، لەخۆیان دەپرسی: ئایا پێغەمبەر (ﷺ) دەیانکوژێت؟ لەبەرامبەر ئەو هەموو ئازارەی موسوڵمانان یان لێیان دەبورێت؟!

سوپای موسوڵمانان بەرەوپێش دەڕۆشت، پێغەمبەریش (ﷺ) بەسواری وشترەکەیەوە، سەری دانەواند بوو، بەشێوەیەک خەریک بوو ناوچاوانی دەیدا لە پشتی وشترەکە، ئەوەندە بێفیزو ملکەچ‌و خاکی بوو، ئەمەش بۆ دەربڕینی سوپاسگوزاری بوو بۆ ئەو خوایەی ئەو فەتحەی پێ بەخشیبوو.

پێغەمبەریش بیری لەتۆڵەسەندن نەکردەوە، بەڵکو لەخەڵکی مەککە خۆشبوو بەبێ ئەوەی هیچ بەرامبەرو فیدیەیان لێ وەربگرێت ئەو فەرموودە بەرزەی فەرموو: (إذهبوا فأنتم الطلقاء) بڕۆن ئێوە هەمووتان ئازادن !! ئەوانیش سوپاسی لێبوردن‌و بەخشندەیی پێغەمبەریان کردو پۆل پۆل هاتنە ناو دینی ئیسلامەوە.

# «گەورەیی مرۆڤە سادەکان»

خوای گەورە هەیبەتی بەخشیبوو بە پێغەمبەرەکەی بۆیە کەسێك یەکەم جار دەیبینی لێی دەترساو سامی لێدەکرد، ئەگەر تێکەڵی دەبو خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) هەموو گیانی داگیردەکردو لەلای ئارام دەبۆوە.

ڕۆژێك پیاوێك هاتە خزمەتی، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیدا کابرا کەوتە لەرزین‌و ترسا!!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هێواش بەرەوە، ئارامبەرەوە خۆمن پاشانیم!! من کوڕی ئافرەتێکم لەقوڕەیش کە گۆشتی وشکبووی دەخوارد! ئیتر بەم فەرمایشتە دڵی کابرا ئارامبۆوەو ترسی لەلانەما، ئەمەش بەهۆی بێفیزی‌و خاکی بون‌و نەرم‌و نیانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو.

نموونەی خاکی بوون‌و بێ فیزی لەژیانی پێغەمبەردا زۆرە ئەو هاوکاری ماڵەوەی دەکرد، پێداویستی بۆ دابین دەکردن بەرگ‌و پۆشاکی خۆی دەدورییەوە، پێڵاوەکانی چاك دەکردەوە.

سواری گوێدرێژ دەبوو، قوماشی خوری دەپۆشی، لەسەر زەوی دادەنیشت، وەڵامی بانگی پاشاکانی دەدایەوە مەڕی دەدۆشی، کاتێك کەسێك بانگی دەکرد دەیفەرموو: لبیك .. لبيك .

## لەکۆتاییدا:

خـاکی بـوون .. بـێ فیـزی.. سـادەیی لەژیانـدا .. خۆجیانەکردنـەوە لـە خەڵك، ڕەوشتێکی بەرزو جوانە، سیمای پێغەمبەرانـە نیشانەی جوانی زانایـانو کاربەدەستانە، وەڕەوشتێکی موسوڵمانی تەواوە.

خوای گەورە فەرموویەتی:

(وأحفض جناحك لمن إتبعك من المؤمنين) الشعراء ٢١٥

واتـە: بـاڵی میهرەبـانی بـۆ ئـەو باوەڕدارانـە ڕابخـە کـە شـوێنت کـەوتوون، لەگەڵیان خاکیو سادەبە، بەسۆزو میهرەبان بە.

پێغەمبەریش (ﷺ) هانی موسوڵمانانی داوە بۆ خۆڕازاندنەوە بـەو ڕەوشتە: فەرموویەتی: (ماتواضـع أحـد لله إلا رفعـه) هەرکەسـێ ئـەم ڕەوشـتەی تیابێـت دەچێتە ڕیزی بەندەکانی خوای میهرەبان (عباد الرحمن).

(وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلامًا) (الفرقان: ٦٣).

هەرکەسیش واز لەم ڕەوشتە بهێنێو بەرامبـەر خواو خەڵك بـەفیزو بـەدەمار بێت بەڕاستی لەسەر ڕێگەیەکی ترسناکە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (لايدخل الجنـة مـن كـان فـي قلبـه مثقـال ذرة من كبر) تواضـع، واتـە: سـادەییو نـەرمو نیـانی، نزیکی لەخـەڵكو تێکـەڵیانو بەرامبەریان خۆ بەگەورە نەزانی.

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی پشت بەخوا بەستن

ئامادەکردنی

ئەحمەد محمد حسن + محمد محمود القاضي

وەگێڕانی

ناصح محمد موبڕەیی

# «پشت بەخوا بەستن»

التوکل: واتە پشت بەستن بە جگە لەخۆت لەکارو بارێکدا.

توکل علی الله: واتە ئەو کەسە پشت بەخوا دەبەستێت چونکە دڵنیایە کەخوای گەورە کەفیلی ژیان ورۆزی ئەو کەسەیە،وەفەرمان وکاروبار بەدەستی ئەوە.

توکل:ئەوەیە مرۆڤ بەتەواوی و بەڕاستی دڵی بە خواوە پەیوەست بێت دڵنیا بێت کەسوود وەرگرتن و پاراستنی لە زیان لەکاروباری ژیانی دونیاو قیامەتدا لای خوای بالآدەستەوەیە.

-﴿وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ ۖ وَٱللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ ۖ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلاً﴾(النساء ٨١).

-﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا﴾(الفرقان ٥٨).

واتە:پشت و پەنات بە زاتێك بێت کە هەمیشە زیندووەو هەرگیز نامرێت.

﴿إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلاً﴾(الاسراء ٦٥).

﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ﴾(التوبه ١٢٩).

﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾(الشورى ٣٦).

-پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(کاتێ کەسێك لەماڵ دەردەچێت دەڵێت: (بسم الله،توکلتُ على الله،لاحول وَلا قوة إلا بالله) پێی دەوترێت: هیدایەت درایت، خوات بەسە، پارێزراویت. ئینجا شەیتانەکان لێی دوور دەکەونەوە (ابو داود والترمذي).

*پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:(يدخل الجَنة اقوامٌ أفئدتهُم مثلُ أفئدة الطير)(مسلم).

واتە: کەسانێك دەچنە بەهەشت دڵیان وەك دڵی باڵندە وایە لە پشت بە خوا بەستندا.

*سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێت: (التوكل على الله عز وجل جماع الايمان).

*ئیبن قەییم دەفەرموێت: (التوَكل نصف الدين،وَالنصف الثاني الانابة، فانَ الدين استعانةٌ وَعبادةٌ،فاتوكل هوَ الاستعانة، وَالانابة هي العبادة) (مدارج) واتە: تەوەکول نیوەی دینە،نیوەکەی تری (إنابة)، چونکە دین پەنابردن و بەندایەتی یە،پەنابردن(توکل)ە عیبادەتەکەش (إنابة).

شاعیر دەڵێت:

توكل علي الرحمن في الامر كله ... فما خابَ حقاً مَن عليه توكلاً
وَكن واثقاً بالله واصبِر لِحكمِه ... تفز بالذي ترجوه منه تفَضُلاً

واتە:پشت بەخوای (رحمان)ببەستە لە هەموو کارێکدا،چونکە هەر کەس پشت بەو ببەستێ نائومێد نابێت.



# ﴿ڕەوشتی خەڵكی بەهەشت﴾

پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوەڵانی فەرموو: گەلانی پێش خۆمم لەقیامەتدا نیشاندرا، دەمبینی پێغەمبەری وابوو یەك پیاوی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەری وابوو دوو پیاو، پێغەمبەری واش بوو كۆمەڵێك لە دەكەس كەمتر بوون، پێغەمبەریش بوو كەسی لەگەڵ نەبوو، پاشان ژمارەیەكی زۆری خەڵكم بینی كە ڕەشیان دەكردەوەو دەمی گزنگیان بەستبوو، ئومێدم خواست كەئەوە ئومەتی من بن، وتیان: ئەوە موساو ئومەتەكەیەتی!! پاشان پێم وترا: بڕوانە ڕەشاییەكی گەورەم بینی كەبەری گزنگی بەستبوو، پێم وترا، ئاواوەو ئاواوە بڕوانە، دیسان خەڵكێكی زۆرم بینی كەبەری گزنگیان گرتبوو.

پێم وترا: ئەوانە هەموو ئومەتی تۆن! لەنێو ئەواندا حەفتا هەزاریان بەبێ لێپرسینەوە دەڕۆنە بەهەشتو سزا نادرێن.

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بەبێ ئەوەی ڕوونی بكاتەوە ئەوانە كێن، هاوەڵان وتیان، ئەوانە ئێمەین كەباوەڕمان بەخوا هێناو شوێن پێغەمبەرەكەی كەوتین، ئێمەین لەگەڵ منداڵەكانیشمان كە بەموسوڵمانی لەدایك دەبن.

كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) زانی كەچییان وتووە، هاتەدەرەوە پێی فەرموون: ئەوانە كەسانێكن كە دوعاو نوشتەی حەرامو جاهلیی ناكەن، وە ڕەش بین نینو ئەنجامی نادەن، وەپشتو پەنایان بەخوای خۆیانە.

عكاشە هەستا وتی: داوام بۆ بكە من یەكێك لەوان بم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: تۆ لەوانیت، پاشان پیاوێكی تر هەستا و هەمان داوای كرد، فەرموی: عكاشە پێشت كەوت) ئیمامی بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە

# ﴿دوو کەسی ناکۆك﴾

ڕۆژێـك دووپیـاو هـاتن بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) بـۆ ئـەوەی دادوەری لەنێوانیاندا بکاتو کێشەکەیان بۆ یەکلابکاتەوە، پێغەمبـەریش (ﷺ) مافەکـەی بۆ یەکێکیان بڕیاردا، ئـەوی تـریش ڕۆشـتو بـەدەم ڕێگـەوە دەیـوت: "حسـبی الله ونعم الوکیل" پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەو پیاوەم بۆ بگێڕنـەوە، کاتێ کـابرا گەڕایەوە پێغەمبەر (ﷺ) پرسی چیت وت؟ کـابرا وتـی: وتم "حسـبی الله ونعـم الوکیل"

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لۆمەی خوا ناکرێـت لەسـەر دەستەوسـانی خـۆت، بـەڵکو پێویسـتە کەکێشـەو گرفتێکـت هـەبوو بەعـەقڵو زیـری خـۆت بـەرگری لەخۆت بکەیت، ئەگەر خاوەنی مافەکە بویت.

نابێـت دەستەوسـان بیـت لەسـەلماندنی ئـەو مافـەت، چـونکە خـوای گـەورە بـەوەرازی نابێـت کـە مـرۆڤ دیفـاعو بـەرگری لـەخۆی نـەکات، بـەڵکو پێویسـتە بەهـەموو توانـای خـۆتو هـەموو هۆکارێـك بـۆ بەدەسـت هێنـانی مافەکـەت بـەکاربهێنی، ئـیتر دوای ئـەوە ئەگـەر سـەرکەوتوو نـەبویتو بەرامبەرەکـەت مافەکەی بۆ خۆی چەسپاند، بڵێ: حسبی الله ونعم الوکیل.

## «خەڵکی یەمەن»

خـەڵکی یەمـەن کـە دەردەچـون بـۆ ئەنجامـدانی فـەریزەی حـەج خـواردن‌و خواردنەوەیان ئامادەنە دەکرد وەپێداویستی سەفەرو گەشتی حەجیان لەگەڵ خۆیان نەدەبرد، ئینجا دەیانوت: ئێمە پشت بەخوا دەبەستین.

جا کە دەگەیشتنە مەککە داوای خۆراك‌و ئاویان لە خەڵك دەکرد، خـوای گـەورەش ئایەتی نارد (وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى) البقرة ١٩٧.

خوا فەرمانی پێکردن کە پێویستی خۆیـان هـەڵبگرن وەك خـواردن‌و خواردنـەوە. ئەوەشی ڕوونکردەوە کەدەست خستنی هۆکارەکان دژی پشت بەستن بەخوانیە، بـەڵکو پشت بەستنی ڕاستەقینە ئەوەیە مرۆڤ دەست بەهۆکارەکانـەوە بگرێت‌و پاشان پشت بەخوا ببەستێ.

## «دەرزییەك و بزنێك»

جارێـك ئافرەتێـك لەگـەڵ سـوپای موسـوڵمانانـدا دەرچـوو بـۆ غـەزا لەیـەکێك لـە سریەکاندا، لەماڵەوە هەندێ مەڕو بزنی بەجێ هێشت لەگەڵ دەرزییەکی چنین، کاتێ گەڕایـەوە بینـی بزنێـك لـەناو ماڵاتەکـەدا نـەماوەو بـزر بـووە، هـەروەها دەرزیەکـەش دیارنەماوە.

وتی: پەروەردگار تۆ زەمانەتی ئەو کەسەت کردووە کە لەڕێگەی تۆدا غەزا دەکات کە پێداویستیەکانی بپارێزی هەتا دەگەڕێتەوە، من لـەپێناوتۆدا دەرچـووم وا بزنێك‌و دەرزیـەکم لێ ونبـووە! ئینجـا ئافرەتەکـە داوای لـەخوا کـرد کەشـتە ونبووەکـانی بـۆ بگێڕێتەوە بەدڵێکی پاك‌و بێگەرد زۆر لەخوا پاڕایەوە!

بـۆ بـەیانی ئافرەتەکـە بینـی وا دووبـزن‌و دوو دەرزی لەماڵەکەیدایـە، ئەمـەش پاداشتی متمانەی ئەو ئافرەتەبوو بەخوای گەورە کەبەوشێوەیە پشتی بەخوای گەورە بەستبوو.

# «متمانە بەخوا»

پیاوێك هات بۆلای "فوضەیل کوڕی عیاض" و پێی وت: ئەگەر پیاوێك لەماڵ دانیشێ و واگومان ببات کەمتمانەی بەخوا هەیەو ڕۆزی بۆ دێت، تۆ دەربارەی ئەو پیاوە چی دەڵێی؟

وتی: ئەگەر بەباشی متمانەی بەخوا هەبێت، ئەوە شتێ کەخوا بیەوێت ئەو بەرگری لێ نەدەکرد، ئەوە نەپێغەمبەران و نە جگەلەوانیش ئەو کارمیان نەکردووە، کەلە ماڵەوە دانیشن و چاوەڕێی رزق و ڕۆزی بن، هەروەها وتی: پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لێبێت) بەکرێ کاریان بۆ خەڵك کردووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ)،

هەروەها ئەبو بەکرو عومەر (رضي الله عنهما) ئەمیان وتووە: لەماڵ دادەنیشین و چاوەڕێی خواین ڕزقمان بۆ بنێرێ، خوای گەورەش دەفەرموێ: لەدوای تەواو بوونی فەرزی جومعە، بڕۆن و بڵاو ببنەوە بەسەر زەویداو لەبەخششەکانی خوا بەدەست بهێنن "الجمعە".

کەواتە پێویستە مرۆڤ بەشوێن ژیاندا بڕوات و بۆ ڕۆزی هەوڵبدات.

# «پشت بەستن بەتوێشووی خەڵك»

ئیمامی ئەحمەد (رضي الله عنه) لەدوای نوێژی عەسر دانیشتبوو، لەدوای کۆتایی وانەکەی پیاوێك هات بۆلای وتی: ئەی پێشەوا دەمەوێت حەج بکەم بەبێ کۆکردنەوەی توێشوو، بۆچوونی جەنابت چییە؟ ئیمامی ئەحمەد وتی: کەواتە لەگەڵ کاروانێکدا بەڕێبکەوە کەبەرەو حەج دەڕۆن! کابرا وتی: ناتوانم بەتەنها ئەو ڕێگە ببڕم.

ئیمام وتی: کەواتە تۆ تەوەکولت پشت و پەنات بەتوێشووی خەڵك بەستووەو پشتت بەخوا نەبەستووە!!

# ﴿پێداویستی سەفەركردن﴾

ئیبراهیم الخواص (ﷺ) پیاوێكی خواناس‌و زاهید بوو كاتێ دەڕۆشت بۆ گەشت‌و سەفەرێك لەگەڵ خۆیدا دەرزی‌و بەكرەو مقەست‌و مەتارەیەك ئاوی لەگەڵ خۆی دەبرد.

یەكێك لەهاوەڵان پرسیاری لێكرد: بۆچی ئەم شتانە لەگەڵ خۆت هەڵدەگریت، ئەی باوكی ئیسحاق خۆتۆ بەكەسێكی زاهید ناسراویت؟

ئیبراهیم لەوەڵامدا دەیوت: هەڵگرتنی ئەم شتانە لەتەوەكل‌و پشت بەخوا بەستن كەم ناكاتەوە، چونكە خوای گەورە چەند فەرزێكی لەسەر ئێمە داناوە، مرۆڤی هەژاریش كەتەنها یەك بەرگ‌و پۆشاكی هەیە، دوورنیە بەرگەكەی بدڕێت، ئەگەر دەرزی‌و دەزووی پێ نەبێت، عەورەتی دەردەكەوێت‌و نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر ئاوی پێ نەبێت ناتوانێ خۆی بۆ نوێژەكە پاك بكاتەوە، ئەگەر مقەستیشی پێ نەبێت، ناتوانێ سمێڵی كورت بكاتەوە هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێكردووە.

كەواتە هەڵگرتنی ئەو شتانە هەریەك بەسوودە بۆ كارێك.

# «ڕزگار بوون»

ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) هەموو بتەکانی گەلەکەی شکاند، کاتێك زانییان هێنایانو فەرمانیان کرد بیسوتێننو خواکانیان سەربخەن.

خەڵکی شارەکە کەوتنە کۆکردنەوەی دار بۆ ئاگرەکە، کە بڕیاربوو لاشەی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) بکرێتە خۆراکی، کاتێ تەواو بوون لەکۆکردنەوەی دار، ئاگریان پێوەناو بڵێسەی ئاگر بەرز بۆ وە، ئینجا ئیبراهیم پێغەمبەریان هێنا فەرمووی: "حسبي الله ونعم الوكيل"

جوبرەئیل هاتو بە ئیبراهیمی فەرموو: هیچ پێداویسیەکت هەیە؟ ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی: هیچ پێداویستیەکم بەتۆ نییە، پێویستیم بەخوای خۆم هەیە!!

خوای گەورە فەرمانیکرد بە ئاگر کە ساردبێتەوە بە ئەندازەیەك ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) لەناو ئاگرەکەدا پارێزراوو دوور لەزیان بێت.

[ قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ] الانبياء ٦٩.

ئەمەش بەهۆی پشت بەستنی ئەو پێغەمبەرە بوو "سەلامی خوای لێبێت" بەخوای گەورە.

# ﴿تەوەکولی ڕاستەقینە﴾

ڕۆژێک پیاوێک هات بۆلای پێشەوا ئەحمەد کوڕی حەنبەل (ﷺ) پرسیاریکرد دەربارەی پیاوێك کەلەماڵی خۆی، یان مزگەوت دادەنیشێ و دەڵێت، هیچ کارێك ناکەم هەتا ڕۆزیم بۆ دێت.

ئیمامی ئەحمەد وتی: ئەوپیاوە هیچ دەربارەی زانست نازانێ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إن الله جعل رزقي تحت ظل رمحي).

خوای گەورە رزقی منی خستۆتە ژێر سێبەری ڕمەکەمەوە.

هەروەها دەفەرموێ: "لو انكم توكلتم على الله حق توكله لرزقكم كمايرزق الطيرَ تغدو خماصاً وتروح بطاناً" (ترمزی و ابن ماجه) ئەگەر بەڕاستی پشت بەخوا ببەستن ئەوا رزق و ڕۆزییان دەدات هەروەك ڕۆزی باڵندە دەدات کە بەیانی بەبرسی دەڕواتە دەر، ئێوارە بەتێری دەگەڕێتەوە.

ئەوەتا دەفەرموێت: بەیانی دەردەچێت بۆ بەدەست هێنای خۆراکی خۆی، هەروەك هاوەڵانیش هەمیشە لەناو باخە خورماکانیان کاریان دەکرد.

بەم شێوە فێر دەبین کە پێویستە موسوڵمان دەست بەهۆکارەکانەوە بگرێت، پاشان پشت بەخوا ببەستێ.

ئەگەر چۆلەکەو کۆترێك پێویستی بەچوونە دەرو هەوڵدان بێت بۆ خۆی، ئەوا مرۆڤ لەپێشترە بەوکارە.

# ﴿ئەستێرە ناسەکان درۆیانکرد﴾

کاتێ گەورەی موسوڵمانان پێشەوا عەلی (ﷺ) ویستی دەربچێت بۆ شەڕ لەگەڵ دەستەی "خوارج"ەکاندا یەکێك لە ئەستێرە ناسان کەناوی "مسافر کوڕی عەوف" بوو ئامۆژگاری کرد کەلەو کاتەدا سوپاکەی بەڕێنەخات، بەڵکو کاتێکی تری بۆ دیاریکرد تابکەوێتە جوڵە.

پێشەوا "عەلی" پێی وت: بۆچی؟ ئەویش وتی: ئەگەر لەم کاتەدا بەڕێبکەون، خۆت و هاوەڵانت توشی شکستێکی گەورە دەبن، بەڵام ئەگەر لەوکاتەدا بڕۆن کە من بۆم دیاریکردون، ئەوا سەرکەوتن بەدەست دەهێنن! پێشەوا فەرمووی: محمد پێغەمبەر (ﷺ) ئەستێرە ناسی نەبوو لە دوای ئەویش ئێمە نامانبێت، پاشان فەرمووی: پەروەردگار هەر خراپەیەك توشمان بێت لەتۆوەیە، هەرچاکەیەکمان توش بێت هەرلای تۆوەوەیە، هیچ خواو پەرستراوێك نیە بێجگە لەتۆ، وەبەتوندی کابرای ئاگادار کردەوە کە هەرگیز کار بەفاڵ و ئەستێرە ناسی نەکات.

سوپاکەی بەڕێخست و لەگەڵ "خەواریجەکان، کەوتە شەڕو جەنگ لە جێگەیەك بەناوی "نەهرەوان" وەتوانی سەربکەوێ بەسەریاندا جا ئەگەر لەوکاتەدا بەڕێ بکەوتنایە کە (مسافر) وتی: پاشان سەرکەوتینایە، ڕەنگە خەڵك بیان وتایە، ئەوە بەهۆی "مسافر"ە وەبوو. جاخەڵکینە، پشت بەخوا ببەستن و متمانەی تەواوتان بەخوا هەبێت ئیتر ئەوتان بەسەو پێویستتان بە جگەلەو نابێت.

# ﴿ویردی باوەڕداران﴾

دوای تەواو بون لەغەزای ئوحود پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵان (ﭫ) گەڕانەوە بۆشاری مەدینە، هێندەی نەبرد گوێیان لەبانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە فەرمانی پێکردن هەموویان خۆئامادە بکەن بۆ دەرچوون، ئەوانیش لەگەڵ ئەو هەموو برینو ئازارو ماندووبونەی لەغەزای ئوحود توشیان هاتبوو، وەڵامی فەرمانەکەی پێغەمبەریان دایەوەو بەرەو "حمراء الاسد" بەڕێکەوتن موشریکەکانیش بەسەرکردایەتی "ئەبی سوفیان" دەرچوون بۆ کوشتار لەگەڵ موسوڵمانان، ئەوانیش لەشوێنێ بەناوی "الروحاء" جێگیربوون، کۆمەڵێك کەبەرەو مەدینە دەڕۆشتن بەلایاندا تێپەڕین، ئەبو سوفیان پێی وتن، هەواڵ بە (محمد) بگەیەنن کە ئێمە سوپایەکی زۆرمان بۆ ئامادەکردونو ئەمجارە هەموویان لەناو دەبەین کاتێ ئەم هەواڵە گەشتە پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانی، هەر گوێشیان بەو هەرەشەیە نەداو نەترسان، بەڵکو پشتیان بەخوای گەورە بەستو داوای کۆمەك و یارمەتیان لێکردو وتیان: حسبنا الله ونعم الوكيل.

خوای گەورە بەهانایانەوە چوو وەفێڵی دوژمنەکانی هەڵوەشاندەوە.

وەترسی خستە دڵی بێباوەڕانو گەڕانەوە بۆ مەککە.



# «ڕۆژی سامناک»

جارێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنێو هاوەڵانیدا ئامادەبوو، خوای گەورەی یاد دەخستنەوەو فێری شتانێکی دەکردن کەسود بەدنیاو دوارۆژیان بگەیەنێت.

لەوکاتەدا هاوەڵان هەستیان بەخەمو پەژارەیەك کرد لە دەمو چاوی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەوانیش پرسیاریان کرد لەهۆکاری ئەو خەمو پەژارەیە؟

فەرمووی: چۆن دڵخۆش بم کە ئەو فریشتەی خوای گەورە دایناوە، دەمی گرتووە بە کەڕەناکەوەو گوێی گرتووە بزانێ کەی فەرمانی پێدەکرێت کەفوی پێدابکاتو قیامەت دەست پێبکات.

ئیتر خەمو پەژارە ڕووی لەهاوەڵانیش کرد لەسەختیو سامناکی ئەو ڕۆژە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون: بڵێن (حسبنا الله ونعم الوكيل، على الله توكلنا) (الترمزي و حسنه)

بۆیە پێویستە موسوڵمان ئەو هۆکارانەی کە دەبێتە مایەی ڕزگاربوون لە سزای خوا لە دوارۆژدا بەکاربهێنێو دوای جێبەجێ کردنو ئەنجامدانی هۆکارەکان، کاروباری بداتە دەست پەروەردگار خوای گەورەش باوەڕدارانی گوێڕایەڵ لەسزای دوارۆژ دەپارێزێ.



# ﴿ئەشکەوتی ثەور﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکری هاوڕێیدا لەشاری مەککەوە کۆچیان کرد بەرەو مەدینە، لەڕێگەدا ڕۆیشتنە ئەشکەوتی "ثەور" بۆ ئەوەی لەبەرچاوی موشریکەکانی مەککە خۆیان حەشار بدەن، موشریکەکانیش بۆ گەڕان بەشوێنیاندا لەشاری مەککە دەرچوون، کاتێ گەشتنە بەردەم ئەشکەوتی "ثەور" ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) بینی وا موشریکەکان لەبەردەرگای ئەشکەوتەکە وەستاون، ترسا لەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا ببێت، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر یەکێکیان سەیری بەرقاچی خۆی بکات ئێمە دەبینێت!! (البخاري و مسلم)

پێغەمبەریش (رضي الله عنه) دڵنیای کردەوەو فەرمووی: گومانت چیە بەدووکەس کەسێهەمیان خوای گەورەیە؟!

بەڕاستی وادەرچوو خوای گەورە پێغەمبەرو هاوەڵەکەی پاراستو دوای ئەوەی بێباوەڕان بەدووریان زانی لە هاتبنە ئەو ئەشکەوتە، چونکە هیچ نیشانەیەکیان نەبینی، بۆیە ڕوویان وەرگێڕاو ئەشکەوتەکەیان بەجێ هێشت.

# «فەرمانی خوا»

ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) هاجەرە خاتوونی هاوسەریو منالە شیرەخۆرەكەی "ئیسماعیل"ی كوڕی بەرەو بیابان برد، تا گەشتنە مالی خوا (كەعبە) لەوێدا داینان، تەنها كەمێك خورماو دۆلكەیەك ئاویان پێبوو، پاشان بەجێی هێشتنو خۆی گەڕایەوە، هاجەرە خاتوون شوێن مێردەكەی كەوتو پێی وت: ئەی ئیبراهیم بۆكوێ دەڕۆیت؟ بۆچی بەجێمان دەهێلی؟

بەم شێوەیە هەتا دۆلەكە ڕۆشت لەگەلیدا، كەسی تری لێنەبوو، ئیبراهیم هیچ ئاوڕی نەدایەوە، سەرەنجام هاجەرە پێی وت: ئایا خوای گەورە فەرمانی پێكردویت بەمە؟

ئیبراهیم "سەلامی خوای لێبێت" فەرمووی: بەلێ.

هاجەرە زانی كە ئەو كارەی ئیبراهیم ویستی خۆی نیە. بەلكو فەرمانی خوایە، دلنیا بوو كەخوا هاوكاریان دەبێت.

بۆیە فەرمووی: كەواتە خواش فەرامۆشمان ناكات، بەم شێوە "ئیبراهیمو هاوسەرەكەی" پشتیان بەخوای خۆیان بەستو كاری خۆیان دایە دەستی پەروەردگار، خوای گەورەش لە ساتی زۆر نارەحەتتدا بەهانای هاجەرە خاتوونو ئیسماعیل كوڕی ڕۆشتو بیری زەمزەمی پێشكەش كردن.

# ﴿پشت بەستن وانابێت﴾

عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) گەشت بەکۆمەڵێك خەڵکی یەمەن، فەرمووی: ئێوە کێن؟ وتیان: ئێمە ئەوانەین پشتمان بەخوا بەستووە!!

فەرمووی: بەڵکو ئێوە "متواکیلەکانن" واتە ئەوانەی مشەخۆرنو بەسەرباری خەڵکەوەن، ئینجا فەرمووی: پشت بەخوا بەستنی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە تۆو لەزەویدا دەچێنێو پاشان پشت بەخوا دەبەستێت.

کەواتە پشت بەخوا بەستنی ڕاستەقینە ئەوەیە کە مرۆڤ دەست بەهۆکارەکانی سەرکەوتن بگرێت، لەهەموو کاروبارێکدا، پاشان سەرەنجامەکە بەجێ بهێڵێ بۆ پەروەردگار، وەك ئەو کشتیارەی زەویەکە دەکێڵێو تۆوەکەی دەچێنێو چاودێریو ئاودێری دەکات، پاشان کارەکە بۆ خوای گەورە بەجێ دەهێڵێ تا دەغڵو دانەکەی بۆ سەوز بکاتو بۆی بێتە بەرهەم.



## لەکۆتاییدا:

پشت بەخوابەستن یەکێکە لەڕەوشتو ئاکارە جوانەکانی باوەڕدارو موسوڵمان، خوای گەورە دەفەرموێ (وعلى الله فليتوكل المؤمنون).

(التوكل) واتە: هانابردنو پەنابردنو ملکەچ بوون بۆ خوای تاکو تەنها، چونکە هەمووشتێ بەدەست ئەوە، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە مرۆڤ واز لە هۆکارەکان بهێنێ، بەڵکو پێویستە موسوڵمان سەرەتا دەست بەهۆکارەکانەوە بگرێ، چونکە هۆکارەکانیش خوای گەورە بڕیاری لەسەرداوە، ئەمەش مانای ڕاستەقینەی پشت بەخوا بەستنە، پشت بەخوابەستن مرۆڤ دەکاتە خۆشەوستی خوا (إن الله يحب المتوكلين) کەواتە بائێمەش خۆمان بەم ڕەوشتە برازێنینەوە، ئەوەی کەلەسەرمان پێویستە جێبەجێی بکەین، پاشان سەرەنجامەکان بدەینە دەست خوای گەورە.

ئەم کورتە چیرۆکانەش باسی پشت بەخوا بەستن دەکاتو دەتوانین پەندو ئامۆژگاری لێوەربگرین.



# كۆمەڵە چیرۆكێك لەبارەی خۆشەویستی

ئامادەكردنی

یاسر علی نور

وەرگێڕانی

جعفر محمد ألماس

# ﴿( خۆشەویستی المحبة )﴾

خۆشەویستی: مەیلی دڵە بۆ شتێ کەوا دەزانیت و وادەبینی کەخێروچاکەی بۆت هەیە یان خۆشە ویستی کەسێك یان شتێك.

-خۆشەویستی خوا:واتە بەخشینی هەموو ئەوەی کەتۆخاوەنیتی له ماڵ وکات و ویست و کردارو گیان بۆ ئەوخوایەی کەخۆشت دەوێت بەمەستی رەزامەندی ئەو بەدەست هێنان.

-خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ بەواتای خۆشویستنێك هانت بدات لەسەر گوێڕایەڵی کردنی،چونکە گوێڕایەڵی هەرکەس نیشانەی خۆشەویستی ئەوکەسەیە،بەمەرجێك بەزۆر نەبێت.

لَو کانَ حُبك صادقاً لَأطعتهُ          اِنَ المحِب لِمَن یُحِب مطیعُ

ئەگەر خۆشەویستیت ڕاست بووایە بە گوێت دەکرد چونکە خۆشەویست گوێڕایەڵی ئەو کەسەیە خۆشی دەوێت.

*نیشانەی خۆشەویستی خوا:شوێن کەوتنی پێغەمبەرﷺ:﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(ال عمران ٣١).

*خۆشەویستی خەڵك:گرنگترینیان خۆشەویستی کەسانی باوەڕدارە لەبەر خوای گەورە،پاشان خۆشەویستی خەڵك بەمانای حەزکردن بە ڕزگاربوونیان لەدوارۆژ.خوای گەورە دەفەرموێت:﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ ( المائدە ٥٤).

-﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ﴾(البقره١٦٥).

*پێغەمبەر ﷺدەفەرموێت:(مِن اشد أُمتى لي حباً،ناسٌ يكونونَ بعدي ،يَوَدُ اَحدُهُم لوراني باهلِهِ وَمالِهِ)(رواه مسلم).

**واتە:لەئوممە تەکەم بەهێزترین کەسیان کەمنی خۆش دەوێت ،کەسانێکن لەدوای من دێن ئامادەیە هەموو ماڵ و کەسی بکات بە قوربانیی لە پێناوی بینینی مندا.**

**هەروەها دەفەرموێت:**(إنَ الله -تعالى- ليحمي عبدَهُ المؤمن مِن الدنيا وَهُوَ يُحِبُهُ،كما تحمونَ مريضَكُم الطعام وَالشَراب تخافون عليهِ)(اخرجه الحاكم وَصححهُ)

**هەروەها دەفەرموێت:**(إنَ الله يقولُ يوم القيامة:أينَ المتَحابونَ بِجلالي اليوم أُظِلُهُم في ظِلي يوم لاظِل اِلا ظِلي )(مسلم).

**هەروەها دەفەرموێت:**(مَن أحبَ لله ،وَأبغض لله ،وَأعطى لله،وَمنعَ لله ،فقد استكمل الايمان)(ابو داود واحمد).

**هەرکەس خۆشەویستی و ڕق لێبون و بەخشین و نەبەخشینی لەبەر خوا بێت،باوەڕی تەواو بووە.**

# ﴿خۆشویستنی خوا (جل جلاله)﴾

عەبدولاّ کوڕی حسین (ﷺ)کەنیزەکێکی عەجەمی هەبوو، شەوێکیان لەخەو هەستاو دەست نوێژی شت، پاشان هەستا بۆ نوێژکردن، دوای ئەوەی لە نوێژەکە بوویەوە سوجدەی بردو دەستی کرد بە پاڕانەوە لەخوای گەورە ئەو وتی: گەورەم سوێندت دەدەم بە خۆشەویستی خۆت بۆ من لێم خۆش بە، لەمکاتەدا عەبدولاّ ڕاوەستابوو گوێی لەو مناجاتە بوو وتی: ئەی فلاّن، وامەڵێ! بەڵکو بڵێ: سوێندت دەدەم بە خۆشەویستیم بۆتۆ، چونکە لەوانەیە خوای میهرەبان تۆی خۆش نەوێت.

کەنیزەکەکە وتی: ئەگەر ئەو خۆشی نەویستمایە لەخەو ڕانەدەچڵەکیم ئێستا لەبەردەستیدا کڕنوشم نەدەبرد بەخۆشەویستی خوا بۆمن لەلای موشریکان ڕزگاری کردمو لەلانەی موسوڵمانان جێگیری کردم، عەبدولاّ فەرمووی: بڕۆ لەمەودوا ئازادبە لەبەر خاتری خوای خۆشەویست، کەنیزەکەکە وتی: ئەی گەورەم، خراپەم لەگەڵ دەکەیت!! من دووپاداشتم بۆ هەیە، ئێستا پاداشتێکم وەرگرت، پاشان هاوارێکی لێ بەرز بوویەوە وتی: ئەمە گەردن ئازادی مەولای بچوکمە، ئای.. ئەی چۆنە گەردن ئازادی مەولای گەورەم!! پاشان کەوت بەڕووی زەویداو ڕۆحە پاکەکەی سپارد بە خوای خۆشەویستی.

# «خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ)»

پیاوێـك هاتــە خزمــەت پێغەمبــەر (ﷺ) وتــی: ئــەی پێغەمبــەری خــوا: بەڕاستی تۆم لـەخۆمو منداڵەکانم خۆشتر دەوێتو مـن لەماڵـەوە هەمیشە باسی تۆو یادی تۆ دەکەم، ئارامم لێبڕاوە هەتا دێمە خزمەتتو تێـر لـەڕووی مبارەکت دەنوارم، وەهەرکاتێك بیر لەمردنی خۆمو مردنی تۆ دەکەمەوە، دەزانم کاتێك تۆ چویتە بەهەشت پلەو پایەت بـەرزەو لەگەڵ پێغەمبـەرانی، ئەوکاتـە مـن ئەگـەر هاتمـە بەهەشــت دەترســم نەگــەم بەدیــدارت، پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) هــیچ وەڵامێکی نەدایەوە، هەتاکو جبرەئیل "سەلامی خوای لێبێت" دابەزیـە لای و ئـەم ئایەتـەی بـۆ خوێنـدەوە (وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا) النساء ٦٩.

واتە: (ئەوەی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر دەکات، ئەوانە لەگەڵ ئەو کۆمەڵەن کــەخوا نیعمــەتی زۆری بەســەردا ڕشــتوون لــە پێغەمبــەرانو ڕاســتگۆیانو شەهیدانو چاکان کەباشترین هاوڕێن).

پیاوەکە بۆی دەرکەوت کە پێویستە بەردەوام تێبکۆشێت لەگوێڕایـەڵی خـوای گـەورەو خـوا پەرستیدا. تـاوەکو بگاتـە ئـەو پلـە باڵایـە لەبەهەشتدا، تـاوەکو لـە بەهەشت لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویستیدا بێت (ﷺ).

# ﴿خۆشەویستی خواو پێغەمبەری خوا﴾

ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پیاوێك پرسی لە پێغەمبەر (ﷺ) کەی قیامەت دێ؟ واتە: لەچ کاتێك خوای گەورە خەڵك زیندوو دەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ چیت بۆ ئامادەکردووە؟

کابرا وتی: کارو کردەوەی زۆرم نیە، تەنها خواو پێغەمبەرەکەیم خۆش دەوێت!! (البخاری و مسلم).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت دەوێت.

ئەنەس (ﷺ) دەفەرموێ: هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەم وتەیە دڵخۆشی نەکردین کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەوەدایت کە خۆشت دەوێت. پاشان ئەنەس دەڵێ: من پێغەمبەری خوام (ﷺ) خۆش دەوێت، هەروەها ئەبوبەکرو عومەریش (ﷺ) داواکارم لەخوای گەورە بەخۆشەویستیم بۆ ئەوان بمکاتە هاوەڵیان، ئەگەریش کارو کردەوم وەك کاروکردەوەی ئەوان نەبێت. وەلەسەر خۆشەویستی ڕاستەقینە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: سێ شت هەن لەهەرکەسێکدا هەبن ئەو کەسە شیرینی ئیمانی چەشتووە، خواو پێغەمبەری لە هەموو شتێك خۆشەویست تربێت لەلای هەرکەسێکی خۆشەویست، تەنها لەبەر خوا بێت، وەزۆر پێ ناخۆش بێت بگەڕێتەوە سەر بێ باوەڕی دوای ئەوەی خوا ڕزگاریکرد لێی، هەرچۆن زۆی پێ ناخۆشە فڕێبدرێتە ناو ئاگرەوە. (اخرجه مسلم).



# ﴿خۆشەویستی نیشتمان﴾

پێغەمبەری خۆشەویست لەشاری مەککەی پیرۆز لەدایك بوو، هەرلەوێش گەورەبوو تا ئەوکاتەی وەحی بۆدابەزی لەباوەشی شاری مەککەدا دەژیا، لەهەموو کوچەو کۆڵانو جێگەیەکدا چەندین یادگاری هەبوو، وەکاتێك خوای گەورە فەرمانیدا کە بانگەوازەکە ئاشکرا بکاتو خەڵکی ئاگادار بکاتەوە لەخواناسیو خواپەرستی، خۆیو هاوەڵانی ڕووبەڕووی توندوتیژی یەکی ترسناك بوونەوە، بۆیە خوای گەورە فەرمانیدا کە کۆچ بکەن بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، هاوەڵان کۆچیان کردو گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی بوون، هەرچەندە خەمبار بوون بە دوورکەوتنەوە لەشاری مەککە، کەبەدرێژایی ژیانیان لەباوەشی ئەودا بوون. کاتێکیش پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکری هاوەڵیدا (﵁) کۆچیان کرد خەمباریو حوزن دڵی پێغەمبەری گرت بۆ دوورکەوتنەوە لە مەککە، بەدەم ڕێوە چەند جار ئاوڕی دەدایەوە لەشاری مەککە، ئاواتە خوازبوو هەرلەوێ بژیایەو مەککەی جێنەهێڵایە، بەلام ئەوە فەرمانی خوایە دەبێت کۆچ بکات بۆ شاری مەدینەی پیرۆز. پێغەمبەر (ﷺ) لەدووری مەککە کەمێك ڕاوەستاو پاشان وتی: ئەی مەککە "سوێند بەخوا تۆ باشترینی زەوی خوایت، وە خۆشەویست ترین زەوی لەلام، ئەگەر خەڵککەی وەدەریان نەنامایە جێم نەدەهێلایت"!!



# «خۆشەویستی هاوسەر»

ڕۆژێکیان خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆبوونەوە سەبارەت ڕاو بۆچوونیان لەسەر خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستیەکی تایبەتی هەبوو بۆ عائیشە، مەیلی بۆلای عائشە زیاتر بوو لەوان، بۆیە خاتوو فاطمەی کچیان نارد تا قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات لەسەر ئەو حاڵەتە، پاشان خاتوو فاطمة (رضي الله عنها) چووە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکانت داوای دادپەروەریت لێ دەکەن لەسەر کچی ئەبی قوحافە (مەبەست عائشە خان بوو) (رضي الله عنها).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کچی خۆم "ئایا تۆش ئەوەت خۆش ناوێت کەمن خۆشم دەوێت"؟

وتی: بەڵێ، فەرمووی : دەی تۆش عائشەت خۆش بوێت.

بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) هەموو خێزانەکانی خۆش دەویستو دادپەروەر بووە لەگەڵیان، لەموعایشە کردن لەگەڵیان، ئەگەر خۆشەوستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ عائیشە تایبەت بوو بێت، لەبەر ئەوە بووە کە ئەو زۆر نزیک تر بووە لە دڵییەوە بۆیە دەفەرمووێ (ﷺ): پەروەردگار ئەوە توانای منە لەمەی دەسەڵاتم بەسەریدا دەشکێت، (واتە: لەداد پەروەری لەنێوان هاوسەرەکانمدا تکا دەکەم لۆمەم مەکە لەوەی بەخشیومە بە عائیشەو لەدەسەڵاتمدا نیە، واتە: مەیلی دڵ ئاماژەیە بۆ ئەوە کە مەیلی بۆلای عائشە زیاتر بووە لە خێزنەکانی تری.

بەلام ئەم مەیلە هەرگیز نەبۆتە ڕێگر کە پێغەمبەر (ﷺ) داد پەروەر بێتو مافی هاوسەرەکانی تری هەرگیز پێشێل نەکردووە. (البخاري).

# «خۆشەویستی منداڵ»

ڕۆژێکیان ئوسامەی کوڕی زید (ﷺ) چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پرسی بۆ پێویستیەکی خۆی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئوسامە چووە دەرەوە، بەلام پێغەمبەر (ﷺ) خۆی پێچابوویەوە وەك ئەوەی شتێکی شاردبێتەوە.

بۆیە ئوسامە پرسیاری کرد: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێچاوتە بەخۆتەوە؟

پێغەمبەر (ﷺ) جلو بەرگەکەی کە پێچابووی بەخۆیەوە، والای کرد لەژێریدا حەسەنو حوسەین ئاشکرا بوون، وەفەرمووی، ئەمانە دوو کوڕی منن کچەزای منن پەروەردگار من خۆشم دەون، تۆش خۆشت بووێت وە ئەوەشت خۆش بوێ کە ئەمانەی خۆش دەوێت. (ترمزی ڕیوایەتی کردووە).

وەڕۆژێکی تر پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەدا لەسەر مینبەر بینی حەسەنو حسین دێنو دەچن لەناو مزگەوتدا لەسەر مینبەرەکە دابەزیو کردنیە باوەشو لەبەردەم خۆیدا داینان، پاشان فەرمووی: خوای گەورە ڕاستی فەرمووە: (إنما أموالكم وأولادكم فتنة).

کاتێ ئەو دوو منداڵەم بینی دێنو دەچن، نازانن بۆ کوێ بچن، ئارامم لێبڕا بۆیە وتارەکەم بڕیو هەڵم گرتن. (ترمذي: ڕیوایەتی کردووە).

پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانی زۆر خۆش دەویست هەرکاتێ چاوی بکەوتایە پێیان ماچی دەکردن، وەدایکیشیانی خۆش دەویست، زۆر دڵخۆش دەبوو کە دەیبینی وەدەیفەرموو مەرحەبا لەکچی خۆم، ماچی دەکردو لەپەنای خۆیدا دایدەنیشاند.

# «خۆشەویستی پیاوچاکان»

یەکێك لە کاربەدەستەکان پرسیاری کرد لە (ثابتی بنانی) لە چۆنیەتی پاڕانەوەی یەکێك لە هاوەڵانی (ثابت) فەرمووی: ئەو هاوەڵە لەنزاو پاڕانەوەکانیدا زۆر دەیفەرموو: ئیلاهی بمکەیتە خۆشەویستی بەندەکانت، کار بەدەستەکە بەکەمو بێ بایەخی زانی بۆیە وتی: ئایا تەنها هەرئەوە نزاو پاڕانەوەی بووە؟! (ثابت) فەرمووی: ئەو پاڕانەوەیە بەکەم دەزانی؟ بەڕاستی گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالك بووە (ﷺ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ) دەیفەرموو: خوای پەروەردگار ئەگەر بەندەیەکی خۆش ویست بانگی جوبرەئیل دەکات (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێت: من فلانە کەسم خۆش دەوێت، ئێوەش خۆشتان بوێت، پاشان خۆشەویستی دادەبەزێت بۆ سەر زەوی. بۆیە چاكو خراپ خۆشی دەوێت، وەئەگەر خوای گەورە ڕقی لەکەسێك بوو فەرمان دەدات بە جوبرئیل کە بانگەواز بکات تا خەڵکی ڕقی لە فلانەکەس بێت، هەموو خەڵك چاكو خراپ ڕقیان لێی دەبێت، کاربەدەستەکە وتی: پەنا بەخوا دەگرمو پەشیمان دەبمەوە. لەڕۆژی داهاتوودا (ثابت) هاتەوە بۆلای کاربەدەستەکە، کاربەدستەکە لەبەری هەستاو سەری ماچ کردو وتی: ئەم شەو لەخەونمدا چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مزگەوتەکەیدا بوو فەرمووی: بەردەوامبە لەسەر ئەو وتەیە، ئیلاهی بمکەرە خۆشەویستی دڵی بەندەکانت، چونکە بەندە چاکەکانی خوا هەرکەسیان خۆشویست خواش خۆشی دەوێت.

# ﴿خۆشەویستی لەبەرخوا﴾

سوهەیلی کوڕی ئەبی صالح لەگەڵ باوکی چوون بۆ حەجی ماڵی خوا، کاتێك ڕۆژی عەرەفە هات خەلیفەی موسوڵمانان (عمری کوڕی عبدالعزیز) (ﷺ) بەلایاندا تێپەڕی، خەڵکی لەبەری هەستان‌وسەیریان دەکرد، هەموو خەڵکی موشتاقی سەیرکردنی بوون. سوهەیل وتی: بابەگیان من وادەبینم خوای گەورە عومەری کوڕی عبدالعزیزی خۆش بوێت، باوکی وتی: چۆن ئەوە دەزانی؟ وتی: چونکە ئەو خۆشەویستە لەدڵی موسوڵماناندا، وەبەڕاستی لەئەبو هورەیرەم بیستووە کەلە پێغەمبەری خوای (ﷺ) گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: هەرکاتێك خوای گەورە بەندەیەکی خۆش بوێت بانگی جوبرەئیل دەکات، دەفەرموێت: من فلانەکەسم خۆش دەوێت، ئێوەش خۆشتان بوێت. جوبرەئیلیش خۆشی دەوێت، پاشان بەئاسمانەکاندا بانگەواز دەکات‌و دەڵێت: خوای گەورە فلانە کەسی خۆش دەوێت، ئێوەش خۆشتان بوێت، ئەهلی ئاسمانەکانیش خۆشیان دەوێت، پاشان ئەوە دادەبەزێت بۆسەر زەوی‌و ئەوانیش قبوڵی دەکەن، وەهەرکاتێك رقی لە بەندەیەك بوو، بانگی جوبرەئیل دەکات، دەفەرموێت: من رقم لەفلانە ئێوەش ڕقتان لێی بێت، جوبرەئیلیش رقی لێی دەبێت، پاشان بەئاسماندا جاڕ دەدات کە خوای گەورە ڕقی لە فلانە کەسە ئێوەش ڕقتان لێی بێت، پاشان ئەو ڕق لێبوونە دادەبەزێتە سەر زەوی هەموو خەڵك رقیان لێی دەبێتەوە، (بوخاری ریوایەتی کردووە).

# «خۆشەویستی برا»

دەگێڕنەوە ئافرەتێك هەبوو مێردێك و برایەك و كوڕێكی هەبوو زۆر خۆشی دەویستن ڕۆژێكیان قازی فەرمان دەدات كەس و كاری ئافرەتەكە قۆڵ بەست بكەن، پاشان ئافرەتەكە چوو بۆلای قازی داوای لێكرد كەبیان بەخشێت و تكایكرد ئازادیان بكات، بەڕاستی ئافرەتەكە هەموو خۆشەویستەكانی لەگرتوخانە دابوون، خۆشەویستێكی لانەمابوو تا دڵخۆشی بێت لەپەنایدا، نەبراو نەمێردو نەكوڕ، پاشان قازی وتی: ئافرەت دوای چەند ڕۆژێك لەیەكێكیان خۆش دەبم جاخۆت كامیانت زۆر خۆش دەوێت دیاریكە بۆمان، ئافرەتەكە بیرێكی كورتی كردەوە پاشان وتی: مێرد دەبێتەوە، كوڕی تریش لەدایك دەبێت، براكەم ون دەبێت و ناگەڕێتەوە، جەنابی قازی براكەم ئازادبكە، قازی زۆر سەری سوڕما لەوتەی ئافرەتەكە وەسەرسامبوو لە هەڵبژاردنی براكەی بەسەر مێردو كوڕەكەیدا، وەدڵ خۆش بوو لە هەڵبژاردنەكەی، قازی پاش بیركردنەوەیەك وتی: ئەی ئافرەتەكە بەخۆشەویستی بۆ براكەت لەهەرسێكیان خۆش بووم.

# «لەبەرخوا خۆشم دەوێیت»

ڕۆژێك لە ڕۆژان پیاوێك بەلای كۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) تێپەڕی، یەكێك لە دانیشتوان وتی: من ئەو پیاوەم خۆش دەوێت، پێغەمبەر (ﷺ) ویستی هاوەڵان فێربكات لەوەی كە چۆن هاوەڵەكەی ئاگادار بكات كەخۆشی دەوێت، فەرمووی: ئایا پێت وتووە كە خۆشم دەوێیت؟ كابراكە وتی: نەخێر .. تائێستا پێم نەوتووە.

پێغەمبەر (ﷺ) بۆی ڕوونكردەوە، كە هەركەسێك برایەكی خۆش ویست پێویستە ئاگاداری بكات كەخۆشی دەوێت، بۆیە فەرمووی (ﷺ): بچۆ پێی بڵێ با بزانێ كەخۆشت دەوێت!!

كابرا هەستاو بەپەلە ڕۆیشت تا گەیشتە هاوەڵەكەی پێی وت: من لەبەر خوا خۆشم دەوێیت هاوەڵەكە وتی: بەو ئەندازەیەی تۆ منت خۆش دەوێت خواش تۆی خۆش بوێت. البخاری

یەكێك لە سونەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر كەسێك موسوڵمانێكی خۆش بوێت باپێی بڵێت، براكەشی وەڵامی بداتەوە تا پێكەوە یەكتریان خۆش بوێتو برایەتی نێوانیان بەهێزو تۆكمەتر بێت.

# «خۆشەویستی لەبەرخوا»

دووهاوەڵ لە دوو گوندی نزیك لەیەکتر دەژیان هەردووکیان یەکتریان خۆش دەویست.

ڕۆژێك یەکێکیان بەڕێکەوت بۆلای براکەی تا لەگوندەکەی دراوسێیان سەردانی بکاتو هەواڵ پرسی لێبکات، لەڕێگەدا دەڕۆشتو نزیك گوندەکە بووبۆوە، لەوێدا کابرایەك ڕوبەڕووی هاتو پرسیاری لێکرد، دەتەوێت بۆ کوێ بچیت؟ وتی: برایەکم لەو گوندەیە دەچم بۆ سەردانی، کابرا پرسی: ئایا بۆ بەرژەوەندیەك دەچیت بۆلای؟ یان قەرزارەو داوای قەرزەکەی لێدەکەیتەوە؟ وتی: نەخێر، تەنها لەبەرخوا خۆشم دەوێتو دەچم بۆلای.

کابرای پرسیار کار وتی: دەی من نێرراوی خوام بۆ لای تۆ (واتە: فریشتەی خوام) هاتووم مژدەی ئەوەت بدەمێ کە خوای گەورە تۆی خۆش دەوێت، هەروەك تۆ ئەو کابرایەت تەنها لەبەرخوا خۆش دەوێت. البخاری

# ﴿خۆشەویستی خوا (جل جلاله)﴾

ئیدریسی خەوەلانی (ﷺ) ڕۆشتە مزگەوتی دیمەشق، پیاوێکی دەمو چاو جوانی بینی کەخەڵك بەدەوریەوە بوون، ئەگەر لە شتێکدا ڕایان جیاواز بوایە پرسیاریان لەو کابرایە دەکرد، بۆ چوونەکەی ئەویان وەردەگرت، ئیدریس پرسیاری کرد کەئەو پیاوە کێیە؟ پێیان وت: ئەوە "معاذ کوڕی جەبەلە (ﷺ).

لەسبەینێدا هەرزوو ئیدریس بەرەو مزگەوت ڕۆشت، بینی معاذ (ﷺ) پێشی کەوتووەو نوێژ دەکات، چاوەڕێی کرد هەتا لە نوێژەکەی تەواو بوو، ڕۆشتە خزمەتیو سڵاوی لێکردو پێی وت: سوێند بەخوا من لەبەرخوا تۆم خۆش دەوێت.

معاذ (ﷺ) ویستی بەتەواوی دڵنیا بێت، دووجاری تر کابرای سوێند دا، کابراش هەموو جارێ سوێندی دەخوارد کە خۆشی دەوێت، لەدوای دڵنیا بوونی لەخۆشەویستی کابرا، لەخۆی نزیك کردەوەو فەرمووی: مژدەت لێبێت، من لەپێغەمبەر (ﷺ)م بیستووە فەرموویەتی: خوای گەورە فەرموویەتی: خۆشەویستیم بە پێویست گەڕاوە بۆ ئەوانەی لەبەر من یەکتریان خۆش دەوێتو پێکەوە کۆدەبنەوەو سەردانی یەکتر دەکەنو بەیەکتر دەبەخشن. (رواه مالك في الموطأ بإسناد صحيح، نظرة النعيم/ج٨/ ٣٣٤٣).

## ﴿سەرکردەی سەرکەوتوو﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵانی خۆی زۆر خۆشدەویست، هەریەکێك لەوان وایاندەزانی کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی لەهەمووان خۆشتر دەوێت.

ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) سوپایەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن ئامادەکردو "عەمر کوڕی عاص"ی هەڵبژارد بۆ سەرکردایەتی سوپاکە، ئەو سوپایە ئەبوبەکرو عومەریشی تیابوو (ﷺ) عەمر لە دڵی خۆیدا وایزانی ئەم هەڵبژاردنەی پێغەمبەر لەبەر پلەو پایەو خۆشەویستی عەمرە لەدڵی پێغەمبەردا (ﷺ).

بەڵێ ڕۆشتن و لەغەزای "ذات السلاسل"دا بەسەر بێباوەڕاندا سەرکەوتن کاتێك گەڕانەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردن، عەمر هەستی کرد کە ئێستا ئەو خۆشەویست ترین کەسە لەلای پێغەمبەر (ﷺ).

بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: خۆشەویست ترین کەس لای تۆ کێیە؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: عائیشە (ﷺ)

عەمر وتی: مەبەستم لەناو پیاواندا؟

فەرمووی: باوکی عائیشە ئەبوبەکر (ﷺ).

عەمر وتی: پاش ئەو کێ؟ فەرمووی: پاشان عومەری کوڕی خطاب، پاشان چەند پیاوی تری ژمارد، عەمر بێدەنگ بوو لەترسی ئەوەی نەبادا پێغەمبەر (ﷺ) لەڕیز بەندی خۆشەویستەکانیدا ئەو بخاتە کۆتایی. (الترمذي و قال، حديث حسن).

# «باوەڕ و خۆشەویستی»

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهاوەڵانی فەرموو: (لایؤمن أحدکم حتی أکون أحب إلیه من ولده ووالده والناس أجمعین) البخاري و مسلم.

واتە: باوەڕی تەواو نیە هەرکەس لەئێوە کە من "واتە پێغەمبەر"ی لە منداڵو باوكو دایكو هەموو خەڵك خۆشتر نەوێت.

عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) وتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆم لە هەموو شت خۆشتر دەوێت تەنها لەخۆم نەبێت!!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخێر، ئەی عومەر دەبێت لەخۆشت زیاتر خۆشەویست بم "واتە هێشتا باوەڕت تەواو نییە، عومەر (ﷺ) وتی: سوێند بەخوا ئێستا لەخۆم زیاتر خۆشم دەوێی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئێستا ئەی عومەر؟ واتە: باوەڕت لەدڵدا تەواو دامەزرا، ئەوەتا زەید کوڕی دثنة (ﷺ) کاتێ موشریکەکان بەدیل گرتیانو ئەبو سفیان کەهێشتا موسوڵمان نەبوو بوو وتی: ئەی زەید پێت خۆشە کەئێستا محمد لەجێگەی تۆ بوایەو لەملی بدرایە، تۆش لەناو ماڵو خێزانی خۆتدا بوای؟ زەید وتی: سوێند بەخوا، حەزناکەم کە "محمد" لەجێگەی خۆی دڕکێك بچێت بەگیانیداو منیش لەناو ماڵو منداڵی خۆمدا بم!!

ئەبو سفیان وتی: بەڕاستی هیچ کەسێکم نەدیوە کە کەسێکیان خۆش بوێت، بە ئەندازەی خۆشەویستی هاوەڵانی محمد بۆ محمد (ﷺ).

# «خۆشەویستی سورەتی "الاخلاص"»

پیاوێکی ئەنصاری لە مزگەوتی (قباء) پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکرد، هەرکات نوێژی دەکرد سورەتی (قل هو الله احد ..) هەتا کۆتایی سورەتەکە دەخوێند تا تەواو دەبوو، پاشان سورەتێکی تری دەخوێند، لەهەموو ڕکاتێکدا ئەمەی دووبارە دەکردەوە، هاوەڵانی مزگەوتەکەی پێیان وت، تۆ هەمیشە ئەم سورەتە دەخوێنی! پاشان وەك ئەوەی وابزانی نوێژەکەت تەواو نیە دەچیت سورەتێکی تریش دەخوێنی، جا یان تەنها سورەتی "الاخلاص" بخوێنە یان ئەو مەخوێنەو سورەتێکی تر بخوێنە.

ئەویش وتی: من هەرگیز ئەو کارە واز لێناهێنم جا ئەگەر پێتان خۆشە پێش نوێژیتان بۆ دەکەم، ئەوە ئامادەم ئەگەر پێتان ناخۆشە واز دەهێنم.

ئەوانیش لەبەر ئەوەی پیاوێکی بەڕێزی ناویان بوو، پێیان خۆش نەبوو بیگۆڕن، وتیان: ڕازین بەوشێوە پێش نوێژیمان بۆ بکە.

جاکاتێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەو ڕووداوەیان پێگەیاند، فەرمووی: ئەی فلانکەس، چی وایلێکردی بەگوێی هاوەڵەکانت نەکەیت؟ وەبۆچی ئەوەندە پابەندی بەو سورەتەوە لەهەموو ڕکاتێکدا دووبارەی دەکەیتەوە؟ وتی: ئەو سورەتەم زۆر خۆش دەوێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خۆشەویستیت بۆ ئەو سورەتە دەتباتە بەهەشتەوە یان (خواش تۆی خۆشدەوێت) البخاری و مسلم (٨١٣)

## لەکۆتاییدا:

خۆشەویستی ڕەوشتێکی بەرزو جوانە، نیشانەی ڕاستی هەستو سۆزە، ئاماژەی بەرزی گیانو دەرونە موسوڵمان خۆشەویستی خواو پێغەمبەر دەدات بەسەر هەموو خۆشەویستیەکی تردا، وە ویستو ئارەزووەکانی شوێن پێغەمبەر (ﷺ) دەخات، چونکە دەیەوێت لە پەروەردگاری نزیک بێتەوەو لەسەر گوێڕایەڵیو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا سوورە.

چەند جوانە کۆمەڵگە پڕبێت لەخۆشەویستی، خۆشەویستیەك لەبەرخوا بێت، بەشێوەیەك خەڵك هەموو وەك یەك دەستیان لێبێت، باوك کوڕو کچەکانی خۆش بوێت، منداڵ باوكو دایکیان خۆش بوێت، پیاو هاوسەری خۆش بوێتو ژنیش مێردەکەی خۆش بوێت، مرۆڤەکان براو هاوڕێکانیان خۆش بوێت.

موسوڵمان وڵاتو خاكو نیشتمانی خۆش دەوێت، کەسانی ڕەوشت بەرزی خۆش دەوێت، هەموو شتێکی جوانی لەژیانیدا خۆش دەوێت، ئەم کورتە چیرۆکانەش باس لە جۆرەکانی خۆشەویستی دەکات دەکرێت سودیان لێوەربگرین.

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی ئارامگری

ئامادەکردنی

عەبدولعەزیز سەید هاشمی

وەرگێڕانی

ئومێد عومەر باوەمردەیی

# ﴿ئارامگری (الصبر)﴾

صبر:پاراستنی دەروون بەو شێوەی كە شەرع وعەقڵ دەیخوازێت كەئارامبگرێت.یان (صبر)هێزێكە كەبە هۆیەوە بەرگەی ناڕەحەتی وئازارەكانی ژیان دەگرێت،خوای گەورە لەزیاتر لە(٩٠)جێگەی قورئاندا ئاماژەی بۆ كردووە ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ﴾(البقره ٤٥).

-پێشەوایی لەدیندا بە هۆی یەقین و ئارامگرتنەوە دەبێت.

﴿وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ﴾(السجده ٢٤).

-ڕزگار بوون لە تیاچوون بە هۆی باوەڕو كرداری چاك و ئامۆژگاری لە سەر حەق و ئارامگرتنەوە دەبێت.﴿وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ۝٣﴾

-ئارامگرتن لەسەر عیبادەت و خواپەرستی ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦ﴾(مریم ٦٥ ).

-ئارام گرتن لەسەر فێربوونی زانست و زانیاری .

إصبر على مُر الجفا من معلم — فإن رسوب العلم في نفراته

وَمَن لَم يَذق مُر التعلم ساعة — تجرع ذل الجهل طول حياته

وَمَن فاته التعليم وقت شبابه — فكبر عليهِ أربعاً لوفاته

حياة المرء والله بالعلم والتقى — اذا لم يكونا لا اعتبارة لذاته

(شافعی)

*ئارامگرتن لەسەر دوورکەوتنەوە لە گوناهو تاوان .

-ئارامگرتن لەسەر ئازارو بەلاو نەخۆشی و هەژاری و ناڕەحەتی ژیان ﴿لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ۖ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ (١٧٧)﴾(البقرە ١٧٧).

-﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ (١٥٥) الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ (١٥٦) أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾(البقرە ١٥٥-١٥٧).

-ئارامگرتن لەسەر دوژمنایەتی شەیتان وخراپەکاران وملی کەچ نەبوون بۆیان﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَىٰ إِلَيْكَ وَاصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ اللَّهُ ۚ وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾(یونس ١٠٩)

*پاداشتی ئارامگرتن ئەندازەی نیە﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾(الزمر ١٠).

*پێغەمبەرﷺدەفەرموێت: (عجباً لأمر المؤمن إن أمرهُ كلهُ خير ،وَليسَ ذالِكَ لأحدٍ إلا لِلمؤمن إن أصابتهُ سراء شكر فكانَ خيراً لهُ ،وَإن أصابتهُ ضراء صبر فكانَ خيراً لَهُ)(رواه مسلم).

واتە:سەرسامم بە کاری باوەڕدار کە هەرچی دەکات خێرە ئەمەش تەنها بۆ باوەڕدارە چونکە ئەگەر توشی خۆشی بوو سوپاسگوزارە،ئەگەر توشی زیان بوو ئارام دەگرێ و هەردو حاڵەتەکە خێرە بۆی .

-هەروەها دەفەرموێت:(المؤمن الذي يُخالِط الناس وَيَصبر على أذاهم أعظَمُ أجراً مِنَ المؤمن الذي لايُخالط الناس،وَلا يصبر على أذاهُم)(الترمذي وَابن حاجة).

**کەواتە:موسوڵمانێ کە تێکەڵی خەڵك دەبێت و ئارام دەگرێت لای خوا باشترە.**

**-خوای گەورە ستایشی (ایوب پێغەمبەر دەکات کە ئارامگر بووە)**﴿وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَـٰنُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ۗ إِنَّا وَجَدْنَـٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾(ص ٤١،٤٤).

**-پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:(هەرکەسێ خوا چاوی لێ بسەنێتەوەو ئارام بگرێت،پاداشتی تەنها بەهەشتە)**البخاري.

-عبدالله کوڕی مەسعود ﷺدەفەرموێت:(الصبر نصف الايمان وَاليَقين الايمان كلُّه)

-الصبر مِثلُ اِسمِهِ مُرٌّ مذاقتهُ لكِن عواقِبهُ أحلى مِنَ العسل.

**ئارامگرتن هەر وەك ناوەکەی تاڵە بەڵام سەرەنجامی شیرینتر لە هەنگوینە.**

**شاعیر دەڵێت:**

**إذا ما اتاكَ الدهرُ يوماً بنكبةٍ فافرغ لها صَبراً وَوسع لها صدراً**

**فإن تصاريف الزمانِ عجيبةٌ فيوماً ترى يسراً وَيوماً ترى عسراً.**

**★وتراوە:سێ شت هەرکەس دەستی بکەوێ،خێری دنیاو قیامەتی دەستگیر بووە**(الرضا بالقضاء،وَالصَبر على البلاء،وَالدُعاء في الرضاء)

***کەواتە خوا ئارامگرانی خۆش دەوێت**(وَاللهُ يُحِب الصابرين) **خوا لەگەڵ ئارامگرانە** (إنَ الله مَعَ الصابرين).

# ﴿ئارامگریی هەژاران﴾

موسوڵمانان کۆچیان کرد لەمەککە وە بۆ مەدینە، ماڵو خانوویان جێهێلاّ، تەنها خودی خۆیان کۆچیان کرد بۆلای خواو پێغەمبەری خوا هەندێك لەهاوەڵانی کۆچەر لاواز بوونو نەیان دەتوانی کاربکەن وەهیچ خانوو جێگایەك نەبوو تیادانیشن، بۆیە لەناو مزگەوتدا دەخەوتن لەگەڵ هەژارانی موسوڵمانان وەخۆڕاگر بوون لەسەر برسێتی وەزۆر خۆیان ماندو دەکرد لەخواپەرستیدا،خوای گەورە فەرمانیدا بەپێغەمبەر (ﷺ) کەنزیك بێتەوە لەم هاوەڵانەوەو دوور نەکەوێتەوە لێیان، ڕۆژێك لەڕۆژەکان پێغەمبەر (ﷺ) چووە مزگەوتەوە بینی ئەو هاوەڵە هەژارانە دانیشتوون یەکێکیان قورئان دەخوێنێ ئەوانیتر گوێیان لێگرتووە.

کاتێك پێغەمبەر نزیك بووەوە لێیان بێدەنگ بوون، فەرمووی چی دەکەن؟ فەرموویان: یەکێکمان قورئانی بۆ دەخوێنێدین ئەوانیتر گوێمان گرتبوو، حەزرەت فەرمووی: سوپاس بۆ خوا کەلەنەتەوەکەم خەڵکی خۆڕاگر هەیەو خواش فەرمانی پێکردم لەئارام گرم لەگەڵیان منیش لەگەڵ ئەوانم، دانیشتو ئەوانیش لەچواردەوری پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: مژدەتان لێبێت ئەی هەژارانی کۆچکردوو بەنورو ڕۆشنایی تەواو لەرۆژی قیامەت، ئێوە بەنیو ڕۆژ لەپێش دەوڵەمەندەکانەوە دەچنە بەهەشت کە (٥٠٠) ساڵ دەکات.

# «پەلەمەکەن»

لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلامدا موسوڵمانان تووشی ناڕەحەتیو ئازاری زۆر بوون بەدەست موشریکەکانی مەککەوە، خەبابی کوڕی ئەرەت (ﷺ) لەگەڵ هەندێ لەموسوڵمانانەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) سکالای خۆیانکرد کەزۆر ئازار دەدرێن، داوایان کرد نزایان بۆ بکات تاسەربکەون، وتیان ئایە سەرکەوتن بۆ ئێمە نیە؟ ئایا نزامان بۆناکەی؟! پێغەمبەر (ﷺ) ویستی وابوو کەوانەی ئارامگریو خۆڕاگریو پایەندبوونو قبوڵکردنی نارەحەتیان فێربکات بۆ گەیاندنی پەیامی خواو سەرخستنی ئاینو بەرنامەکەی.

بۆیە پێی فەرموون: لەپێش ئێوەدا گەلانی تر موسوڵمانانیان دەگرت چاڵیان بۆ هەڵدەکەندو زیندەبەچاڵیان دەکرد، تێیان دەخستن مشاریان دەهێناو دەیان خستە سەرسەری ئەیانکرد بەدوو کەرتەوە بەمشاری ئاسن گوشتو ئێسقانیان لێك دەکردەوە، ئەوان لەدینەکە پەشیمان نەدەبوونەوە!!

فەرمووی: سوێند بەخوای گەورە ئەم پەیامە تەواو دەبێتو سەردەکەوێت هەتا سوار سواردەبێت لە صنعاء بۆ حضرەموت لەخوا نەبێ لەهیچ کەسێك ناترسێ؟ بەلام ئێوە پەلەدەکەن، بۆیە هاوەڵەکان خۆڕاگربوون لەسەر ئازار تاسەرکەوتنی خوا هات.

# ﴿خوا تاك و تەنهایە﴾

بـیلالی کـوڕی ڕەبـاح (ﷺ) لـە پێشـینە موسـوڵمانەکان بـوو، کەهاتنـە نـاو ئیسلام، یـەکێك بـوو لەوانـەی چەسـپاوو دامـەزراو بـوو لەسـەر هـەق و ڕاسـتی و بـاوەڕ، لـەو پێنـاوەدا ئـازارو نارەحـەتی زۆری چەشت کە ئەگـەر کەسێکی بـاوەڕ دامەزراو نەبوایە نەیدەتوانی ئاوا خۆڕاگر بێت.

بێباوەڕان بیلالیان گرتبوو، لەکاتی گـەرمای نیـوەڕۆدا کـەزەوی بیابـان تـەواو گەرم دەبوو، بیلالیان دەهێناو لەسەر پشت ڕایاندەکێشاو بەردی گەورەیان لەسەر سنگی دادەنـا، ئینجـا کاڵفـام و هـەرزەکانیان بانگدەکردو بـەناو کۆڵانـەکانی شـاردا بیلالیان بەشوێن خۆیاندا ڕادەکێشاو پێیان دەوت: ئەمە حاڵتەو بەوشێوە دەبیت هەتا دەمریت، یان دەبێت بێباوەڕبیت بە (محمد)، بتـەکانی ئێمـە (لاتو عـوززا) بپەرستیت!!

بــەڵام بــیلال کەســێکی بــاوەڕ دامــەزراو بــەهێزبوو، لەبیروباوەڕەکەیــدا ئـارامگرێکی نـاوازە بـوو، بەخشینی گیـانی بۆخـوا زۆر لائاسـان بـوو هـەموو ئـەو ئــازارو نارەحەتیانــەی بــەئارامگری تێپەڕانــدو وشــەی (احـد احـد) واتــە: خــوا هەریەکەو هاوەڵی نیە دەدا بـەڕووی موشـریکەکاندا، بـەم شێوەیە مایـەوە، هـەتا ئەبوبەکر (ﷺ) کڕی و لەپێناو خوادا ئازادی کردو لـەئازارو نارەحـەتی بێبـاوەڕە دڵڕەقەکان ڕزگاری کرد.

# «دایکێکی خۆڕاگر»

پێش ئەوەی شەڕی قادسیە دەست پێبکات (خنساء کچی عەمر) بانگی هەرچوار کوڕەکەی کرد پێی وتن: کوڕەکانم ئێوە بەئازادی موسوڵمان بوون، کۆچکردنتان هەڵبژاردووە، سوێند بەوخوایە کەهیچ پەرستراوێك نیە هەرئەو نەبێ، ئێوە هەمووتان لەیەك پیاون، چۆن کەلەیەك ژن بوون، خیانەتم لەباوکتان نەکردووە، وەئابڕوی خاڵەکانتانم نەبردووە، خیانەتم لەپشتو نەسەبتان نەکردووە، دەزانن کەخوای گەورە چ پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردووە بۆ موسوڵمانان وەبزانن کەپاشەڕۆژ بەردەوامە، بەڵام ژیانی دنیا لەناو دەچێ خوای گەورە دەفەرمووێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) ال عمران ٢٠٠.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئارام گرنو خۆتان لەسەر ئارامگری ڕابهێنن وەپەیوەندیتان بەیەکترەوە بەهێز بێت لەخوابترسنو پارێزگاربن بۆ ئەوەی بەختەوەربن.

کوڕەکان بەجوانی گوێیان بۆ ئامۆژگاری دایکیان گرتو بەورەیەکی بەرزەوە ڕۆشتنە ناو جەنگەوە، هەریەك لەوان ئاواتی شەهید بوون بوو لەپێناو خوای گەورەدا.

بەوپەڕی ئازایەتی جەنگان هەتا هەموویان شەهید بوون کاتێك دایکیان هەواڵی شەهید بوونی کوڕەکانی پێگەیشت وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی سەربەرزو شەرەفمەندی کردم بەشەهید بوونی کوڕەکانم، ئومێدەوارم پەروەردگارم لەبەهەشتدا کۆمان بکاتەوە!! بەم شێوەیە خنساء بووە نموونەی ئافرەتانی ئارامگرو بەهێز بۆ هەموو ژنو پیاوێکی باوەڕدار.

## ﴿خۆڕاگری ئەیوب پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت)﴾

پێغەمبەری خوا ئەیوب (سەلامی خوای لێبێت) دەوڵەمەند بوو ماڵو سامانێکی زۆری هەبوو، منالی هەبوو، جەستەی بەهێزو تەندروستی چاك بوو، ویستی خوا وابوو تاقیکردەوە ماڵەکەی نەما، خێزانی وەفاتیکرد کوڕەکانی مردن، وەلەشی تووشی نەخۆشی یەکی سەخت بوو، هاوەڵو براکانی لێدوورکەوتنەوە، بەلام ئەیوب (سەلامی خوای لێبێت) لەبەرامبەر ئەم هەموو تاقیکردنەوەو نارەحەتیانە خۆڕاگربوو سوپاسی خوایدەکرد، تووشی بێزاری نەبوو لەنەخۆشیەکەی، بەڵکو ڕووی لەخوای گەورەکردو فەرمووی: (وأيوب إذ نادى ربه إني مسني الضر وانت ارحم الراحمين) الانبياء ٨٥.

خوایە تۆ زاتێکی میهرەبانی، منیش ئازارو نارەحەتیم هەیەو هانا تەنها بۆتۆ دەهێنم ! لەدوای ئەو هەموو خۆڕاگریە خوای گەورە شیفای ئەیوبی دا، فەرمووی: قاچت بە بەزەویدا، ئاوێکی سازگار هەڵدەقوڵێت لێی بیخۆرەوە، وەخۆشتی پێ بشۆ، بەویستی خوا نەخۆشی نەماو چاك بووەوە، خێزانو ماڵی بۆ گەڕایەوە، خوای گەورە بەرەکەتی تێخست، خوا ستایشی کرد بەهۆی خۆڕاگرییەوە فەرمووی: (بەڕاستی ئێمە بەخۆڕاگری بینیمان چاکترین بەندەیە کەزۆر خۆڕاگربوو) وەئێمەش لەئەیوبەوە (سەلامی خوای لێبێت) فێری خۆڕاگری بووین کە باشترین نموونەیەو وەچاکترین پێشەنگە بۆ ئارامگران.

# ﴿خۆڕاگربە پاداشتت دەبێت﴾

زەید کوڕی ئەرقەم (ﷺ) نەخۆش کەوت، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ سەردانی فەرمووی: (ئەم نەخۆشیەت هیچ زەرەری نیە، بەلاّم چۆن دەبی کاتێك لەکۆتایی تەمەنت کوێر بیت؟!)

فەرمووی: خۆڕاگر دەبم تا پاداشتم ببێ.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوکاتە دەچیتە بەهەشتەوە بەبێ لێپرسینەوە!!

دوایی وەفاتی حەزرەت زەید تووشی کوێری بوو، خۆڕاگر بوو تاپاداشتی بێت وەدوای ماوەیەك چاك بوویەوە، بەهەمان شێوەیە پاداشتی هەموو کەسێکی خۆڕاگرو لەخواترس وەهەرکەسێك خۆڕاگربێت لەسەر ویستی خوای گەورە لەدنیاو دوارۆژدا سەرکەوتووی دەکات، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەوەی لەخوا بترسێ‌و ئارامگربێت خوای گەورە پاداشتی چاکەکاران ون ناکات) یوسف۹۰.

ئەگەر خۆڕاگربن ئەوە بۆ ئێوە باشە وەخۆڕاگریتان بەپشتیوانی خوابێت.

# ﴿ئارامگری و بەهەشت﴾

کاتێك حارسەی کوڕی سراقە (ﷺ) چووە دەرەوە لەگەڵ سوپاسی موسوڵمانان لەڕۆژی بەدردا تیرێکی بەرکەوتوو شەهید بوو، دایکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا قسەم بۆ ناکەی دەربارەی حارسە، ئایا لەبەهەشتدایە؟ تا ئارام بگرم‌و چاوەڕێی پاداشت بم ئەگەر وانیە بابۆی بگریم!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی دایکی حارسە، بەڕاستی ئەو لەیەك بەهەشتدا نیە بەڵکو لەچەند بەهەشتدایە، بەڕاستی ئێستا کوڕەکەت لە فیردەوس‌و سەرەوەی بەهەشدایە.

دایکی حارسە وتی: بەخ بەخ ئەی حارسە (بەخ: بۆ شتێك دەوترێ پێخۆش بێت وەبەلایەوە سەیر بێت).

ئینجا لەخزمەت پێغەمبەر بەدڵخۆشی‌و خۆڕاگری ڕۆشت‌و زۆریی پێخۆش بوو، زۆر ڕازی بوو بەوەی کوڕەکەی چووەتە بەهەشتەوە.

# ﴿خۆڕاگر و دانایی﴾

ئەبی تەلحەی ئەنساری هاوسەری ئوم سولەیم (ﷺ) منـاڵێکی بچوکیان بـوو ڕۆژێکیـان نـەخۆش کـەوتو مـرد، لەوکاتـەدا ئـەبو تەلحـە لەسـەفەر کـردن بـوو، ژنەکەی هەستا بەشۆردنو ناشتنی وەبەهیچ کەسێکی نەوتو کەس نەیزانی.

کاتێـک ئـەبو تەلحـە گەڕایـەوە بۆماڵـەوە پرسـیاری مناڵەکـەی کـرد، بـەڵام هاوسـەرەکەی کتـوپڕ هـەواڵی نەدایـە وتـی: ئـارام بووەتـەوە لـێ بگـەڕێ ڕەنگـە خەوتبێ، خواردنی ئێوارەی بۆ ئامادەکرد وەشەو خۆی بۆڕازانـدەوەو ئـەو شـەوە وەك دوو بوكو زاوا مانەوە.

لەبەیانیدا وتی: باوکی تەلحە ئەگەر کەسێك شتێکی سپاردە کەسێك بـەڵام داوای کردەوە دەبێ نەیگێڕێتەوە؟ فەرمووی: نەخێر دەبێت بیگێڕێتەوە، ئینجا هـەواڵی وەفـاتی منداڵەکـەیانی پێگەیانـدو ئامۆژگـاری کـرد کـەئارام بگرێـتو چاوەڕێی پاداشت بێت!!

ئـەبو تەلحـە چـوو بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) چـی ڕوویـدابوو پێـی وت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتـە شـەوەکەتانەوە.

خـوای گـەورە دوعاکـەی قبـوڵکرد، مناڵیـان بـوو، ئـوم سـلیم مناڵەکـەی هێنایـە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) خورمای کرد بەدەمیەوە، دوایی هەندێکی کردە دەمـی مناڵەکەو ناوینا (عەبدوڵا) پیرۆزی کەوتە ژیانی ئەو منداڵەوە حەوت کوڕی بـوو هەموویان قورئانیان لەبەرکرد.

# «سەرەتای موسیبەت»

ژنێك كوڕێكی هەبوو، كوڕەكەی وەفاتیكرد ژنەكە چوو بۆ گۆڕستان لەلای گۆڕی كوڕەكەی دانیشتو زۆر بەكوڵ كەوتە گریان، وەزۆر دەگریاو هاواری دەكرد، پێغەمبەری خوا لەگەڵ كۆمەڵێك لەهاوەڵان بەلایدا ڕۆیشت كەبینی ئافرەتەكە خەریكە ناشكوری دەكات، فەرمووی: (لەخوا بترسەو ئارام بگرە)

بەڵام ژنەكە پێغەمبەری نەدەناسی، بۆیە وەڵامی فەرمایشتەكەی نەدایەوە وتی: لێم دوور بكەوەرەوەو وازم لێبهێنە!! ئەوەی تووشی من بووە، تووشی تۆ نەبووە!! پێغەمبەر وازی لێهێناو ڕۆیشت.

پیاوێك هات بۆلای وتی: ئەوە نەت ناسی، ئەوە پێغەمبەری خوا بوو؟ وتی: بەڕاستی نەمناسی، ئیتر هەستی بەخەجاڵەتیو شەرم كردو بەپەلە ڕۆیشت بۆ عوزر هێنانەوە، كاتێ لەماڵیان نزیك بۆوە هیچ پاسەوانی نەبینی، چووە خزمەتی، وتی: داوای لێبوردن دەكەم ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی نەمناسیت.

پێغەمبەر بۆی ڕوونكردەوە كەخۆڕاگربێت بەتەواوەتی تاپاداشتی نەفەوتێ، مرۆڤ دەبێت خۆڕاگربێت كاتێك دەكەوێتە ناو تاقیكردنەوەیەكەوە وەپێی فەرموو: (بەڕاستی خۆڕاگری لەسەرەتای بەڵای گەورەدا دەبێت). (البخاري و مسلم)

# ﴿ئارامگری و بەزەیی﴾

کاتێـك پێغەمبــەر (ﷺ) لەگــەڵ هەنــدێ لــە هــاوەڵان چــون بــۆ لای ئیبراهیمی کوڕی، لەوکاتـەدا لـەکاتی گیانکێشاندا بـوو، پێغەمبـەر (ﷺ) دەسـتی کرد بەگریان هەتا لەچاوە پیرۆزەکانی فرمێسك دەهاتە خوارێ هەندێ لەهاوەڵە بــەڕێزەکان گومانیــان وابــرد کــەگریانو غــەمباری نیشــانەی خۆڕانەگرتنــە، (عەبــدولرەحمان کــوڕی عــەوف) فــەرمووی: تــۆش ئــەی پێغەمبــەری خــوا؟! پێغەمبـەر فـەرمووی: ئـەی کـوڕی عـەوف ئەمـە بەڕاسـتی سـۆزە، چـاو فرمێسـك دەڕێـژێ، دڵ غـەمبار دەبـێ، ئەمـە واتـای ئەوەنیـە ڕازی نـەبین بەویسـتی خـوای گەورە، بەڵام لەجیابوونەوەت ئەی ئیبراهیم هەموومان خەفەت بارین.

وەڕۆژێکیان کچێکی پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کە منداڵێکمان وەفاتی کردووە، پێغەمبەر نێردراوەکەی ناردەوە بـۆلای پێـی فـەرموو: سەلامت لێدەکات وەپێی بڵێ: هـەمووی هی خوایـە ئـەوەی دەیبەخشێ، ئـەوەی دەیباتــەوە، وە هــەموو شــتێك لای خــوای گــەورە مــاوەی بۆدیــاری کــراوە بۆیــە خۆڕاگربەو چاوەڕێی پاداشتی خوای گەورە بکە. (البخاري و مسلم).

# «پێش لێپرسینەوە»

لەڕۆژی قیامەتدا کاتێك خەڵکی کۆدەکەنەوە بۆ ئەوەی پرسینەوەیان لەگەڵ بکرێ لەسەر کردەوەکانیان، بانگ بێژێك بانگ دەکات کوا ئەوانەی ئارامگرن با بەبێ لێپرسینەوە بچنە بەهەشتەوە؟!!

کۆمەڵێك لەخەڵکی هەڵدەسن فریشتەکان، پێیان دەڵێن بۆ کوێ دەچن؟ دەڵێن: دەچین بۆ بەهەشت! فریشتەکان پێیان دەڵێن: پێش ئەوەی حسابتان لەگەڵ بکرێت؟! شتی وا چۆن دەبێت؟!

دەڵێن: بەڵێ، فریشتەکان پێیان دەڵێن ئێوە کێن؟

دەڵێن ئێمە دەستەی ئارامگرانین.

فریشتەکان دەڵێن: خۆڕاگریتان لەسەر چی بوو؟ دەڵێن: ئێمە خۆڕاگربووین لەسەر خواپەرستی، وەخۆڕاگر بووین لەسەر نەکردنی تاوان.

فریشتەکان دەڵێن: چۆنتان وت وابوون، بچنە بەهەشتەوە باشترین پاداشت بۆ ئێوەیە، مژدەتان لێ بێت، فەرموودەی خواش شاهیدی ئەمەیە کەدەفەرموێت: (ئێمە پاداشتی خۆڕاگران دەدەین بەبێ ژمارە).

# «ئارامگری و شەرم»

جارێکیان هاوەڵی بەڕێز (عەبدولاّ کوڕی عەباس) (ﷺ) دەرۆشت لەگەڵ قوتابیەکەی عطاء کوڕی أبی رەباح، عەبدولاّ وتی: ئایا دەتەوێ ئافرەتێکی ئەهلی بەهەشتت پیشان بدەم؟ وتی: بەڵێ، بۆیە ئیبن عباس ئامـاژەی کـرد بۆ ژنێکی گەورەی ڕەش‌و درێژ وتی: ئەمە ئەو کەسەیە. دوایی ڕۆیشتن بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، بەڕاستی ئەمە یەکێکە لەهاوەڵـە پاکـەکان خـوای گـەورە تووشـی نەخۆشییەکی کردووە، ئـەویش سەرئێشە بـوو، هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) وتـی: بەڕاسـتی (صـرع) واتـە: سەرئێشـەیەکی گـرانم لەگەڵدایـە، لەوکاتـەدا مـن جەستەم دەردەخەم داوای نزا دەکەم لای خوای گەورە بۆم بکەی تاچاك ببمـەوە، پێغەمبـەر پێـی فـەرموو: ئەگـەر دەتـوانی ئـارام بگـرە تابـە بەهەشـت شاد بیـت، ئەگـەر دەتـەوێ نـزات بـۆ دەکـەم تـاخوای گـەورە چـاکت بکاتـەوە) ژنـە چاکەکە خـۆڕاگری هەڵبـژارد لەسـەر نەخۆشـیەکە، مـادەم پاداشـتی بەهەشـت بـوو، وتـی: خۆڕاگردەبم، بەلاّم نزام بۆ بکـە کاتێـك سـەر ئێشـەکە لـێم دەدات‌و ئاگام لـەخۆم نامێنێ، جەستەم دەرنەخەم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نزات بۆ دەکـەم کـەئیتر لاشەت دەرنەکەوێ. بۆیـە ئافرەتەکـە خـۆڕاگر بـوو لەسـەر نەخۆشـیەکەی، بـەلاّم شەرم‌و حەیاکەی وایلێکـرد لاشـەی دەرنەکـەوێ بۆیـە داوای لـە پێغەمبـەر (ﷺ) کرد تانزای بۆ بکات جەستەی دەرنەخات هەروایە مرۆڤی باوەڕدار بەردەوام زۆر خۆڕاگرو زیندووە.

# «وانەیەك لە ئارامگرتن»

دەگێڕنەوە کە عروە کوڕی زوبێر (ﷺ) یەکێك لە قاچەکانی تووشی نەخۆشیەکی ترسناك بوو، پزیشەکەکان وتیان: دەبێت ئەو قاچە تووش بوومت بپڕێتەوە، ئەگەرنا هەموو لاشەت تووشی ئەو نەخۆشیە دەبێت!!

کاتێك پزیشکەکان قاچیان بڕیەوە خۆڕاگرو سوپاس گوزار بوو وەلەو کاتەدا دڕندەیەك یەکێك لە کوڕەکانی لەناوبردو مرد، کاتێك عروە پێی زانی وتی: ئەی خوای گەورە، ئەی پەروەردگار من چوار پەلم هەبوو تۆ دانەیەکت بردەوە، سیانم بۆمایەوە، سوپاس بۆ تۆ، وەچوار کوڕم هەبوو یەکێکیانت بردەوە، وەسیانم بۆ مایەوە سوپاس بۆتۆ، ئەگەر برتەوە بۆشت هێشتوومەتەوە، وەئەگەر تووشی نەخۆشیت کردم چارەسەرت کردم، هەروەها عروە نموونەیەکی جوانی سەرنج ڕاکێشی پێشکەش کردین لەو ئازارانەی تووشی بوو وەئەم زۆر خۆڕاگربوو هەندێك لەلاشەی تووشی بڕینەوە بوو خۆڕاگربوو یەکێك لەکوڕەکانی مرد خۆڕاگربوو.

بەڕاستی ئەمە یەکێکە لەوانە کە فەرمایشتی خوای گەورە دەیانگرێتەوە.

(ئەوانەی تووشی بەلادەبن‌و دەڵێن: ئێمە خۆشمان هینی خواین‌و دەگەڕێینەوە بۆلای خوای گەورە، ئەوانە میهرەبانی خوایان لەسەرە، بەرسۆزی ئەو کەوتوون وەئەوانە ڕێنموونی کراون واتە سەرکەوتوون).

# «ئارامگری لەسەر خواپەرستی»

لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕۆژگیران ڕوویدا، پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانی نوێژی ڕۆژگیرانیان ئەنجامداو پیغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی درێژ کردەوەو زۆر بەپێوە ڕاوەستاو قورئانی خوێند، پاشان چووە ڕکوع‌و پاشان هەستایەوە، ئینجا چووە سوجدەو لەهەر دوو ڕکاتەکەدا بەوشێوەیە بوو.

خاتوو ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (ﷺ) لەگەڵ ئافرەتانداو لەپشتی پێغەمبەرو یارانەوە نوێژی دەکرد، ئافرەتێکی پیر لەملاو ئافرەتێکی نەخۆش لەولای بوو، خاتوو ئەسماء هەستی بەماندوو بوون کرد کەزۆر بەپێوە ڕاوەستا، بیری لەو ئافرەتە بەتەمەنەی ئەملای کردەوە کەلەو بەتەمەنتر بوو، چۆن ئارامدەگرێت لەو نوێژە درێژەدا، ئینجا بیری لەو ئافرەتە نەخۆشەی ئەملای کردەوە کەچەند نەخۆش‌و لاوازە کەچی ناجوڵێت‌و ئارامدەگرێت‌و ماندووبوونی پێوە دیارنییە، لەدەرونیدا خاتوو ئەسماء بەخۆی وت: من لەپێشترم بۆ ئارامگرتن لەسەر نوێژو خواپەرستی لەو دووئافرەتە.

لەبەرئەوە بڕیاریدا ئارامبگرێت‌و بەپێوە بمێنێ.

# ﴿نزایەکی وەرگیراو﴾

ئوم سەلەمە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستوومە فەرموویەتی: (هەرموسوڵمانێك تووشی بەڵایەك بێت بڵێت: ئێمە لای خوا هاتووین، دەگەڕێینەوە بۆلای ئەو: ئەی پەروەردگار یارمەتیم بدە لەم بەڵایە وەلەبری ئەو باشترم پێ ببەخشە، خوای گەورە پاداشتی بەڵاکەی نافەوتێنێ لەو بەخششە باشتری پێدەبەخشێت.

دەفەرموێ: منیش بەباشی لەبەرم کردو لەدوای ماوەیەك مێردەکەم (ئەبو سەلەمە) مرد (ﷺ) ئەم ووت: ئایا چ موسوڵمانێك هەیە لەئەبی سەلەمە باشتر بێت، خۆڕاگر بووم داوای پاداشتم لەخوای گەورە کرد، وەنزام کرد بەو نزایەی پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ کردبووم، لەدوای ئەوەی چوار مانگ و دەڕۆژ ڕۆیشت بەسەر مردنەکەیدا، شوومکرد بەپێغەمبەری خواوە منداڵەکانی بۆ بەخێوکردم، دەیووت: چۆنی فەرموو پێغەمبەری خوا وام وت: خوای گەورەش لەو باشتر پاداشتی دامەوە کەئەویش پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو، هەربۆیە (ئوم سەلەمە) بووە خێزانی پێغەمبەر، بووە دایکی باوەڕداران ئەمەش بەبەرەکەتی ئارامگری. (مسلم).



## لەکۆتاییدا:

خۆڕاگری وشەیەکی جوانە، دەڕژێتە ناو دڵەکانەوە ئارامیو جێگری پێ دەبەخشێ، وەبەهێزو دامەزراوی دەکات.

هیچ شتێك نیە ئەوەندەی خۆڕاگری خورەوشتی موسوڵمان بڕازێنێتەوە.

وەدەبێتە توێشوویەك لەسەر بەردەوام بوون لەژیانـدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (ئەو بڕوادارەی تێکەڵ بەخەڵکی بێت وەخۆڕاگر بیت لەسەر ئازارەکانیان پاداشتی باشترە لەو بڕوادارەی تێکەڵ بەخەڵکی نەبێ وەخۆڕاگر نەبێ لەسەر ئازارەکانیان، وەکاتێك ئەم چیرۆکانە دەخوێنینەوە لەم بەشەدا دەوەستینو بیر دەکەینەوە، دەبێت چاو لەوان بکەین هەتا لەگەڵیان بین، وەلەپاشە ڕۆژدا لەکۆمەڵی ئەوان بین.

پێویستە هەموو موسوڵمانێك زۆر سوربێت لەسەر خۆڕاگری وەبە بەردەوامی بیکاتە خورەوشتی، خوای گەورە دەفەرمووێ: (ئێمە ئێوە تاقیدەکەینەوە بەترس، وەبرسێتی، وەکەم بوونەوەی بەرو بوومو مردنی ئازیزانتان مژدەبێ بۆ خۆڕاگران ئەوانەیکاتێك تووشی ئەم بەلآیانە دەبن دەڵێن ئێمە هی خواین وەدەگەڕێینەوە بۆلای خوای گەورە بەڕاستی ئەوانە سۆزو میهرەبانی خوای گەورەیان بەرکەوتووە، وەبەڕاستی ئەوانە ڕێنمونی کراون. البقرة ١٥٥-١٥٧.

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی دادپەروەری

ئامادەکردنی

هیام عەباس + مەحەمەد مەحمود القازی

وەرگێڕانی

ئومێد عومەر باوەمردەیی

# ﴿داد پەروەری ( العدل ) ﴾

العدل: واتە هاوسەنگی و ڕێك وەستان و خوارو خێچ نەبوون،دادپەروەری دژی خوارو خێچی و لاری ولاسەنگی یە،هەروەها واتە:بڕیاردانی ڕاست و دروست.

★خوای گەورە ناوی (العدل) واتە: لە بڕیاردانـدا مەیلی بۆ هەواو ئارەزوی ستەم نی یە،(دادپەروەرە)

★هەرکەس بیەوێت لەدادپەروەری خوا بەتەواوی تێبگات دەبێت ئاگاداری زانستی پەروەردگار بێت،بۆیە پێویستە باوەڕ بە داد گەری فەرمانەکانی خوا بهێنی بێ ئەوەی ڕەخنە بگریت،چونکە مرۆڤ ئاگاداری زانستی پەروەردگار نی یە.(قل أأنتم أعلمُ أم الله).

★دادپەروەری لە هەموو بوارێکی ژیاندا پێویستەو فەرمان پێ کراوە.

-دادپەروەری لە نێوان ژن وپیاو لەجێ بەجێ کردنی واجبات و فەرمانە خواییەکان و پاداشت و سزادا.

-دادپەروەری لە نێوان هاوسەر ئەگەر لەیەك زیاتر بوون.﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا﴾(النساء ٣).

—دادپەروەری لە نێوان منالّ دا لەبەخشین و وەصیەت و.....(فاتقوا الله واعدلوا بين أولادكم)

-دادپەروەری لە نێوان ڕەگەزە جیاوازو زمانە جیاوازەکانی مرۆڤایەتی دا.

-دادپەروەری لە نێوان کەسانێك کە کێشەو گرفت لە نێوانیاندا هەیە.(وإذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل))

-دادپەروەری لە نێوان مرۆڤەکاندا بەبێ سەیرکردنی ڕەگەزو دین و مەزهەب.....

-دادپەروەری لە باسی خەڵك و هەڵسەنگاندن دا.﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾(المائده ٨).

*فەرمانەکانی خوا هەمووی ڕاست و دادپەروەرانەیە﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾(الانعام ١١٥).

*خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەران و هەموو مرۆڤایەتی کردووە بەم سیفاتە.﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ﴾(النحل ٩٠)

﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ﴾(النساء ٥٨ )

﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟﴾(الانعام١٥٢).

*پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (إن المقسطين عندالله على منابر من نور عن يمين الرحمن –عزوجل-وكلتا يديه يَمين،الذينَ يَعدلون في حُكمهُم وَاهلِهم وما ولوا)مسلم.

واتە:دادگەران لای خوا لەسەر مینبەری نورن لەلای ڕاستی پەروەردگار ئەوانەی دادپەروەرن لەبڕیارو خێزان و منداڵ و هەر کەسی تر کەلەلای ئەوانە بن.

*(إن احب الناس الى الله يوم القيامة وَأدناهم ميهِ مجلِساً :امام عادل.وَابغَض الناس الى الله وَأبعدهُم مِنهُ مجلساً :إمام جائر)الترمذي(حديث حسن)

واتە:خۆشەویسترین کەس و نزیکترین کەس لە خواوە پێشەواو کار بەدەستی دادپەروەرە.

(إن من اعظَم الجهاد كلِمة عدلٍ عند سلطان جائر)الترمذي وابوداود.

*ئیبن تەیمیه دەڵێت:(بالصدق في كل الأَخبار ،وَالعدل في الأَنشاء مِن الاقوال وَالأَعمال تصلح جميع الأَعمال وهُما قرينان كما قالَ الله تعالى:﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً ﴾(الانعام١١٥).

هەروەها دەڵێت:(کاروباری خەڵك لە دنیادا بەدادپەروەری ڕادەوەستێ باشترە لەوەی بەستەم و ماف خواردن بێت وەك وتراوە :(الدنيا تدوم مع العدل والكفر ولا تدوم معَ الظلم وَالاسلام).

واتە:دنیا بەردەوام دەبێ بە دادپەروەری با کافریش بن ،بەلاَم بە زوڵم و ستەم بەردەوام نابێت ،با موسوڵمانیش بن.

شاعیر دەڵێت:

فلم أر مثلَ العدل للمرء رافعاً ولم أر مثلَ الجَور للمرء واضعاً

## ﴿دادپەروەری ئەبوبەکر (ﷺ)﴾

ڕۆژێکیان پێشەوای موسوڵمانان (ﷺ) بانگەوازی کرد کەچەند حوشترێك بەخێر دابەش دەکرێ، بەیانی دوای نوێژی بەیانی، هیچ کەس نەچێتە ژوورەوە تاڕووخسەت وەرنەگرێ.

ژنێك بەپیاوەکەی وت ئەم گوریسە بگرە بەڵکو حوشترێکی پێ ببەستیتەوە، بەڵکو خوای پەروەردگار حوشترێکمان بەنسیب بکات.

کاتێك پیاوەکە گوریسەکەی برد لەکاتی دیاریکراودا گەیشت بەخزمەت ئەبوبەکرو عومەر (ﷺ) چوونە ژوورەوە بۆ ئەو شوێنەی حوشترەکانی لێ حەپسکرابوو، پیاوەکەش لەدوای ئەوانەوە چووە ژوورەوە، کاتێك حەزرەتی ئەبوبەکر پیاوەکەی بینی گوریسەکەی لێ وەرگرت‌و پیایدا کێشا.

لەدوای ئەوەی لەدابەشکردنی حوشترەکان تەواو بوو، پیاوەکە داوای گوریسەکەی کردەوە، بۆیە گوریسەکەی دایەوە پێی وت: تۆڵەی خۆت بکەرەوە، چۆن لێمدای ئاوا لێم بەرەوە، عومەر (ﷺ) سوێند بەخوا ناهێڵم تانە بێتە پێشەنگێك خەڵکی چاوی لێ بکات.

ئەبوبەکر فەرمووی (ﷺ): چی هەیە لەڕۆژی قیامەتدا فریام بکەوێ؟

عومەر وتی: دەی باشە ڕازی بکە، ئینجا ئەبوبەکر فەرمانی کرد کە وشترێکی بدەنێ لەگەڵ زین‌و پێداویستیەکانی‌و پارچەیەك قوماش‌و پێنج دینار، بەوەش کابرای ڕازی کردو لێی خۆش بوو.

## ﴿خانووەکەی عەبباس (رضي الله عنه)﴾

دەگێڕنەوە عەباسی کوڕی عەبدول متەلیب (رضي الله عنه) خاوەنی خانوویەك بوو بەتەنیشت مزگەوتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) عومەری کوڕی خطاب ویستی مزگەوتەکە فراوان بکاتو خانووەکەی لێ بکڕێ، بەڵام ئەو پێی نەفرۆشتو پێی نەبەخشی هەتا مزگەوتەکەی پێ فراوانت بکات، عومەر زۆری لێکرد دەبێت یەکێکیان جێبەجێ بکەی، بەڵام عەباس ڕازی نەبوو، بۆیە داد وەریەکەیان بردە لای ئوبەی کوڕی کعب (رضي الله عنه) ئەویش بەعومەری فەرموو: نابێت لەو خانووەی خۆی دەرکەی هەتا ڕازی نەبێ، عومەر فەرمووی: هۆی چییە تۆ وا دادگەری دەکەی؟ ئوبەی فەرمووی: لە پێغەمبەری خوام بیستووە فەرموویەتی: کاتێك سلێمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) خەریکی دروستکردنی بیت المقدس بوو هەرکاتێك چینێك دیواری دروست دەکرد، بەیانی ڕووخابوو، خوای گەورە نیگای بۆ نارد هیچ دیوارێك دروست نەکات لەمافی خەڵکی تا خاوەنەکەی ڕازی نەکات، کاتێك عومەر ئەم فەرمایشتەی بیست وازی لەخانووەکەی هێنا، ئینجا عەباس (رضي الله عنه) خانووەکەی کرد بەخێر بۆ موسوڵمانان تا مزگەوتەکەی پێ فراوان بکەن.

## ﴿حەوت بەش﴾

ڕۆژێك لە ئەصفەهانەوە ماڵو سامانێکیان هێنا بۆلای پێشەوای موسوڵمانان عەلی کوڕی ئەبو طالب (رضي الله عنه) ئەوانەی شایستە بوون بەوماڵە کۆیکردنەوە هەموویان حەوت کەس بوون.

پێشەوا عەلی (رضي الله عنه) ماڵەکەی کرد بەحەوت بەش، نانێك مایەوە، ئەویشی کرد بەحەوت کەرتەوەو لەسەر هەربەشێك پارچەیەك لەو نانەی دانا.

# «ناوداریك دزی دەكات»

ژنێكی مەخزومی دزی دەكات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەزانێ بەكارەكەی بۆیە فەرمان دەفەرموێ: یاسای لەسەر جێبەجێ بكرێ بەدەست بڕینەوە.

بەلاَم ئەم ژنە لەبنەماڵە ناودارەكانی قورەیش بوو، بۆیە هۆزی قورەیش كۆبوونەوە تا یاساكەی لەسەر جێبەجێ نەكرێ، ئەم كارەیان بردە لای ئوسامەی كوڕی زەید (ﷺ) تابچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونی بۆ بكات، (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئوسامەی خۆش دەویست).

بەلاَم كاتێك ئوسامە چووە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و باسەكەی كردەوەو تكای بۆ ئافرەتەكە كرد، پێغەمبەر (ﷺ) تووڕە بوو فەرمووی بەئوسامە: ئایا تۆ تكادەكەی بۆ كەسێ كە سنوری خوای بەزاندبێ‌و داوا دەكەی یاسای لەسەر جێبەجێ نەكرێ!؟ بۆیە تەشریفی موبارەكی هەستاو وتارێكی فەرموو: خەڵكینە هۆی لەناوچوونی گەلانی تر ئەوە بوو كاتێك بەرێزو ناودارێكیان دزی بكردایە وازیان لێدەهێنا، بەلاَم ئەگەر هەژارو بێ كەسێك بوایە یاسایان لەسەر جێبەجێ دەكرد، سوێند بەخوا ئەگەر بێت‌و فاتمەی كچی محمد (ﷺ) دزی بكات محمد دەستی دەبڕێتەوە.

# «دادپەروەری پێغەمبەری خوا (ﷺ)»

پێغەمبەری خوا (ﷺ) خورمای پیاوێك قەرزار بوو لەهۆزی بەنی سەعد، ڕۆژێك کابرا هاتە خزمەتیو داوای کردەوە، بەڵام حەزرەت ئەوەندەی نەبوو قەرزەکە بداتەوە، بۆیە داوای لەپیاوێکی ئەنصاری کرد کە هەندێ خورمای بۆ بێنێتەوە تا قەرزی کابرا بداتەوە، کەهێنای کەمتربوو لەئەندازەی مافی خۆی، کابرای ئەنصاری بەپیاوەکەی وت: ئایا فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەتدەکەیتەوە؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ، وتی: ئایا هەیە لە پێغەمبەری خوا دادپەروەرتر بێت؟؟

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) چاوە پیرۆزەکانی پڕبوو لەفرمێسك فەرمووی: ڕاست دەکات کەس نیە لەمن دادگەرتر بێت، ئینجا فەرمووی:

خوای گەورە گەلێك بەپیرۆز نازانێ کە لاوازەکان مافی خۆیان لەبەهێزەکان وەرنەگرنو ئەوانیش لاوازەکان ماندوو بێتاقەت بکەن.

بۆیە پیاوێکی نارد بۆ ماڵی خەولە کچی قەیس خێزانی حەمزەی کوڕی عەبدولمتەلیب (ﷺ) تاخورمای بۆ بێنێو قەرزەکەی بداتەوە کاتێ خورماکەیان بۆ هێنا بەباشترین شێوە قەرزەکەی دایەوە.

# «بەندەیەکی چاك»

ڕۆژێك فەیروزی دەیلمی چووە خزمەت پێشەوای ئیمانداران عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) بەلاّم گەنجێك لە قورەیش ڕێی لێگرت و بێزاری کرد تائەو پێش بکەوێ بۆیە فەیروز دەستی بەرزکردەوە دەستی دا بەلووتی گەنجەکەدا، گەنجەکە هاتە خزمەت عومەر خوێن لەلووتی دەهات باسی ڕووداوەکەی بۆ عومەر کرد، پێشەوا فەرمووی: ئایە وابووە یا فەیروز؟ فەرمووی: بەڵێ وابووە، بۆیە عومەر ئەمری فەرموو بەتۆڵەکردنەوە.

فەیروز لەسەر ئەژنۆی دانیشتوو فەرمانیدا بەگەنجەکە بەتۆڵەکردنەوە، پێشەوا عومەر فەرمووی: بۆستە پەلەمەکە ڕۆژێکیان گوێم لێبوو پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ئەمشەو (الاسود العنسی) درۆزن بەدەستی پیاوێکی چاك کوژرا، ئەویش فەیرۆز بوو، بەڕاستی بەندەیەکی چاکە کاتێك ئەم گەنجە بیستی کە پێغەمبەری خوا وەسفی کردووە بەپیاو چاك، بڕیاریدا بە لێخۆشبوونی، فەیرۆزیش شمشێرەکەو ولاّخەکەی و سێ هەزار درهەمی دابە گەنجەکە، پێشەوا عومەر فەرمووی: ئەی برای قوڕەیش، لێبوردیت و پاداشتی خوات بەدەست هێناو ماڵو سامانیشت پێ بەخشرا.

## «لێدانێك‌و حەج کردنێك»

ڕۆژێکیان پێشەوا عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) تەشریفی بردە بازاڕ تا چۆنیەتی ژیانی خەڵکی بزانێت، گۆچانێك بەدەستیەوە بوو سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ﷺ) لەناو شەقامەکەدا دەڕۆی عومەر بەسووکی گۆچانەکەی پێدا کێشا پۆشاکەکەی بەری گرت‌و دڕانی، وەفەرمانی پێدا کەلە کەناری شەقامەکەوە بڕوات.

ساڵی داهاتوو عومەر لەهەمان شوێندا گەشتەوە بە سەلەمە فەرمووی: ئەی سەلەمە دەتەوێ حەج بکەیت؟ وتی: بەڵێ ئەی پێشەوای ئیمانداران، بۆیە عومەر دەستی گرت‌و بردی بۆ خانووەکەی خۆی (٦٠٠) درهەمی پێبەخشی فەرمووی: بۆ مەسرەفی حەجەکەت سەرفی بکە بەهۆی ئەو لێدانە سوکەوە ئەمەم پێبەخشیت کە ساڵی پار لەو جێگەیەدا جل‌و بەرگەکەتم دڕاند!!

سەلەمە فەرمووی: پێشەوای باوەڕداران بەڕاستی من هەربیرم نەماوە، پێشەوا عومەر فەرمووی: منیش بیرم نەچۆتەوە!

## «دادگەری لەنێوان منداڵەکاندا»

هاوەڵی بەڕێز بەشیری کوڕی سەعد (ﷺ) ویستی شتێك ببەخشێت بەیەکێك لەکوڕەکانی، هاوسەرەکەی (عومەرەت کچی ڕەواحە) نەیهێشت کوڕەکەی وەریبگرێت هەتا نەچێتە خزمەت پێغەمبەر تا ئەو ڕازی بێ‌و شاهیدیش بێت.

کاتێك چووە خزمەت پێغەمبەری خوا تائاگادار بێت لەو بەخشینە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەموو کوڕێك هێندەت پێداوە؟ بەشیر وتی نەخێر.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەخوا بترسن وەدادگەر بن لەگەڵ منداڵەکانتاندا.

ئینجا بەشیر پەشیمان بۆوە لەدیارییەکەی، بۆ ئەوەی فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جێبەجێ بکات‌و دادپەروەر بێت لەنێوان منداڵەکانیدا.

## «گەڕاندنەوەی ئەو شتانەی بەستەم وەرگیراون»

کاتێـك عومــەری کــوڕی عەبدولعــەزیز (ﷺ) بــوو بەپێشــەوای موســوڵمانان، فەرمانیکرد کەبانگەواز بکرێت هەرکەسێك ستەمی لێکراوە با داوابەرز بکاتەوە بۆ پێشەوای موسوڵمانان، ڕۆژێکیان عەباس کوڕی ولیدی کوڕی عەبدولمەلیك دانیشتبوو، پیاوێك هاتە ژوورەوە لەگاورەکانی شاری (حمص) بوو، سەرو ڕیشی سپی بوو، وتی داوادەکەم ئەی پێشەوای ئیمانداران کەکتێبی خوام بۆ بێنی، فەرمووی: بۆچیتە؟ وتی: عباسی کوڕی ولید کوڕی عەبدولمەلیك زەوییەکی لێ داگیرکردووم!

بۆیە عومەر بەعەباسی فەرموو: تۆ چی دەڵێی فەرمووی: پێشتووتر مافی خۆیم پێداوە هەتا عەقدم لەگەڵ نوسییووە، عومەر فەرمووی: کابرا تۆچی دەڵێیت؟ وتی: ئەی پێشەوای ئیمانداران من پەرتووکی خوام دەوێت، عومەر فەرمووی: پەڕاوی خوا لەپێشترە بەگوێڕایەڵی نوسراوی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك، ئەی عەباس مافەکەی بۆ بگێڕەوە، ئەویش بۆی گێڕایەوە.

## «کوڕی دوو ڕێزلێگیراو»

پیاوێك لەشاری میصرەوە هات بۆ خزمەت پێشەوای موسوڵمانان عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) سکاڵای لەکوڕەکەی عەمری کوڕی عاص (ﷺ) کرد کەستەمی لێکردووە (عەمر والی میصر بوو). وتی: لەگەڵ کوڕەکەی عەمردا پێشبڕکێمان کردو من پێشی کەوتم و بردمەوە، ئەویش کەوتە لێدانم بەقامچی و دەیوت: من کوڕی دوو ڕێز لێگیراوەکەم، چۆن تۆ پێشم دەکەویت؟! عومەر (ﷺ) نامەی بۆ عەمر ناردو فەرمانی کرد کە خۆی و کوڕەکەی لەلای ئامادەبن. کاتێ هاتنە خزمەتی عومەر (ﷺ) فەرمانیکرد بەکابرای میصری کە قامچیەك هەڵگرێ و لەکوڕەکەی عەمر بداتەوە، ئەویش کەوتە لێدانی تا ئامادەبووان خوازیاربوون کەواز بهێنێ لەلێدان، پاشان پێشەوا عومەر (ﷺ) ڕوویکردە عەمرو پێی وت: لەکەیەوە خەڵکیتان کردووە بەکۆیلە، لەکاتێکدا ئەوان بەئازادی لەدایك بوون؟! عەمر وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران من ئاگام لێ نەبووەو نەشهاتووە بۆلای من.

# «دادگەری و پارێزراوی»

ڕۆژێک نێرراوێکی پاشای رۆم هات بۆ دیداری پێشەوا (عومەری کوڕی خطاب)، چووە مەدینەو لەڕێگەکاندا پرسیاری لەخەڵك دەکرد کە کۆشکی پاشاتان لەکوێیە؟ خەڵك وتیان: خەلیفە (عومەر کوڕی خطاب) لەکۆشکدا ناژی و پارێزەریشی نیە، ئینجا چەند کەسێك لەگەڵ کابرا ڕۆشتن تا گەشتنە لای درەختێکی گەورەو ئاماژەیان بۆ کەسێکی خەوتوو کرد لەژێر درەختەکەدا وتیان: ئەوە پێشەوای موسوڵمانانە کە هەواڵی دەپرسی!

کابرا سەرسام بوو!! چۆن دەبێت کاربەدەست هێندە بێخەم و سادە بێت؟!

کەلەپێشەوا عومەر نزیك بۆوە بینی والەسەر زەوی نوستووەو عەباکەی کردووە بەسەرین، ئەوەندەی تر سەرسام بوو.

بەپێشەوا عومەری وت: من نێردراوی قەیصەرم بۆ لای تۆ واگومانم برد کەتۆش پاشایەکی وەك پاشاکانی ئێمەو کوشكو تەلارت هەیە، خەڵك لەدەورتن، پارێزگارت هەیەو بۆ هەرشوێنێك بچیت بەدواتەوەن، بەڵام بەڕاستی ئەی عومەر کاربەدەستێکی دادپەروەر بوویت، بۆیە وا بێخەمو ترس نوستویتو باکت نیە.

# «پۆشاکی عومەر»

جارێکیان کۆمەڵێك قوماش لەیەمەنەوە بۆ پێشەوای ئیمانداران عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) هات، بۆیە هەر پیاوێکی موسوڵمان بەشی تەنها یەك کراسی پێ بەخشی، دوایی بەشی خۆیی و عەبدوڵای کوڕی کرد بەیەك و تێکەڵی کردو لەبەری کرد.

کاتێك چووە سەرمینبەر وتاریدا بۆخەڵکی فەرمووی: ئەی خەڵکینە گوێڕایەڵ بن و ملکەچی فەرمانەکانم بن، پیاوێك هەستا لە موسوڵمانەکان وتی: نەگوێڕایەڵیت دەکەین! نە فەرمانت جێبەجێ دەکەین! پێشەوا عومەر فەرمووی: بۆچی؟ وتی: تۆ لەئێمە زیاتری؟ فەرمووی: بەچی؟ پیاوەکە وتی تۆ پیاوێکی کەلەگەتی، ئەو بەشە قوماشەش بەشت ناکات کەچی دەبینین کراسێکی تەواوت لەبەردایە بۆیە تۆ لەئێمە زیاترت بەرکەوتووە، پێشەوا عومەر بەعەبدوڵای کوڕی فەرموو: وەڵامی بدەرەوە، عەبدوڵا فەرمووی: من بەشە قوماشەکەی خۆم دا بەباوکم تاکراسەکەی پێتەواو بکات پیاوەکە وتی: ئێستا گوێڕایەڵیت دەکەین و فەرمانت جێبەجێ دەکەین.

# ﴿سوێندی دادپەروەری﴾

کاتێک پێشەوای ئیمانداران عومەری کوڕی خەتابو ئوبەیِ کوڕی کعب (ﷺ) کێشەیەك دەکەوێتە نێوانیانەوە دەچن بۆلای زەیدی کوڕی ثابت (ﷺ) هەتا دادگەری لەنێوانیاندا بکات، زەید زۆر رێزی لێگرتن، بەلأم جێگایەکی فراوانی بۆ عومەر دۆزیەوە کە جیاوازبوو تالێی دابنیشێ.

پێشەوا عومەر فەرمووی: ئەمە یەکەم ستەمی تۆیە کردت لەدادگەریەکەتدا دامنێ لەگەڵ هاوکێشەکەمدا هەردووکیان لەبەردەم زەید دانیشتن (ﷺ) ئوبەی باسی شتێکی کرد، بەلأم عومەر ئینکاری کرد (وەلەشێوەی ئەمکارەدا ئەوەی داوای هەیە دەبێت بەبەلگە بیسەلمێنێ وەئەوەی دەلێ وانیە دەبێت سوێند بخوات) بۆیە لەو کاتەدا زەید بەئوبەی فەرموو: خۆشبە لەپێشەوایِ بڕواداران لە سوێند خواردن، وتی: من هەرگیز بۆکەسی تر داوای وام نەکردووە، عومەر رەتیکردەوە وەسوێندی خوارد، دوایی هەستا بەتووڕەییەوە بەقازی وت: جیاوازیتکرد لەنێوان داواکارو داوالێکراودا، سوێندبێ ئیتر تۆ دادگەری نەکەی، هەتا عومەرو پیاوێك لەموسوڵمانان وەك یەك نەبن بەبێ جیاوازی.

# «نوسراوێك»

دەشتەکییەك هاتە خزمەت عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) چەند پارچەیەك لەقژو پرچەکەی بەدەستەوە بوو، عومەر فەرمووی: ئەمە چییە؟ وتی: هاتووم سکاڵای خۆم لەخزمەت تۆدا بکەم، لەدەستی لێپرسراوەکەمان (ئەبو موسی الاشعری) عومەر فەرمووی: چی کردووە؟ کابرا وتی: مافی تەواوەتی نەدامێ چەند جار چووم بۆلای بەلأم کەمی پێدام، منیش وەرم نەگرت، کەچی بیست جەڵدی لێدام وەپرچی بڕیم، ئەوەتا لەناو ئەو پارچە قوماشەدایە کەلاتە!!

عومەر زۆر خەفەتی خوارد، ناردی بۆلای ئەبی موسا کەدەبێت دانیشێ لەبەردەم کۆمەڵێك لە موسوڵمانان هەتا ئەو دەشتەکیە بیست جەڵدت لێبداتەوەو سەرت بتاشێ، کاتێك ئەبی موسا نوسراوەکەی خوێندەوە فەرمووی: بە دەشتەکیەکە هەستە فەرمانی عومەر جێبەجێ بکە قامچیەکی داپێی هەتا تۆڵەی خۆی بکاتەوە وەقژی ببڕێ، کابرا زۆر بەمکارە سەری سوڕما!! کەچۆن سەرکردەیەك گوێڕایەڵی فەرمانی گەورەی موسوڵمانان دەکات، بۆیە بەشاهیدی ئامادەبووان لەئەبو موسا خۆش بوو، وتی: هیچ کەسێك نیە ستەمی لێبکرێ کاتێك عومەر پێشەوای بڕواداران بێت.

# ﴿دادپەروەری و لێبوردن﴾

ڕۆژێك ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) لەگەڵ ڕەبیعەی ئەسلەمی گفتووگۆی دەکرد، گفتووگۆکەیان توند بوو، ئەبوبەکر (ﷺ) قسەیەکی توندی ڕەبیعە وت: پاشان پەشیمان بۆوەو داوای لێبوردنی لەڕەبیعەکردو فەرمووی: قسەکەم پێبڵێرەوە تاماڤی خۆت وەربگریت، ڕەبیعە (ﷺ) وتی: واناکەم، چونکە تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوایت (ﷺ).

ئەبوبەکر فەرمووی: ئەگەر وانەکەیت دەچمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، ڕەبیعە فەرمووی: ناتوانم شتیوا بکەم.

ئینجا ئەبوبەکر ڕۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، ڕەبیعە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن لەسەر وشەیەك لەدەمی ئەبوبەکر دەرچوو، منیش وەڵامی بدەمەوە هەرگیز ناتوانم شتی وا بکەم!!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چاکت کردنەی ڕەبیعە، بەڵام بڵێ، خوا لێت خۆشبێت ئەی ئەبوبەکر، ڕەبیعە قسەکەی فەرموو، ئەبوبەکریش (ﷺ) سوپاسی ڕەبیعەی کرد لەسەر ئەو هەڵوێستە جوانە.

## لە کۆتاییدا:

دادپـەروەری ڕەوشـتێکی بـەرزە، ناوێکـە لـەناوە پیرۆزەکـانی خـوای گـەورە، وەسـیفەتێکە لەسـیفەتە بـەرزەکان، خـوای پـەروەردگار فەرمانیـداوە بەهـەموو پێغەمبەرانو گشت پیاوچاکان کەدادگەر بن، دەفـەرموێ: خـوای گـەورە فـەرمانی بەدادپەروەریو چاکە دەدات. فەرموویـەتی: کاتێـك لەگـەڵ خەڵکیـدا دادگـەریتان کرد بەڕاستی دادپەروەربن. (النساء ٥٨).

دادپەروەری ئەوەتا مافی هەموو خاوەن مافێك بدەیت، زۆر جوانە ئەم خووە جوانـە لـەناو خەڵکدا بڵاوبێتـەوە، بەشـێوەیەك دەبێـت مێـرد لەگـەڵ خێزانیـدا دادپـەروەربێت، بـاوك لەگەڵ کوڕەکانیـدا، قـازی لـەکاتی بڕیـاردا دادپـەروەربێت، هەتا مافەکان بدرێن وەخەڵکی بەئاسودەیی بژین.

مرۆڤـی دادپــەروەر دوورە لەســتەمکردن، وەدەزانــێ ســتەمکردن تاریکیــە لــەڕۆژی قیامەتــدا، خــوای گــەورە ســتەمکاری خۆشــناوێ ئــەم چــیرۆکانەی خوێندمانەوە قسەکردن بوو لەدادپـەروەری زانیمـان چییە، بۆیـە وەری بگـرین بەپەندو ئامۆژگاری .

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی وەفاداری

ئامادەکردنی

موستەفا ئەحمەد عەلی

وەرگێڕانی

زانا کەریم

# ﴿وەفاداری ( الوفاء )﴾

الوفاء: واتە: تەواو کردن.

-مەبەست تەواو کردن و دامەزراندنی ئەوبەڵێن وپەیمانەیە کە مرۆڤ بڕیاری لەسەر دەدات.

راغب دەڵێت: وەفاداری بەپەیمان واتە:تەواو کردنی ئەو پەیمانەیەو پاراستنی ئەو شتانەیە کە خۆت بڕیارت لەسەر داوە.

*وەفاداری لەخواپەرستی داو لەگەڵ خوادا ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِيٓ أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّٰيَ فَٱرْهَبُونِ﴾(البقره ٤٠ ).

﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلْأَيْمَٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾(النحل ٩١ )

*وەفاداری لە کڕین و فرۆشتندا ﴿وَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۖ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰۖ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُواْۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾(الانعام ١٥٢ ).

*وەفاداری لەو پەیمانەدا کەلەکاتی شەڕو جەنگ دەنوسرێت(بەمەرجێك بەرامبەر وەفادار بێت وپەیمانەکە هەڵنەوەشێنێتەوە)﴿ فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾(التوبه٤).

★وەفاداری بەو عەهدو پەیمانەی مرۆڤ دەیدات بە کەسێکی تر﴿وَأَوْفُواْ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولاً﴾(الاسراء ٣٤).

★وەفاداری سیمای موسوڵمانە﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَـٰنَـٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ﴾(المؤمنون ٨).

★وەفاداری بەرامبەر پەیمانی خزمەت کردن و تێکۆشان لە پێناو بەرنامەی خوادا.﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَـٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبْدِيلاً﴾(الاحزاب: ٢٣).

★وەفاداری بە هەر پەیمان وگرێ بەستێك کە مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤێکی تر دەینوسێ یان ئەنجامی دەدات وەك پەیمانی شەریکایەتی وپەیمانی هاوسەری...﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوْفُواْ بِٱلْعُقُودِ ۚ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَـٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾(المائده: ١).

★پێغەمبەران(علیه السلام) وەفاداربوون وخواش ستایشیان دەکات.

﴿وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ﴾(النجم ٣٧ ).

﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ إِسْمَـٰعِيلَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَّبِيًّا﴾(مريم ٥٤).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (أحقُ ماأُقيتم مِنَ الشروط أن توفوا به بماإستحللتم بهِ الخروج)البخاري ومسلم.




واتە:ئەوەی کەلەهەموو شتێك لەپێشترو شایستە ترە بەجێ بە جێ کردنی مەرجەکانی ئەوەیە وەفادار بن بەرامبەر پەیمانی هاوسەری.

*یەکێك لەو کەسانەی خوای گەورە لە قیامەت گفتوگۆی لەگەڵ ناکات و پاکی ناکاتەوە لەگوناهو سزای سەختی هەیە،کەسێکە پەیمان بە پێشەواو ئیمامێك دەدات لەبەر سەروەت و سامانی دنیا.

(ورجلٌ بايعَ إماماً لايُبايعُهُ إلا لدنياهُ ،إن أعطاهُ مايُريدُ وَفي لَهُ ،وَإلا لَم يَفِ لَهُ)البخاري ومسلم.

*وتراوە: (إذا اردتَ أن تعرفَ وفاءَ الرجلِ ودوام عهدهِ ،فانظر الى حنينهِ الى أوطانهِ وتَشوقة الى إخوانهِ،وكثرةُ بكائهِ على ما مضى من زمانهِ)المستطرف (٢٩١)

واتە:ئەگەر دەتەوێت وەفای کەسێك بزانیت سەیری دڵسۆزی بکە بۆ خاکەکەی ،وە شەوقی بۆ براکانی وە زۆر گریانی لەسەر ژیانی بەزایە چوون.

إذا قلتَ في شيء (نعمَ) فأتمهُ فإن (نعمَ) دينٌ على الحرَ واجبٌ

وإلا فقل (لا)تَسترح وتُرح بها لئلا يَقول الناسُ إنكَ كاذِبٌ.

# ﴿وەفایەکی قەشەنگ﴾

پێش دەستپێکرنی جەنگی بەدر پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵاندا ڕاوێژی دەکرد لەبارەی کاروباری جەنگەکەوە، لەناو کۆچەریەکاندا ئەبوبەکرو عومەر (ﷺ) وتەی خۆیان بەجوانترین شێوە پێشکەش کرد.

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەیویست گوێی لە بۆچوونی ئەنساریەکانیش بێت، بەتایبەت کاتێ کەئەوان بەڵێنیان پێدابوو پشتگیری لێبکەنو بانگەوازەکەی سەربخەنو یارمەتی دەری بن.

ئەوەبوو لەناویاندا میقدادی کوڕی عەمر (ﷺ) هەستاو وتی:

ئەی نێردراوی خوا: لەسەر ئەو شتە بڕۆو بەردەوام بە کەلەلایەن خواوە فەرمانت پێکراوە، ئێمە لەگەڵتین، پەیمان بێت بجەنگین لەلای ڕاستو چەپو بەردەم و دواوەت تا پەروەردگار دەروی خێری خۆیت لێدەکاتەوە.

ئەوسا سەعدی کوڕی مەعاذ هاتە گۆو فەرمووی: ئەی نێردراوی خوا، بەڕاستی ئێمە ئیمانو باوەڕمان هێناوە بەتۆو بەڕاستگۆمان داناویتو پەیمانو گەواهی حەقو ڕاستیمان پێداویت لەسەر ئەو پەیامەی کەهێناوتە، فەرمانت بەچییە بیکە ئێمە لەگەڵتین؟!!

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر دڵخۆش بوو بەبۆچوونەکانیانو سەیری هات بەدڵسۆزیو وەفادارییان بۆ بەڵێنەکانیان.

# «خاوەن وەفاکان»

لەکاتێکدا کە هۆزە جیاجیاکان لەدوورەوە دەهاتن بەرەو مەککە بۆ مەراسیمی حەج، پێغەمبەر (ﷺ) قسەی بۆ دەکردن‌و بانگی دەکردن بۆ ناو ئاینی ئیسلام، یەکێك لەو هۆزانەی کەلە مەراسیمی سالێکدا هاتبوون کۆمەلێك بوون لە خەلکی مەدینە، پاش قسەکردن بۆیان پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردن بۆ ناو ئاینی ئیسلام‌و داوای لێکردن کە موسولمان بن، ئەوەبوو پەروەردگار سنگی گوشاد کردن بۆ ئیمان هێنان‌و باوەڕیان هێنا بە پێغەمبەر (ﷺ) پاشان خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: ئایا بەلێن دەدەن بەنێردراوی خوا؟

ئەوانیش وتیان: لەسەرچی شتێك بەلێنت پێبدەین؟

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:

لەسەر ئەوەی کەتەنها خوا بپەرستن‌و هیچ هاوەل‌و هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدەن، پێنج نوێژە فەرزەکان ئەنجام بدەن، داوای هیچ شتێك لەخەلکی نەکەن، ئەوەبوو هەموویان پەیمان‌و بەلێنیان داو زۆر ڕاستگۆو بەوەفاش بوون بەرامبەر بەلێنەکانیان.

تائەو ڕادەیەی کەوەختی وابوو ئەگەر قامچی یەکیان لەدەست بکەوتایە خوارەوە داوایان لەکەس نەدەکرد کەبیاندات‌ەوە دەست، چونکە ئەوان بەلێنیان دابوو کە داوای هیچ شتێك لەخەلکی نەکەن.



# «هاوسەرێکی بەوەفا»

دایکی ئیمانداران خەدیجە (ﷺ) ناوازەترین نموونەیە بۆ ژنی بەوەفا بەرامبەر بەمێردەکەی، چونکە ئەو کاتێك دڵخۆش دەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) دڵخۆش بووایە، غەمبار دەبوو بەغەمبار بوونی پێغەمبەر (ﷺ) هەمووکات پشتگیری لێدەکرد لەکاتی ناخۆشیدا، ئازارو زەحمەتێکی زۆری هەڵدەگرت لەپێناوی خوادا، لەبەرامبەریشدا پێغەمبەر (ﷺ) هەمووکات ئەو چاکەو بەخششانەی خێزانەکەی لەیادو لەبەرچاو بوو، وەپێزانو بەوەفا بوو بەرامبەری. دوای ئەوەی کە خەدیجە (ﷺ) کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر (ﷺ)بەوەفا ترین کەسی بوو بۆیو هەمووکات بەچاکەو باشە باسی دەکردو هەرکاتێك هاوەڵێك یان خزمێکی خەدیجەی ببینیایە زۆر دڵخۆشو شادمان دەبوو، تا ئەوەی ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) لەلای عائیشە زۆر باسی خەدیجەی کردو وەسفی چاکەی کرد، عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: ئایا ئەو هەر پیرەژنێك نەبوو کە خوا بۆی گۆڕیویتو ئێستە لەو باشتری پێداویت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) بەم قسەیەی عائیشە زۆر تووڕە بوو، پاشان فەرمووی: سوێند بەخوای پەروەردگارم لەو باشتری پێنەداوم، کاتێ کە خەڵکی بڕوایان پێنەدەهێنام ئەو بڕوای پێهێنام، کاتێ کەخەڵکی بەدرۆزنیان دانام ئەو بەڕاستگۆی دانام، کاتێ کە خەڵکی قەدەغەیان لێدەکردم ئەو پێی دەبەخشیم، وەبێجگە لەویش پەروەردگارم لەهیچ ئافرەتێکی تر منداڵی پێنەبەخشیوم.



# «بەوەفایی لەگەڵ بێباوەڕاندا»

لەساڵی شەشی کۆچیدا بێ باوەڕەکان لەگەڵ موسوڵماناندا پەیمانی ئاشتەوایی (حدیبیە)یان نوسی، کەیەکێك لەمەرجەکانی بریتی بوو لەوەی هەرکاتێك بێ بڕوایەك موسوڵمان بوو دەبێت بگەڕێندرێتەوە بۆناو کەسوکاری و لە مەدینە قبوڵ نەکرێت.

هەرلەپاش پەیمانەکە (ئەبو جندل کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر) هاتوو موسوڵمانێتی خۆی ڕاگەیاند: کاتێ کەباوکی بینی بەرەو ڕووی ڕۆیشتو گرتی، ئەوسا وەکو جێبەجێ کردنی مەرجی پەیمانەکە داوایکرد لە پێغەمبەر (ﷺ) کە کوڕەکەی بۆ بگێڕێتەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) داواکەی قبوڵ کرد.

بەلام ئەبو جندل خۆی هاتە گۆو وتی: ئەی کۆمەڵەی موسوڵمانان: ئایا دەمگێڕنەوە بۆ ناو بێباوەڕان تالەبارەی ئاینەکەمەوە تووشی بەلاو ناخۆشیم بکەن؟

ئەوسا پێغەمبەر (ﷺ) ئەو بەڵێنەی بیرخستەوە کە بەبێباوەڕانی دابوو، وەفەرمووی: پێویستە بەوەفا بین بەرامبەر بەڵێنەکانمان!

پاشان فەرمووی: ئەی باوکی جەندەل، ئارام بگرەو لەلایەن خواوە چاوەڕێی پاداشت ببە، بەڕاستی خوا بۆ تۆش و بۆ ئەوانەش کەلەگەڵ تۆدان دەرگای خێرو خۆشی خۆیتان بۆ دەکاتەوە، وەئێمەش لەنێوانی خۆمان و گەلێکدا پەیمان و گرێبەستی یەکمان هەبوو بۆ ئاشتەوایی.



# «وەفایەك لەكاتی سەرەمەرگدا»

دەگێڕنەوە کەپیاوێك چوو بۆلای عەبدولاّی کوڕی عەمرو داخوازی کچەکەی لێکرد تاوەکو بیکاتە هاوسەری خۆی، عەبدولاّش نەوەلاّمی بۆ ئەو قبولّ بوون بوو نە بەرپەرچ دانەوە، بەلّکو تەنها وتی: إنشاء الله.

دوای ماوەیەك عەبدولاّ کەوتە ناو جێگای سەرەمەرگەودو بەکەسەکانی دەورو بەری وت:

بڕۆن فلاّنە کەسم بۆبانگ بکەن، چونکە من لەوەلاّمی ئەودا لەبارەی کچەکەمەوە قسەیەکم پێ وتووە کە لەبەلّێن پێدان دەچێت، ئێوە بەشاهێدبن ئەوە من کچەکەی خۆمم پێشکەشکردو نامەوێت بگەڕێمەوە بۆلای پەروەردگارمو سێ یەکی دووڕویی لەمندا هەبێت.

مەبەستی لەوەبوو کەپەیمان شکاندن بەشێکە لە نیشانەکانی مرۆڤی دووڕوو.

(آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا ائتمن خان) متفق عليه.

واتە: نیشانەی موونافیق سیانە.

ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر بەلّێنی دا نەیباتەسەر، ئەگەر سپاردەی لادانرا خیانەتی لێبکات.



# «بەوەفابوون بەرامبەر بەنیشتیمان»

پێغەمبەر (ﷺ) شاری مەککەی زۆر خۆشدەویست، چونکە مەککە ئەوشارە بوو کە تێیدا لەدایك بوو بوو، ئەو خاکەی تیایدا قورئانی دابەزییە سەرو ماڵی خوا (مسجد الحرام)ی تیایە.

کاتێ بێباوەڕەکان ئەزێتو ئازارێکی زۆری پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانیاندا خوای گەورە فەرمانی پێکردن کەمەککە بەجێ بهێڵنو کۆچ بکەن بەرەو شاری مەدینە.

پێغەمبەری بەسۆز (ﷺ) لە مەککە چووە دەرەوە بەچاوێکی پڕ لەخۆشویستنو وەفاوە ئاوڕی دایەوە بەرەو مەککەو فەرمووی: سوێند بەخوا (ئەی مەککە) تۆ باشترینو خۆشەویست ترین زەویت لەلای خوا، ئەگەر دانیشتوانەکەت دەریان نەکردمایە دەرنەدەچوومو بەجێم نەدەهێشتی. دوای هەشت ساڵ پاش ئەوەی کەدەرکرا بوون، خوای کاربەجێ فەرمانی کرد بەپێغەمبەر (ﷺ) کە بەرزگاریو سەرکەوتنێکی زۆرەوە بگەڕێنەوە بەرەوشاری مەککە، پێغەمبەریش (ﷺ) زۆر بەدڵخۆشی یەوە گەڕایەوە بەرەو شاری مەککەو لەهەموو ئەو کەسانەش خۆش بوو کەوەختی خۆی ئازاریان داو لەمەککە دەریان کرد، بەم شێوەیە پێغەمبەرمان (ﷺ) بەوەفا بوو بەرامبەر نیشتمانەکەیو پێویستە مرۆڤی موسوڵمانیش خاکو نیشتمانی خۆی خۆش بوێتو هەمووکات هەوڵی چاکەو چاکسازی بێت بۆیو بەوەفابێت بەرامبەری.

# «پەیمان و وەفا»

خێزانی عیمران ئافرەتێکی نەزۆك و منداڵی نەدەبوو، بۆیە لە پەروەردگار پاڕایەوەو داوای لێکرد کە منداڵێکی پێ ببەخشێت، خوای گەورەش نزاکەی گیراکردو بەویستی خوا سکی پڕبوو، پاشان نەزری کرد لەسەرخۆی پێویست کرد کە منداڵەکەی بکاتە خزمەتکاری مزگەوتی (قودس).

وەك پەروەردگارمان دەفەرموێت: خێزانی عیمران وتی: (إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) ال عمران (٣٥).

واتە: (هاوسەری عیمران وتی: پەروەردگارا: بەڕاستی من بڕیارم داوەو نەزرم کردووە ئەو منداڵەی لە سکمدایە ئازاد کراوبێت لە هەموو ئەرك و ئیش و کارێك (تا هەرلە خزمەتی بیت المقدس دابێت) دەتۆش لێم وەربگرە، چونکە بەڕاستی تۆ خوایەکی بیسەرو زانایت.بەلاّم نەیدەزانی ئەو کۆرپەی کەلە سکیدایە کوڕە یان کچ، پەروەردگارمان دەفەرموێت:

(فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ) ال عمران(٣٦)

واتە: بەلاّم کاتێك منداڵەکەی بوو (بەدڵشکاویەوە) وتی: پەروەردگارا: خۆ من کچم بوو، بێگومان خوا خۆی چاك دەزانێت کەچی بووە.

پاشان نەیوت کۆرپەکەم کچەو تازە وەفا بەپەیمان و نەزرەکەم ناکەم، نەخێر بەڵکو هەر سورو ڕاوەستاو بوو لەسەر ئەو بەڵێنەی کە بەخوای دابوو، پاشان ناوی نا (مەریەم) و ئەوسا کاتێ کە پێگەیشت و گەورە بوو، دایکی بەوەفای تایبەتی کرد بەکارو بارەکانی (بيت المقدس)ەوەو کردی بەخزمەتکاری، پاشان داوایکرد لە پەروەردگار کەمەریەمی خۆشەویستی لەفێڵ و پیلانەکانی شەیتان بپارێزێت.

پەروەردگاریش (لەبەرامبەر ئەو وەفا جوانەیدا) هەموو دوعاو نزاکانی وەرگرت و خۆی مەریەمی پەسەند کردو بەجوانترین شێوە پێی گەیاندو گێڕای بەیەکێك لەئافرەتە چاکەکارو خواناس و ملکەچەکان و بوو بەیەکێك لەئافرەتە ..ەنگین و بەڕێزەکانی بەهەشتی بەرین.

## «هاوسەرێکی بەوەفا»

لەجەنگی بەدردا موسوڵمانەکان بێ باوەڕێکی زۆریان بەدیل گرت، کەلە نێوانیاندا ئەبو لعاسی کوڕی ڕەبیعی تێدابوو، مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم پیاوە لەبەر ئەوەی بێباوەڕ بوو دەبوو لە زەینەبی خێزانی جیابکرایەوە، چونکە زەینەب ئافرەتێکی موسوڵمان بوو.

کاتێ زەینەب ئەبولعاسی مێردی بینی کەوتبووە ناو دیلەکانەوە خێرا ئەو ملوانکەیەی گەردنی دانا کە وەختی خۆی لەکاتی شوکردنیدا بە ئەبولعاس خەدیجەی دایکی پێی خەڵات کردبوو، پاشان وەکو وەفایەك ناردی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) تا بەهۆیەوە ئەبولعاسی مێردی ئازاد بکات، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەناو شتەکاندا چاوی بە ملوانکەکە کەوت ناسیەوەو زانی کە ملوانکەکەی زەینەبەو بەهۆی ئەبولعاسی مێردیەوە دایناوە.

بۆیە خۆشەویست (ﷺ) ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵاندا کرد دەربارەی ئازادکردنی ئەبولعاس و گەڕاندنەوەی ملوانکەکە بە زەینەب، ئەوانیش

هەموویان بەم بڕیارە ڕازی بوون و ئەبولعاسیان ئازاد کرد.

کاتێ ئەبولعاس گەڕایەوە بۆ شاری مەککە موسوڵمانێتی خۆی ڕاگەیاندو موسوڵمان بوو، ئەوسا کۆچی کرد بەرەو مەدینەو لەوێش پێغەمبەر (ﷺ) هاوسەرە بەوەفاکەی بۆ گێڕایەوە.

## «وەفای خەلیفە»

رۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) بەجابری کوڕی عەبدوڵای فەرموو: ئەی جابر ئەگەر لەبەحرەین مالّو پارەی زەکاتیان کۆکردەوەو هێنایان ئەوا ئەوەندەو ئەوەندەت دەدەمێ.پێش ئەوەی زەکاتەکان لە بەحرەینەوە بگاتە مەدینە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد.

لەسەردەمی ئیمامی ئەبوبەکردا کەئەو خەلیفەی موسوڵمانان بوو زەکاتە کۆکراوەکانی وڵاتی بەحرەین گەیشتنە مەدینە، ئیمامی ئەبوبەکریش فەرمانی کرد بەپیاوێك کەبەناو شاردا بگەڕێو هاوار بکات کێ هەیە پێغەمبەر (ﷺ) بەڵێنی شتێکی پێدابێت بابێت وەریبگرێت.. جابر کەگوێی لەم بانگەوازە بوو دەستبەجێ چوو بۆ لای ئیمامی ئەبوبەکرو هەواڵی پێدا کە پێغەمبەر (ﷺ) بەڵێنی بەخشینی پێداوم لەماڵەکانی زەکاتی بەحرەین سێ جار.

ئیمامی ئەبوبەکریش توورەکەیەك پارەی پێدا، کەجابر ژماردی بینی وا (٥٠٠) دینارە وەکو وەفایەك بۆ بەڵێنەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی ئەبوبەکر دوو تورەکەی تریشی پارە پێبەخشی.

## «وەفاو خۆنەویستی»

رۆژێکیان برسێتی زۆری هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبو بەکرو عومەر، بۆیە لەتاو برسێتی بەرێکەوتن بەرەو ماڵی (ئەبی الهیثم) کەپاوێکی دەوڵەمەندی ئەنساری بوو، (ئەبی الهیثم) خواردنێکی زۆر چاكو باشی پێشکەش کردن، پاش خوانەکەیان پێغەمبەر (ﷺ) بەڵێنی بە (ئەبی الهیثم)دا کەئەگەر هاتوو مەرو ماڵاتی بێباوەڕانم دەست کەوتو خەڵکانیشم لێ بەدیل گرتن ئەوە کۆیلەیەکت بدەمێ، رۆژگار تێپەڕی.

رۆژێك سێ کەسیان بەدیل هێنایە لای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش دوانیانی دایە موسوڵمانان، پاشان یەکێکیان مایەوە، لەولاوە فاتیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) هاتو داوایکرد تا ببێتە یارمەتی دەرێك بۆی، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) داواکەی فاتیمەی کچی قبوڵ نەکردو فەرمووی: پێش تۆ بەڵێنم بە (ئەبی الهیثم) داوەو دەبێ بەڵێنەکەم نەشکێنمو بەوەفابم بەرامبەری.

# «کرێکارە بەوەفاکە»

کاتێ پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێ بێت) شاری میسری بەجێهێشتو چوو بەرەو مەدیەن لەشام، کۆمەڵە خەڵکانێکی زۆری بینی لەسەر بیرێك خەریکی ئاودانی ئاژەڵەکانیان بوون، لە دووری ئەوانیش دوو کچی بینی کەچاوەڕێی ئەوە بوون خەڵکەکە تەواو ببن‌و ئەوانیش بچن مەڕەکانیان ئاو بدەن، موساش (سەلامی خوای لێ بێت) چووەلایان‌و یارمەتی دان‌و مەڕەکانی بۆ ئاودان.

ئەو دوو کچەش کەخاوەنی باوکێکی بەساڵاچو بوون کاتێ کەگەڕانەوە ئەم هەواڵەیان بۆ باوکیان گێڕایەوە، باوکیشیان بەیەکێکیانی وت: بڕۆ ئەو کەسەم بۆ بانگ بکە کەیارمەتی دان تاوەکو پاداشتی ئەو چاکەیەی بدەمەوە، پاش ئەوەی پێغەمبەر موسایان بانگ کردو میوانداریيان لێکرد، باوکە پیرەکەیان زۆر سوپاسی پێغەمبەر موسای کردو زانی کەلە دەستی فیرعەونی ستەمکار هەڵهاتووە، بۆیە دڵنەوایی دایەوەو پاشان موسای سەرپشك کرد لە هەڵبژاردنی یەکێك لە کچەکانیدا تاوەکو بیکات بەهاوسەری خۆی، بەمەرجی (٨) ساڵ شوانی، ئەگەر بیکات بە (١٠) ساڵ ئەوە باشتریش، پێغەمبەر موساش ڕازی بوو بەمەرجەکەیی‌و زۆر بەچاکی (١٠) ساڵ شوانی بۆ کردو بەوەفا بوو بەرامبەر بەڵێنەکەی، پاشان گەڕایەوە بەرەو شاری میسر.

# «پەیمانەکەی عورقوب»

لەگوندا پیاوێك لە (یثرب) ژیانی بەسەر دەبرد کەناوی عورقوب بوو، ئەم پیاوە خاوەنی دارخورمایەکی زۆر بوو، ڕۆژێك پیاوێکی هەژار چووە لای و داوای هەندێ خورمای لێکرد، ئەویش لەوەڵامیدا وتی: ئێستا جارێ خورما پێنەگەیشتووەو بڕۆ ماوەیەکی تر کەپێگەیشت ئینجا وەرەوە، هەژارەکەش هەربۆ ئەم داوایە دووجاری تریش ڕۆیشتەوە بۆلای، بەلام ئەو لەهەموو جارێکدا بەرێی دەکردو پێی دەوت: جارێ ماوەتی و هەرکاتێ پێگەیشت ئینجا وەرەوە، بۆجاری چوارەم کە هەژارەکە چووەوە بۆلای، عورقوب پێی وت:

دارەکان خورمایان گرتووە، بەلام تەواوی کامڵ نەبوون و پێنەگەیشتوون، ئاوا چەند ڕۆژێکی تر سەرم لێبدەرەوە بەتەواوی پێدەگەن و بەشت بۆ دادەنێم. بەڵێ دوای چەند ڕۆژێك کەدارەکان خورماکانیان زۆر بەجوانی پێگەیشتن و وەختی خواردنیان هات..

عورقوب لەشەوێکی تاریکدا سەرکەوتە سەر دارخورماکان و هەموویانی ڕنی و هیچی پێوە نەهێشت و پاشان هەموویانی شاردەوە، دوای چەند ڕۆژێك هەژارەکە لەسەر پەیمانەکەی عورقوب گەڕایەوە، بەلام کەنزیکی دارەکان بوویەوە بینی وا هیچیان خورمایان پێوە نەماوەو هەموویان لێکراونەتەوە، ئالێرەدا ئەم هەژارە بۆی ئاشکرا بوو کە عورقوب فێڵ و درۆی لەگەڵدا کردووەو مەبەستی نەبووە بەشی بدات بەم شێوەیە عورقوب بووە نموونەیەکی خراپی پەیمان و بەڵێن شکاندن.

# «ئاژەڵی بەوەفا»

پاوێک لەگەڵ براکەیو دراوسێ کەیدا چوونە دەرەوەی شار بەمەبەستی خۆشۆردنو خۆخاوێن کردنەوە، ئەم پیاوە سەگێکی هەبوو لەکاتی ڕۆشتنیاندا بەرەو دەرەوەی شار سەگەکەی شوێنیان کەوتبوو، هەرچەندە بەردی تێگرت تاوەکو سەگەکە بگەڕێتەوە، بەڵام بێ هودە بوو، ناچار وازی لێهێنا..

لەکاتێکدا بەسەر ڕێگایەکی بێ دەنگدا دەڕۆیشت لەناکا کۆمەڵە کەسێکی شەڕ فرۆشو شەڕانی ڕێگەیان پێگرتن، خێرا دراوسێکەییو براکەیی لەترسان ڕایانکردو هەرخۆی بەتەنیا مایەوە لەبەردەمی ڕێگرەکاندا، سەگەکەی هاتە پێشیو پشتگیری لێدەکردو نەیدەهێشت نزیکی بکەونەوە، بەڵام ئەوان هەر هەموویان دەستیان کرد بە بەرد باران کردنی سەگەکە تا ئەوەی زۆر دوور کەوتەوە..

پاشان هاتنەلای کابراو زۆریان ئازارداو فڕێیاندایە ناو چاڵێکی قوڵەوەو کۆمەڵێ دڕکو پوشیان دابەسەر دەمو چاوو لاشەیدا، کاتێ کە دوورکەوتنەوە سەگەکەی هاتەوە لایو خۆیخستە ناو پوشو دڕکەکانەوەو گەڕا تاسەری خاوەنەکەی بەدیار خست کەخەریک بوو دەمرد، پاشان کەلە دوورەوە کۆمەڵە خەڵکێکی بینی دەستیکرد بەوەڕینو چنگ لەزەوی کوتان، خەڵکەکەش هەستیان بەشتێک کرد، بۆیە هاتنە لایو پیاوەکەیان بینیو لەچاڵەکە دەریان هێناو بردیانەوە بۆ ناوماڵو منداڵی.

# «پەیمان شکێنی»

دوای ئەوەی فیرعەونی ستەمکارو دارو دەستەکەی خنکانو لەناو چوون، خوای گەورە نازو نیعمەتێکی زۆری ڕشت بەسەر بەنی ئیسرائیلییەکانداو زۆر بەخۆشیو کامەرانی دەژیان.

کاتێ پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێ بێت) ویستی بچێت بۆ ئەو شوێنە دیاریکراوەی کە پەروەردگار بۆی دیاری کرد بوو بۆ وەرگرتنی پەیامی خوایی، فەرمانی کرد بەگەلەکەی کە گوێڕایەڵی هارونی برای بکەنو دەست بگرن بە بەڵێنەکانیانەوەو نەکەن واز بهێنن لەئیمانو باوەڕەکەتان، هەر ئەوەندەی پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێبێت) بەجێی هێشتنو لێیان دوور کەوتەوە کەسێك لەناویاندا بەناوی سامیری هەستا بەدروستکردنی بەگوێرەکەیەك لەئاڵتونو خاوەن دەنگێکی تایبەت، پاشان پێی وت: ئەی خەڵکینە ئەمە خوای ئێوەیەو پێویستە بیپەرستنو لەیادی نەکەن، ئەوانیش بەڵێنەکەیان لەیادکردو دەستیانکرد بەپەرستنی ئەو گوێرەکەیە لەجیاتی خوای گەورە هارونیش (سەلامی خوای لێ بێت) زۆر ئامۆژگاریکردن کە بگەڕێنەوە بۆ ئیمانەکەیانو نەکەن بەڵێنەکانتان بشکێنن، بەلام بەقسەیان نەکردو گوێیان نەدایە ئامۆژگاریەکانی.

لەکاتی ژوانو خەڵوەتدا لەگەڵ پەروەردگاردا پێغەمبەر موسا لەلایەن خواوە هەواڵی پێدرا کە گەلەکەت بەڵێنەکانیان شکاندو بەوەفا نەبوون بەرامبەری.

پێغەمبەر موساش زۆر غەمبار بوو، پاشان بەتوڕەییەوە گەڕایەوە بۆ ناویانو زۆری لۆمەکردن لەسەر شکاندنی بەڵێنەکانیانو بەوەفا نەبوون بەرامبەر بەپەیمانەکانیان، پاشان لەسەرەتاوە دەستیکردەوە بەبانگ کردنەوەیان بۆ ئیمانو یەکتا پەرستی.

## «شەهیدە بەوەفاکە»

ئەنەسی کوڕی نەزیر لەبەر ئەوەی لەجەنگی بەدردا بەشداری نەکرد بوو زۆر غەمبارو بێ تاقەت بوو، بۆیە بەڵێنی دابوو بە پەروەردگار کە ئەگەر هاتوو جەنگێکی تر هەڵگیرسا ئەوە زۆر بەچاکی لەپێناوی خوادا بجەنگێت، ئەوەبوو دوای ماوەیەك جەنگی ئوحود هاتە پێش‌و فەرمانکرا بەموسوڵمانان کەخۆیانی بۆ ئامادە بکەن.

ئێستا کاتی ئەوەیە کە ئەنەس بەوەفا بێت لەبەرامبەر بەڵێنەکەیداو بەڵێنەکەی نەشکێنێت، بەڵێ ئەنەس بەڵێنەکەی بردە سەرو زۆر بەچاکی‌و جوامێرانە چووە ناو جەنگەکەوەو بەرامبەر بێباوەڕان ڕاوەستا هەتاوەکو شەهید بوو، هاوەڵان دەڵێن: هەشتاو ئەوەندە شوێنی شمشێرو ڕم‌و تیری بەسەر لاشەیەوە بوو، لەزۆری برین‌و زامی لاشەی تەنها خوشکەکەی ناسییەوەو زانی کەئەنەسی برایەتی.

لەحەقی ئەم وەفا جوان‌و بەرزەیدا ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی.

(مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً) الاحزاب (٢٣).

واتە: مەردانێکی زۆر هەن لە ئیمانداران ئەو پەیمانەی داویانە بەخوا، ڕاستیان کرد لەسەری ژیان‌و پابەند بوون پێوەی‌و لایان نەدالێ، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کردو مرد لەسەری، هەشیانە چاوەڕوانە، بەهیچ شێوەیەك گۆڕان‌و لاری رووی تێ نەکردووە.

هاوەڵان زووبەزوو هەستیان بەوەکرد کە ئەم ئایەتە لەبەر ئەنەس‌و ئەو کەسانە دابەزیوە کەلەگەڵ ئەودا شەهید بوون.

## لە کۆتاییدا:

وەفا: ڕەوشتێکی زۆر مەزن و شکۆدارەو پەروەردگارمان زۆری خۆش دەوێت کاتێ لەناو ئیمانداراندا هەبێت.

هەرکەسێك دەستی پێوە بگرێت پەروەردگار شکۆداری دەکات و باشترین و چاکترین پاداشتی دەداتەوە.

وەفا: بریتیە لەوەی مرۆڤ پارێزگاری بکات لەبەڵێن و پەیمانەکانی و لەکاتی خۆیدا جێبەجێیان بکات، چونکە مرۆڤ کاتێ بەوەفا دەبێت بەرامبەر بە پەروەردگاری کەئەو پەیمانانەی پێیداوە بیانکات و لەیادیان نەکات، ئەوەتا پەروەردگارمان فەرمانمان پێدەکات و دەفەرموێت.

(وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً) الاسراء ٣٤.

واتە: وەفا بکەن بەبەڵێن و پەیمان، چونکە بەڕاستی بەرپرسیارن لەبەرامبەر بەڵێن و پەیمانەوە.

وەفا: نیشانەیەکە لەنیشانەکانی کاملی و تەواوی ئیمان و پێچەوانەکەشی نیشانەیەکە لەنیشانەکانی دووڕوویی.

چەند جوانە مرۆڤ دەست بگرێت بەم ناکارە جوانەوەو بەوەفابێت لەبەرامبەر پەروەردگاریداو بەوەفا بێت بەرامبەر بەخەڵکیش.

چونکە کەسی خاوەن وەفا خۆشەویستی خواو خەڵکیشە. ئەم چیرۆکانەش کەخوێندمانەوەو ڕابووردین بەسەریاندا پەندو وانەی زۆریان فێرکردین تاوەکو ئێمەش واتای وەفا بزانین و هەمووکات بەوەفابین.

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی نەرم و نیانی

نوسینی

مه نصور عه لی + محه مه د مه حمود القاضي

وەرگێڕانی

فاتح شاربازێڕی

# ﴿نەرم و نیانی (الحلم)﴾

الحلم: واتە وازهێنان لەپەلە کردن.

-خوای گەورە ناوی (الحلیم)ە چونکە لە سزادانی بەندە خراپەکانی دا پەلەی نی یە.

-لەپێناسەی (الحلم)وتراوە: بریتی یە لەوازهێنان لەتۆڵە سەندنەوە لەکاتی تورە بووندا لەگەڵ ئەمەشدا کەتوانات هەبێت.(جاحظ)وا دەڵێت.

راغب -دەڵێت: واتە خۆ ڕاگرتن و زاڵبوون بەسەر خۆتدا لەکاتی شەپۆلدانی تووڕەیی لە دەروونتدا.

-مَن یدعی الحِلمَ أغضبهُ لِتعرفهُ لایُعرفُ الحلمُ الا ساعةَ الغضَب

-ئەگەر کسێك ووتی:نەرم ونیانم، تورەی بکە تا دڵنیا بیت ،چونکە لەکاتی تورەییدا نەرم ونیانی دەردەکەوێت .خوای گەورە لەچەندین ئایەت باسی (الحلیم)ی خۆی دەکات:

-﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾(البقرە ٢٢٥)

-﴿البقرە ٢٣٥ ،٢٦٣،٢٦٤ ﴾﴿ال عمران ١٥٥، ١٥٨ ﴾﴿النساء ١٢﴾﴿المائدە ١٠١ ﴾﴿الاسراء ٤١، ٤٤﴾﴿الحج ٥٦، ٦٠﴾

-پێغەمبەران نەرم ونیان بوون خوای گەورە دەربارەی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیە السلام)دەفەرموێت:﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ﴾(هود: ٧٥).

-دەربارەی شعیب (علیە السلام)دەفەرموێت:﴿إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ﴾(هود: ٨٧).

-دەربارەی اسماعیل (علیه السلام)دەفەرموێت:﴿فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾

-پێغەمبەرﷺدەفەرموێت :(وَمامِن شیءٍ احبُ الی اللهِ مِنَ الحلم)(رجالُهُ رجالُ الصحیح).

هیچ شتێك بەقەدەر نەرم و نیانی لای خوا خۆشەویست نییە.

-پێشەوا عومەری کوڕی خطاب ﷺدەفەرموێت: تعلموا الحلم ،وتعلموا للعلم السكينة والحِلم

پێشەوا عەلی ﷺدەفەرموێت: إن أول ماعوَض الحلمَ مِن حلمِهِ أن الناس كُلهم أعوانهُ على الجاهل.

واتە:یەکەم دەستکەوتی مرۆڤی نەرم و نیان ئەومیە کە هەموو خەڵك یارمەتیدەری دەبن.

-عەلی کوڕی حسین دەڵێت:

ما احلمَ اللهَ عني حيثُ امهلني          وَقد تماديتُ في ذنبي وَيَسترني

واتە:خوا چەندە نەرم و نیانە کە مۆڵەتم دەدات —من ڕۆچووم لە گوناهدا ئەو سەترم دەکات.

شافعی دەڵێت:

يُخاطبني السفيهُ بكُلِ قبحٍ          فأكرهُ أن اكون لهُ مجيباً

يزيدُ سفاهةً فازيدُ حلماً          كعودٍ زادهُ الإحراق طيباً

واتە:کەسی نەزان و کاڵ فام بەهەموو قسەیەکی ناشیرین ڕوبەڕوم دەبێتەوە، منیش نامەوێت وەڵامی بدەمەوە، ئەو هەرسەفاهەت و بێ عەقڵی زیاد دەکات وقسەی خراپتر دەکات، منیش نەرم و نیانیم زیاد دەکات .هەروەك بوغردێك بەسووتان بۆنی خۆش زیاتر بڵاو دەکاتەوە .

وَجهلٍ رددناهُ بفضل حلومنا          وَلو أننا شئنا رددناهُ بالجهل.

# «لەسەرخۆیی و دادپەروەری»

موسوڵمانەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لەیەکێ لە غەزاکان، ماڵێکی زۆریان کۆکردەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت لەبەینی هاوەڵاندا تائەو دەست کەوتە دابەش بکات بەسەریاندا.

پیاوێکی دەشتەکی هات و بەشێوەیەکی توڕەو ڕەق بە پێغەمبەری ووت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دادپەروەربە، پێغەمبەر زۆر نەرم و نیان و لەسەرخۆ بوو لەگەڵ خەڵکدا، بێ دەنگ بوو وەڵامی کابرای هیچ نەدایەوە، کابرای دەشتەکی دووبارە هاواریکردو وتی: دادپەروەربە ئەی پێغەمبەری خوا!!

پێغەمبەر (ﷺ) سەیرێکی کابرای کردو فەرمووی: ماڵ وێران ئەگەر من دادپەروەر نەبم کێ دادپەروەرە؟

هەندێ لەدانیشتوان هەستانەوە بۆ کابرای دەشتەکی، تالێی بدەن، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لێکردن و نەیهێشت.

# «پرسیارێك و وەڵامێك»

شەوێکیان پێشەوای باوەڕداران (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) (ﷺ) دەردەچێ تادڵ ئارام بێ لەبارەی ماڵ و گوزەرانی خەڵك، یەکێ لەپیاوانی پۆلیس دەرچوو لەگەڵیدا، پێشەوا عومەر لەگەڵ کابرای پۆلیس دا چوونە ناو مزگەوت، ناو مزگەوت زۆر تاریك بوو، پێشەوا عومەر قاچی گیرا لەقاچی پیاوێك کەلە ناو مزگەوت خەتبوو، پیاوە بەئاگا هاتوو سەری بەرزکردەوەو وتی: ئایا تۆ کوێری؟

عومەر فەرمووی: نەخێر. لەگێڕانەوەیەکدا دەڵێ: ئایا کوێری؟ ئەویش، دەفەرموێ: نەخێر.

پۆلیسەکەی ویستی لەکابرا بدات، عومەر ڕێگری کرد لێی نەیهێشت، فەرمووی: وامەکە، ئەم پرسیاری کرد لەمن وتی: ئەرێ تۆ کوێری؟ منیش وتم: نەخێر کوێر نیم .

# «هۆنراوە و نەرم و نیانی»

مەعنی كوڕی زائیدە دەبێتە كاربەدەستی عێراق، ئەم پیاوە ناسراوە بەكەسێكی زۆر نەرم‌و نیان، رۆژێك كابرایەكی دەشتەكی دێتەلای دەیەوێ تاقی بكاتەوە.

كاتێك كابرای دەشتەكی دەچێتە ژوورەوە بۆلای (مەعن) دەڵێ: بیرتە كاتێ پۆشاكت لە پێستی مەڕ بوو؟

و كاتێ نەعلەكانت لەپێستی وشتر بوو؟

پاكی‌و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەم ماڵ‌و ملكەی بەخشی بەتۆ، و فێری دانیشتنی سەر كورسی پاشایەتی كردی، من هەرچەن بژیم ملكەچ نابم بۆ مەعن كەكاری بەدەستەبەرپرس لەشارێ دەڕۆم كەتۆی تیابێت

هەرچەن زەمان ستەم لەهەژار بكات

مەگەر زەمان ڕێگەم لێ بگرێ‌و فەقیر بم

بەڵام (مەعن) بەهیچ شێوەیەك تووڕە نەبوو، و كابرای دەشتەكی هەرچی پێویست بوو بۆ سەفەرەكەی پێی بەخشی كابرای دەشتەكی وتی:

ئەوەی كە بەخشیت زۆر كەم بوو

لەتۆ چاوەڕێی ماڵێكی زیاترم بوو

(مەعن) بەخشینی زیاد كرد بۆی، كابرای دەشتەكی وتی: ئەی گەورە، باشبزانە تەنها بۆ ئەوە ئەوكارەم كرد تا نەرم‌و نیانیت تاقی بكەمەوە! چونكە پێمگەشت بوو كە كەسێكی ئارامگر و نەرم‌و نیانی، بەراستی ئەوەندەت نەرم‌و نیانی تیا كۆبۆتەوە كەئەگەر دابەش بكرێ بەسەر ئەهلی زەویدا بەشیان دەكات، پاشان كابرای دەشتەكی رۆشت، ووتی: ئەم دیوە تائێستا كەسێك بەشێوەی (مەعنی) ئەوەندە نەرم‌و نیان‌و لەسەرخۆ بێت.

# ﴿نەرم و نیانییەکی گەورە﴾

(ئەحنەفی کوڕی قەیس) ناسراوە بەوەی کە کەسێکی خاوەن (حیلمە) واتە نەرمو نیانو لەسەرخۆیە.

پیاوێك پرسیاری لێدەکاتو دەڵێ: ئەم نەرمو نیانیە لەکوێ فێر بووی؟

ئەحنەف فەرمووی: لە قەیسی کوڕی عاصم (المنقری) کەبینیم دانیشتووە لەحەوشەی ماڵەکەیدا قسە دەکات بۆ خەڵك، دووپیاویان هێنا بۆلای، یەکەمیان، کوژرا بوو ئەوی تریان دەستەکانی بەسترا بۆوە، وتیان: ئەمە برازاکەتە کوڕەکەتی کوشتووە سوێند بەخوا هەڵنەستا لەشوێنی خۆی و قسەکانی خۆی نەبڕی تاتەواو بوو!!

ئینجا لایکردەوە بەلای برازاکەی وتی: ئەی کوڕی برام، خراپەت کرد (توش بووی بەخراپە و تاوان) بەرامبەر بەپەروەردگار، بەتیرەکەی خۆت ئاراستەی خۆتکرد و کوڕی مامەکەت کوشت، و پاشان ڕوانی بۆ کوڕەکەی تریو فەرمانی پێکرد بە شاردنەوەی براکەی، برازاکەشی ئازاد کرد و سەد وشتری لەماڵی خۆی بەخشی بەدایکی کوژراوەکە، وەك خوێنی کوڕەکەی.

# ﴿فریشتە و شەیتان﴾

ڕۆژێـك پێغەمبــەر (ﷺ) دانیشــتبوو لەگــەڵ هاوەڵانــدا لــەناو هاوەڵانــدا ئەبوبـەکری صـدیق (ﷺ) هـەبوو پیاوێـك هـات دەسـتی کـرد بـەجوێن و قسـەی ناهەموار بەرامبەر ئەبوبەکر، بـەڵام ئەبوبـەکر هـیچ وەڵامـی نەدایـەوە، پیاوەکـە زیاتر جنێوی بە ئەبوبـەکردا، ئەبوبـەکر بێـدەنگی هەڵبـژارد، بـەڵام ئـەمجارەیان پیاوەکـە جـوێن و قسـە ناهـەموارەکانی زیـاتر کـرد بەرامبــەر ئەبوبـەکر، بۆیــە ئەبوبــەکریش وەڵامــی هەنــدێ لەقســەکانی کــابرای دایــەوە، پێغەمبــەر (ﷺ) بێتاقەت بوو ئەو کۆڕەی بەجێ هێشت، دیار بوو پێغەمبەر (ﷺ) بێتاقەت بـوو، ئەبوبەکر بەدوای پێغەمبەردا ڕۆیشت هـەتا گەیشت بـە پێغەمبـەر (ﷺ) وتـی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو پیاوە جنێوی بـەمن ئـەداو تـۆش دانیشـتبووی، بـەڵام کاتێـك مــن وەڵامــی هەنــدێ لەقســەکانی ئــەو پیــاوەم دایــەوە، جـەنابت بێتاقەت بوویت و هەستای ڕۆشتی، ئایا لەمن تورە بوویت ئەی پێغەمبەری خوا؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ فریشـتەیەکت لەگەڵدایـەو لـەبری تـۆ وەڵامـی ئـەوی ئەدایـەوە، بـەڵام کاتێـك تـۆ وەڵامـی ئـەو پیـاوەت دایـەوە جـێ بـۆ شـەیتان خۆش بوو، ومن ئامادەنیم لەکۆڕێکدا دانیشم کە شـەیتانی تیـادابێ!! پێغەمبـەر (ﷺ) بەردەوام بوو فەرمووی: هەر بەنـدەیـەکی خـوا ناحـەقی لێبکـرێ، و ئـەو بەنـدە بێدەنگ بێ و ئارام گربێ، خـوای پـەروەردگار دێ بەهانایـەوەمو سـەربەرزو سەرکەوتووی دەکات.

# «ئاگری توڕەیی»

عوروەی کوڕی موحەممەدی سەعدی (ﷺ) یەکێ بووە لەپیاوە خواناس‌و باشەکانی دوای هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك لەڕۆژان، عوروە قسەی دەکرد بۆ خەڵکی پیاوێك لەناو دانیشتوانا هەستایەوەو کەوتە قسەی ناشیرین بەرامبەر بەعوروە، ئەو زۆر تووڕە بوو بەئەندازەیەك دەم‌و چاوی سور هەڵگەڕا.

وەڵامی کابرای نەدایەوە بەقسەی ناشیرین، بەڵکو ئارامی گرت‌و هێوربۆوە، کۆڕەکەی جێ هێشت، ڕۆیشت دەستنوێژی شۆری‌و گەڕایەوە بۆ کۆڕەکە، هەستی بەئارامی دەرونکرد، و توڕەیی ڕۆشت‌و نەما، پاشان بەئامادەبوانی وت: باوکم لەباپیرمەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: توڕەبوون لەشەیتانەوەیەو شەیتانیش لەئاگر دروستکراوەو ئاگر بەئاو دەکوژێتەوە، هەرکاتێك یەکێکیان تووڕە بوو با دەستنوێژ بشوا) ئەو دەستنوێژ شۆرینە وادەکات توڕەییەکە دەکوژێتەوەو نامێنێ، هەروەك عوروە چۆن سور هەڵگەڕا، بەڵام کەچوو دەستنوێژی شۆری توڕەییەکەی نەما سوپاس بۆ خوا.

# ﴿نەرم و نیانی و بەخشش﴾

ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو لەگەڵ هاودڵانیدا، كاتێك كۆتاییان بەدانیشتنەكە هێناو هەستانەوە بڕۆن، پیاوێكی دەشتەكی هات بەدوو وشترەوە، چووە پێشەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) توند یەخەی كراسەكەی پێغەمبەری ڕاكێشا، ئەوەندە بەتوندی یەخەی كراسەكەی ڕاكێشا، لاملی موبارەكی سوور هەڵگەڕاو جێی یەخەی كراسەكە دەركەوت.

داواكاری ئەم پیاوە دەشتەكیە ئەوەبوو لە پێغەمبەر (ﷺ) كە بارێك جۆ، بارێك خورمای بداتێ.

كابرا وتی: من نامەوێ لەماڵی خۆت یان ماڵی باوكت، بمدەیتێ بەڵكو ماڵی خوایەو منیش دەمەوێ، پێغەمبەری فەرمووی: نەخێر، داوای لێخۆشبوون لەخوا دەكەم، نەخێر داوای لێخۆش بوون لەخوا دەكەم، نەخێر، داوای لێخۆش بوون لەخوا دەكەم، هیچ بارێكت، پێ نادەم هەتا ئەو هەقەت لێنەكەمەوە واتە (ڕاكێشانی یەخەی كراسەكە، بەوشێوەیەی كە تۆ ڕاتكێشا).

كابرای دەشتەكی قبوڵی نەكرد.

هاوەڵان ویستیان لەكابرا دەشتەكیەكە بدەن واتە ئەزیەتی بدەن، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری لێكردن‌و نەی هێشت ئەزیەتی بدەن، لەكاتێكا ئەم كابرایە بەو شێوە ناشرینە ئەزیەتی ئەم پێغەمبەرە نازدارەی دابوو.

پیاوێكی بانگ كرد فەرمانیدا بەبەخشینی بارێك جۆو بارێك خورما بۆ ئەو كابرا دەشتەكیە ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لای كردەوە بەلای هاوەڵانداو فەرمووی : (با بەڕێكەوین لەسەر بەرەكەتی خوای گەورە).

# «نەرم و نیانی تا کۆتایی»

ئەحنەفی کوڕی قەیس لە گەورەو پیاو ماقوڵانی عەرەبە، ئەم پیاوە زۆر لەسەر خۆو نەرمو نیان بووە، ئەگێڕنەوە لێی کەپیاوێك بەردەوام جنێو دەدا پێی، بەڵام بەهیچ شێوەیەك وەڵامی کابرای نەدایەوەو بەردەوام بوو لەسەر ڕێ ڕۆیشتنی خۆی.

پیاوەکە بەردەوام بەدوای ئەم خواناسەوە بوو لێی دوور نەکەوتەوەو زیاتر جوێنو قسەی ناهەمواری دەوت بەرامبەری، بەڵام ئەحنەف بڕیاریدا بوو کە بەهیچ شێوەیەك وەڵامی نەداتەوە، کاتێك ئەحنەف لە کۆڵانەکەیان نزیك بۆوە ڕاوەستاو ڕووی کردە پیاوەکە.

وتی: بەپیاوەکە، ئەگەر شتێك ماوە لەدەرونتا بەرامبەر بەمن لێرە پێم بڵێ، نامەوێ لەناو کۆڵانەکەماندا گەنجو لاوی قەومەکەم گوێیان لێبێو ئازارت بدەن، و من نامەوێ دەرونم سەرکەوێ بەسەر عەقڵمدا، بەڵکو دەبێ من سەرکەم بەسەر دەرونما. کابرا هەڵوەستەیەکی کردو بەشەرمەزارییەوە گەڕایەوەو وازی لەوکارە بەدو ناشیرینە هێنا، بەڕاستی ئەم پیاوە خواناسە زۆر بەئارامو نەرمو نیان بووە.

# ﴿هێزی راستەقینە﴾

رۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا دەرچوون بۆ شوێنێ، دایان بەلای خەڵکانێکا لەبەردەمیانا بەردێکی گەورە هەبوو، هەریەکێ لەو ئامادەبوانە هێزو قوەتی خۆی تاقیکردەوە بەهەڵگرتنی ئەو بەردە گەورەیە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەمانە بۆ وادەکەن؟ هاوەڵێك فەرمووی: ئەم خەڵکە دەیانەوێ هێزو توانای خۆیان تاقیبکەنەوە، بەهەڵگرتنی ئەو بەردە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا پێیان بڵێم کێ لەنێوە لەوان زۆر بەهێزو توانا ترە؟

ئەو کەسە بەهێزە کەزاڵ دەبێ بەسەر دەرونی خۆیا لەکاتی توڕەبونداو توڕەییەکەی دەخواتەوە، فەرمووی: (پاڵەوانی‌و ئازایەتی ئەوەنیە خەڵك بدەی بەزەویدا، بەڵکو ئازاو پاڵەوان ئەو کەسەیە کە زاڵ بێت بەسەر دەرون نەفسی خۆیدا لەکاتی توڕەبووندا).

ئەگەر دەتەوێ کەسێکی ئازاو بەهێزبی، لەکاتی توڕەبووندا دانبگرە بەخۆتاو مەهێڵە (نەفس) زاڵبێ بەسەرتا.

# ﴿نەرم و نیانی و لێبوردەیی﴾

رۆژێکیان، ناکۆکی دەکەوێتە نێوان (حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب)و ئامۆزاکەی (عەلی کوڕی حسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (ﷺ) حەسەن قسەیەکی زۆر بەعەلی دەڵێ، بەڵام عەلی بەهیچ شێوەیەك وەڵامی ناداتەوە، بەڵکو زۆر بەنەرمی‌و هێمنی مامەڵەی لەگەڵ دەکات، حەسەن دەڕواتەماڵەوەو عەلی جێ دەهێڵێ.. کەشەو دادێ، عەلی هەڵدەستێ دەڕوا بۆ ماڵی حەسەن، حەسەن دێتە دەرەوە دەبینێ عەلی یە.

عەلی دەڵێ: ئەی کوڕی مامەم، ئەگەر تۆ راست دەکەی ئەوە خوا لەمن خۆش بێ، و ئەگەر درۆتکردوە داوا دەکەم خوا لێت خۆش بێ.

خێرا حەسەن باوەشی بەعەلیا دەکاو دەست دەکاتە گریان‌و دەم‌و چاوی ماچ دەکات، داوادەکات کەلێی خۆش بێ.

ئەویش لێی خۆش دەبێت.. ئەگەر دەتەوێ گەورەبی با ئەمە هەڵوێستت بێ.

## ﴿مەڕێکی ژەهراویکراو﴾

جولەکە پیلانێکی خراپو ناهەموار دادەنێن بۆ کوشتنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو مەبەستە ئافرەتێکی جوو مەڕێك سەردەبڕێو دەیبرژێنێ و پاشان ژەهراوی دەکات، بەدیاری دەینێرێ بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش قبوڵی دەکات، چونکە دیاری نەگێڕاوەتەوەو وەری گرتووە. کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بۆ دەبا لێی بخوا دەزانێ ئەم مەڕە سووڕەوەکراوە، ژەهری پیاکراوە، دەنێرێ بەشوێن ئافرەتە جولەکەکەدا، ئافرەتەکە هات، پێغەمبەر (ﷺ) پرسی ئەم کارەت بۆچی کرد؟ ژنە وتی: ویستم بتکوژم.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خوا توانای ئەوەت ناداتێ بەسەر مندا (واتە تۆ ناتوانی من بکوژی) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخێر بڕۆ ئازادیە.

## ﴿نەرم و نیانی لەگەڵ منداڵدا﴾

ئەنەس کوڕی مالیك (ﷺ) منداڵێکی بچوك بوو خزمەتکاری پێغەمبەری دەکرد، ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆ کڕینی پێویستیەك لە بازاڕ، ئەنەس ڕۆشت، لەڕێگادا بینی هەندێ منداڵ یاری دەکەن ئەویش کەوتە یاریکردن لەگەڵیانا، لەبیری چویەوە کە پێغەمبەری (ﷺ) ناردوویەتی بۆ کارێك.

پێغەمبەر (ﷺ) هات بەرەو بازاڕ بینی ئەنەس یاری دەکات لەگەڵ منداڵەکانا، لەدواوە پشت ملی گرت، بەپێکەنینو سوعبەتەوە فەرمووی: ئەنەس بڕۆ بەلای کارەکەتەوە من چیم پێ سپاردی.

ئەنەس وتی: ئێستا دەڕۆم ئەی پێغەمبەری خوا ئەنەس (ﷺ) دەڵێ: خزمەتکاری پێغەمبەر (ﷺ) بووم حەوت ساڵ یان نۆ ساڵ . بیرم نایەت کەشتێکم کردبێت فەرمووبێتی: بۆچی ئەوەتکرد، و یان شتێکم نەکردبێت، فەرمووبێتی خۆزگە ئەوەو ئەوەت بکردایە.

## ﴿نەرم و نیانی لەناو مزگەوتدا﴾

ڕۆژێکیان پیاوێك هاتە ناو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کرد، پاشان ڕۆشت لە سوچێکی مزگەتەکەدا وەستاو دەستی کرد بەمیز کردن، هاوەڵان کە بینیان ڕۆیشتن بۆی ویستیان ڕێگری لێبکەن، پێغەمبەر (ﷺ) بانگی لێکردن‌و فەرمووی وازی لێبهێنن، پاشان فەرمانی کرد ئاو بهێنن بیکەن بەو شوێنەدا کەکابرا میزەکەی لێکردبوو هەتا پاك بێتەوە.

و پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوەڵانی فەرموو: ئێوە بۆ ئەوە ڕەوانە کراون ئاسانکاربن، بۆ ئەوە ڕەوانە نەکراون قورسکاریی‌و ئەزیەتی خەڵك بدەین.

پاشان بانگی کابرای کردو بەشێوەیەکی نەرم‌و نیان‌و لەسەرخۆ فەرمووی: ئەم مزگەوتانە ناکرێ شتی پیسی وەك میزو پیسایی تیا بکرێ، بەڵکو مزگەوت شوێنی یادکردنی خوایە، شوێنی نوێژکردنە، شوێنی قورئان خوێندنە.

## ﴿تاقیکاری بۆ نەرم و نیانی﴾

ئەبو زەری غەفاری (ﷺ) وەستابوو لەسەر بیرە ئاوێك هەتا ئاو بخواتەوە هۆزەکەی بینیان، ویستیان تاقی بکەنەوە بزانن چەندە نەرم‌و نیان‌و لەسەرخۆیە، یەکێکیان نارد بۆ ئەوەی ئەبوزەر توڕە بکات.

یەکێکیان بەتوڕەیی چوو بۆلای ئەبوزەر (ﷺ)، بەڵام ئەو هیچ قسەی نەکرد لەگەڵیاو دانیشت لەسەر زەوی، پاشان ڕاکشا لەسەر لا، پێیان وت: بۆ دانیشتی پاشان ڕاکشای؟

ئەبوزەر فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان توڕەبوو بە پێوە وەستابوو با دانیشێ، ئەگەر توڕەییەکەی بەدانیشتنەکەش نەڕۆی باڕاکشێ.

## «تورەبوون و شەیتان»

ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوو لەگەڵ خەڵکیدا، ناڕەحەتیەك دروست بوو لەبەینی دووپیاوادا، جنێویان بەیەکتردا لەبەردەم پێغەمبەر (ﷺ) یەکێکیان زۆر تورە بوو دەمو چاوی سور هەڵدەگەڕا، یەکێکیان هەستاو ئەو شوێنەی جێ هێشت، بەتوڕەیی ڕۆشت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من وشەیەك دەزانم، ئەگەر ئەم پیاوە بیڵێت ئەوا ئەو حاڵەتە توڕەییەی لادەچێت، بڵێت: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) پەنا دەگرم بەخوا لە شەیتانی نەفرەت لێکراو، پیاوێك لەوانەی گوێی لە پێغەمبەر (ص) بوو هەستاو چوو بۆ لای کابراو وتی: ئەزانی پێغەمبەر (ﷺ) پێش تۆزێك چی فەرمووی؟ فەرمووی: من وشەیەك دەزانم ئەگەر ئەم پیاوە بیوتایە ئەوا ئەو حاڵەتەی لەسەر لادەچوو: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) پەنا دەگرم بەخوا لەشەیتانی نەفرەت لێکراو.

ئەم پیاوە حاڵی نەبوو لەوتە بەنرخو جوانەکەی پێغەمبەر (ﷺ).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: توڕەیی لە شەیتانەوەیە ئەگەر دەتەوێ زاڵبی بەسەر شەیتاندا زۆر پەنا بەخوا بگرە لە فیتنەو ئاشوبی شەیتان، ئەم پیاوە تورە بوونەکەی هەر بەردەوام بوو، کابرا وتی: بۆ بەشێتم دەزانی؟

هیچ نەرمو نیانو لەسەرخۆ نەبۆوە.

## لە كۆتاییدا:

نەرمو نیانی رەوشتێكی گەورەیە، و سیفەتێكی زۆر جوانە، نەرمو نیانی زاڵ بوونە بەسەر دەروونداا لەكاتی توڕەبووندا، نەرمو نیانی بەڵگەیەر لەسەر بەهێزیو زاڵ بوون بەسەر دەرونی خۆتدا.

خوای گەورە خۆی خاوەنی سیفەتی نەرمو نیانیە، (الحلیم)، یەكێكە لەناوە پیرۆزەكانی پەروەردگار.

خوای گەورە دەفەرمووێ: (وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ) البقرة ٢٣٥.

بزانن خوای پەروەردگار خاوەنی سیفەتی لێخۆش بوونو نەرمو نیانیە. نەرمو نیانی سیفەتێكە لەسیفاتی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) و سیفەتێكی جوانە لەسیفاتی ئیماندارانی چاكە خواز و صالح، خوای پەروەردگار ئەو بەندانەی خۆش دەوێ كەخۆیان دەرازێننەوە بەسیفەتی نەرم نیانی، و خوای گەورە ئاوا وەسفیان دەكات. (وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) ال عمران ١٣٤

واتە: رقو كینەی خۆیان دەخۆنەوە و خۆ گرن، لەخەڵكی خۆش دەبنو لێبوردەن، خوای میهرەبانیش چاكەكار و چاكە خوازانی خۆش دەوێت، ئەم چیرۆكانەی خوێندمانەوە لەسەر نەرمو نیانی، وامان لێ دەكات هەمیشە لەبیری گۆڕانكاریو وەرگرتنی چیرۆكی بەسوود بین، و شوێن ئەو كەسانە بكەوین كە خاوەنی سیفەتی جواو نەرمو نیانن.

# كۆمەڵە چیرۆكێك لەبارەی شەرمەوە

نوسینی

منصور علی عرابي

وەرگێڕانی

فاتح شاربازێڕی

# ﴿شەرم (الحياء)﴾

الحياء: شەرم وخۆپارێزی لە شتانێك کەناشیرین یان قەدەغە کراون لەڕووی شەرع و عەقڵ و عورفەوە .

شەرم: ڕەوشتێکە والەمرۆڤ دەکات واز لە کردارو گوفتاری نابەجێ بهێنێ وهەقی خاوەن هەق پێشێل نەکات .

شەرم: پاراستنی نەفس و دەروونە نەبادا تووشی کارێکی ناشیرین بێت وسەرەنجام سەرزەنشت بکرێت .

شەرم سیفاتی خوایە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت: (إنَ ربكم حييٌ كريم يستحي من عبده إذا رفع يديه إليهِ ان يردهما صفراً،ليسَ فيهما شيء)الترميذي وابوداود.

واتە:پەروەردگارتان بەشەرم و بەخشندەیە ،شەرم دەکا لەبەندەکەی کەدەست بەرز بکاتەوە بۆ لای ،ئەو بەبەتاڵی بیگێڕێتەوە.

شەرم بەشێکی غەریزە یە لە مرۆڤدا وەك: شەرم کردن لە دەرخستنی عەورەت و چونە سەرئاو لەبەرچاوی خەڵك...

بەشێکی بەدەست دەهێنرێت کە ئەو بەشەمرۆڤ خۆی هەوڵی بۆ دەدات و ئەنجامی دەدات کە ئەم بەشەیان بە بەشێك لە باوەڕ ناسراوە (والحياء شعبة من الايمان) ئەگەر مرۆڤ جۆری یەکەمی هەبوو شەرم لە خەڵك دەکات، ئەگەر جۆری دووەمیشی بەدەست هێنا شەرم لە خوا دەکات و لە گوناه دوور دەکەوێتەوە.

ئەگەر هیچیانی نەبو شەرم لە خوا و خەڵك ناکات (إن مما أدرك الناس من كلام النبوة الاولى: إذا لم تستحي فاصنع ما شئت)رواه البخاري.

شەرم کاتێك ببێتە هۆی ڕێگرتن لە وتنی هەق و فەرمان کردن بە چاکە ئەوە شەرمە نابەجێ یە.

وە لەکاتی فێربونی زانست و فێرکردندا پێویست بەشەرم ناکات،هەروەتا خوای گەورە شەرم ناکات لە هێنانەوەی نمونە بۆ خەڵك با ئەو نمونە مێشولەیەکیش بێت.

خوای گەورە باسی ئەو کچە دەکات کە دەچێت بانگی پێغەمبەر موسا (علیه السلام) دەکات بۆ لای باوکی دەفەرموێت: ﴿فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ﴾ القصص ٢٥.

واتە:لە شێوازی رۆشتنیدا شەرم دەبینراو بە شەرمەوە بە ڕێگادا دەرۆشت.

باسی پێغەمبەر دەکات ﷺ کە شەرمی لە هاوەڵان کردووە ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡ﴾ الاحزاب ٥٣.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ( هەموو دینێك رەوشتێکی هەیە، رەوشتی ئیسلام شەرمە) ابن ماجه والبيهقي في شعب الايمان.

(الحياء و الايمان قرناء و جميعا، فإذا رُفع احدهما رُفع الاخر) الحاكم و قال صحيح على الشخصين.

(الحياء لا يأتي إلا بخير) البخاري و مسلم.

واتە:شەرم و ئیمان هاوسەنگی یەکترن یەکێکیان نەما ئەوی تریش نامێنێ.

پێشەوا عومەر دەفەرموێت : (هەر کەسێك شەرمی کەم بوو، وەرعیشی کەم دەبێت، کە وەرعی کەم بوو دڵی دەمرێت).

ئیاس کوڕی قوررە دەڵێت: لای پێشەوا (عومەر کوڕی عبدالعزیز) بووم باسی شەرم کرا، وتیان: شەرم بەشێکە لە دین، عومەر فەرووی:بەڵکو هەموو دینە.

- شاعیر دەڵێت:

إذا لم تخش عاقبة الليالي ولم تستحي فاصنع ما تشاءُ
فلا والله ما في العيش خيرٌ ولا الدنيا إذا ذهب الحياءُ

واتە:ئەگەر سەرەنجامی شەو نەترسایت و شەرمت نەبوونەوە هەرچیت دەوێت ئەنجامی بدە، سوێند بەخوا نە ژیان و نە دنیا خێری تیا نیە ئەگەر شەرم و حەیا نەما.

# «شەرمی برسییەك»

ئەبو هورەیرە (ﷺ) ڕۆژێکیان برسیەتی تینی بۆ هێنا، لەماڵ دەرچوو هەتا شێ پەیدا بکات، گەیشت بە ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) ئەبو هورەیرە شەرمی کرد هەواڵی برسیەتیەکەی بە ئەبوبەکر بگەیەنێ، پرسیاری لە ئەبوبەکر کرد دەربارەی ئایەتێك ئەویش وەڵامی دایەوە و پاشان بەجێی هێشت و هەستی بە برسێتی ئەبو هورەیرە نەکرد!

ئینجا عومەر (ﷺ) بەلایدا تێپەڕ بوو، پرسیاری ئایەتێکی کرد، سابەڵکو میوانداری بکات، عومەریش وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە و ئەویش ڕۆشت، دوای ئەوان پێغەمبەر (ﷺ) بەلایدا ڕۆشت و زانی چی لەدڵی ئەبو هورەیرەدایە ، بۆیە لەگەڵ خۆی بردییەوە بۆماڵەوە، جامولکەیەك شیریان هەبوو، فەرمانیدا پێغەمبەر (ﷺ) کەهەموو ئەهلی (صوففە) کە فەقیر بوون لەناو مزگەوتدا دەمانەوە بێن بۆ ئێرە، ئەبو هریرە بێتاقەتی دایگرت لەوەی کە ئەهلی سوفە بێن هیچیان بۆ نامێنێتەوە، بەلام شەرمی کرد لەبەرامبەر پێغەمبەردا (ﷺ) ئەم قسەیە بکات، چو بەشوێنیانا، هەموویان هاتن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیدا کە جامولکە شیرەکەی بۆ بهێنن، ئەهلی صوفە هەموویان لەوشیرەیان خواردەوە، ئەبو هورەیرە جامەکەی وەرگرت تۆزێ شیری تیامابوو، پێغەمبەر (ﷺ) زەردە خەنەیەکی کرد و فەرمووی بیخۆرەوە، خواردییەوە هەتا تەواو تێربوو.

بەبەرەکەتی پێغەمبەر (ﷺ) شیرەکە بەشی هەموویانی کرد.

# ﴿شەرمی ئافرەتێك﴾

رۆژێكیان ئەسما كچی ئەبوبەكری صدیق (ﷺ) دەڕۆشت بەڕێگایەكی دوردا و شتێكی قورسی خستبووە سەرسەری، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵێكیدا گەیشت بە ئەسما، كە بینی ئەسما بەپێ دەڕوات و شتێكی بەسەر سەرەوەیە راوەستا و وشترەكەی یەخدا، تا ئەسما سەربكەوێ لەدوای ئەوەوە، ئەسما شەرمی كرد لەدوای پیاوێكەوە سەر بكەوێ، وەبیری كردەوە لە غیرەتی پیاوەكەی كە زوبەیری كوڕی عەوام بوو (ﷺ) رازی نەبوو سوار ببێ "زوبەیر ناسراوە بەوەی كە پیاوێكی زۆر بەغیرەتە و بەوجۆرە كارانە رازی نابێ.

كە پێغەمبەر (ﷺ) زانی "ئەسما" شەرم دەكات وازی لێهێنا و لەگەڵ هاوەڵەكانی كەوتنەوە رۆشتن.

ئەسما بەردەوام بوو لە رۆشتن بەو شتە قورسەوە كەلەسەر سەری بوو تا گەیشتە ماڵەوە، ئەم بەسەرهاتەی بۆ پیاوەكەی گێڕایەوە.

زوبەیر: بەزەیی پێداهاتەوە و وتی: سوێند بەخوا هەڵگرتنی ئەو شتە قورسە لەسەر سەرت لام گرانترە لەسەركەوتن لەگەڵیدا.



## ﴿شەرم ڕێگرە لە درۆکردن﴾

ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب لەگەڵ هەندێ قوڕەیشیا ڕۆشتن بۆ شام بۆ بازرگانیکردن، هەرقل پاشای ڕۆم نامەیەکی بۆ ناردن تالە دیوانی پادشا ئامادەبن، کاتێ هاتن بۆ دیوانی پاشا، هەرقل وتی: کێتان بە پشت نزیکە لەو پیاوە کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی (ﷺ) دەکات؟

مەبەستی محەمەد (ﷺ) بوو.

ئەبو سوفیان وتی: من نزیکترین کەسم بەپشت لێیەوە، هەرقل وتی: نزیک بەرەوە لێم، با هاوەڵانیشت لەدواوە بوەستن، هەرقل وتی: پرسیارت لێدەکەم لەبارەی ئەو پیاوە درۆم لەگەڵ نەکەی ڕاستو دروست وەڵامم بدەرەوە.

بەهاوەڵەکانیشی وت: ئەگەر درۆیکرد بەدرۆی بخەنەوە.

ئەبو سوفیان دەڵێ: سوێند بەخوا ئەگەر لەبەر شەرم نەبوایە کەحەزم نەکرد درۆم لێ ببینن، ئەو پەیمانەی کەدام بە هەرقل دەم شکاند و بەئارەزوو درۆم لەگەڵ دەکرد، بەلام نەیتوانی درۆ بکا و ڕاستو دروست وەسفی محمد (ﷺ) دەکات.

هەرقل پرسیاری کرد لە سیفاتی پێغەمبەر (ﷺ) وە حەسەبو نەسەبی وەلە هاوەڵانیو بانگەوازکردنەکەی واتە ئەم پیاوە بانگەواز بۆکێ دەکات، ئەبو سوفیان، ئەوەی وت لەبارەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕاستو دروست بوو، شەرمو حەیا وای لە ئەبوسوفیان کرد کە یەك وشەی درۆی دەرنەبڕێ لەبەرامبەر ئەو خەڵکەدا لەوەسفی پێغەمبەردا، ئەوکاتە ئەبوسوفیان بێ باوەڕ بوو، باوەڕی بەئاینی پیرۆزی ئیسلام نەهێنابوو، وەپاش ئەم بەسەرهاتە وردەوردە خوای گەورە ئەبوسوفیانیشی بەشدار کرد لەو نازونیعمەتەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەبوو خوای گەورە هیدایەتی دا.

# «ئازایەتی و شەرم»

لەغـەزوەی خەنـدەقا موسـوڵمانەکان لەشـاری مەدینـە دەورەیـان درا بـوو لەلایـەن بـێ بـاوەڕ و دوو ڕووە جولەکەکانـەوە، بینیـان "عـەمری کـوڕی ود" لەشـوێنێکی تەنگەبـەری خەندەقەکـەوە دەیـەوێ بێتـە ئەمبـەر، هاتـە ئـەم بـەر هاواری کرد لە موسوڵمانەکان کێ دەیەوێ بجەنگێ لەگەڵما بابێتە مەیدان، عـەلی کوڕی ئەبو تالیب (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) من ئامادەم بجەنگێم لەگـەڵیا، پێغەمبــەر (صلى الله عليه وسلم) شمشــێر و مێزەرەکــەی خــۆی پێــداو ڕێگــەی دا کەبجەنگێ لەگەڵ عەمردا.

عەلی بۆی چووە مەیدان، لە نێوانیاندا شەڕ و پێکدادانێکی زۆر ڕویدا، عـەلی یـەك شمشێری کێشا بەسـەری عـەمردا، عـەمر کەوتـە سـەر زەوی‌و مـرد، عـەلی دەستی کرد بەتەکبیر لێدان‌و هاوایکرد "الله اکبر" کە پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) گوێی لـە تـەکبیر و الله اکبری عـەلی بـوو زانـی کـەوا عـەمری کوشـتووە، بۆیـە پێغەمبـەر و موسوڵمانان زۆر دڵخۆش بوون.

عەلی (رضي الله عنه) گەڕایەوە بـۆلای موسـوڵمانەکان بەدڵخۆشـییەوە، عومـەری کـوڕی خەتاب (رضي الله عنه) پێی وت: چۆن بـوو قەڵغانەکـەت نـەهێنا؟ کەلـە نـاو عەرەبـدا لـەو قەڵغانە باشتر و چاکتر نییە.

عەلی(رضي الله عنه) وتی: کاتێك ئاوقای بووم‌و بەشمشێر لێمـدا عـەورەتی دەرکـەوت، منیش شەرمم کرد قەڵغانەکەی لێبکەمـەوە، شـەرم‌و حـەیا ڕێگربـوون لەبـەردەم عەلیدا (رضي الله عنه) تادرعەکەی‌و شمشێرەکەی عەمر بهێنێ.

هەتا سەیری عەورەتی دەرکەوتووی نەکات.

# ﴿شەرمی دوو ئافرەت﴾

لەدەوری بیرە ئاوێك لە ئەرزی مەدیەن، حەزرەتی موسا "سەلامی خوای لێبێت" بینی خەڵك کۆبوونەتەوە و زۆر قەرەباڵغی دروست بووە، دەیانەوێ مەڕ و ئاژەڵیان ئاو بدەن، دوو ئافرەتیش لە دوورەوە وەستاون ڕێگەی لای ئاوەکەیان نییە تا مەڕەکانیان ئاوبدەن، سەرسام بوو تێڕاما، زانی هۆکاری سەرەکی ئەوەیە ئەم پیاوانە بەهێزنو ناهێڵن ئافرەتەکان بێنە پێشەوە مەڕەکانیان ئاوبدەن.

حەزرەتی موسا "سەلامی خوای لێبێت" پرسی لە ئافرەتەکان، وتیان: ئێمە باوکێکی پیرمان هەیە ناتوانی مەڕەکان بهێنێ ئاویان بدات، ئێمەش ئارام دەگرین تا پیاوەکان تەواو دەبن لەئاودانی مەڕەکانیان چاوەڕوانیمان باشترە لەوەی بچینە ئەو قەرەباڵغییەوە، حەزرەتی موسا "سەلامی خوای لێبێت" بەڕێزەوە چاکەی لەگەڵ کردنو مەڕەکانی بۆ ئاودان، پاشان ڕۆشت بۆ بن درەختێکی نزیك لەوناوە، دانیشت تا تۆزێ پشوو بدات.

لەوکاتەدا لەبن درەختەکەدا ڕاکشابوو یەکێ لەکچەکان هات، بەشوێنیدا کەزۆر بەشەرم هەنگاوی دەنا.وتی: (إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ) (القصص: ٢٥).

گەیشتە لای پێی وت: باوکم بانگت دەکاتو حەز دەکات پاداشتی ئەو چاکەیەت بداتەوە کەمەڕ و ماڵاتەکەت بۆ ئێمە ئاودا.

حەزرەتی موسا "سەلامی خوای لێبێت" لەگەڵ کچەکەدا ڕۆشت بۆلای باوکی، بینی پیاوێکی بەڕێز و خواناسو دانا و پاکە، هۆکاری هەڵهاتنی لەمیصرو هاتنی بۆ ئەرزی مەدیەنی بۆ گێڕایەوە، وەئەم پیاوە بەڕێزە حەزرەتی شوعەیب بوو "سەلامی خوای لێ بێت" دڵنەوایی موسای کرد و پێی وت: تۆ ڕزگارت بووە لەدەست ستەمکارو تاوانباران، میواندارییەکی باشیان لە موسا کرد وەیەکێ لە کچەکانی خۆی دایە، ئەو کچەی زۆر بەشەرمو حەیا بوو.

قورئان باسی ڕۆشتنی بەشەرمی ئەو دوو ئافرەتە دەکات ﴿تمشي على إستحياء﴾ کەواتە: ڕۆشتن کەسایەتی خاوەنەکەی نمایش دەکات و تەعبیر لە ناخ دەکات.

# «درەختی پاك و باش»

ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانیان دانیشتبوو، فەرمووی: لەناو درەختەکانا درەختێك هەیە گەڵاکەی ناوەڕێ، وەکو مرۆڤی موسوڵمان وایە، پێم بڵێن ئەو درەختە چییە؟

عبدالله کوڕی عومەر (رضي الله عنه) لەو دانیشتنەدا ئامادەبوو، بەڵام بچوکترین کەسی دانیشتنەکە بوو لەڕووی تەمەنەوە، زانی ئەو درەختە دارخورمایە، بەڵام بینی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) بێدەنگە، وەبینی باوکی کە عومەری کوڕی خەتابە (رضي الله عنه) بێ دەنگە، ئەمیش شەرمی کرد قسە بکات و وەڵامی پێغەمبەر بداتەوە.

ئامادەبوان ناوی زۆر درەختیان وت، بەڵام وەڵامی پرسیاری پێغەمبەر (ﷺ) نەبوو.

وتیان: چییە ئەو درەختە ئەی پێغەمبەری خوا (ص)؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دارخورمایە. کاتێك دانیشتنەکە کۆتایی پێ هات، هاوەڵان هەستان و ڕۆشتن، عەبدولا (ﷺ) هەواڵی دا بەباوکی کەمن زانیم ئەو درەختە دارخورمایە، عومەر پرسی: ئەی بۆ قسەت نەکرد و بێ دەنگ بووی؟ وتی: شەرمم کرد من قسە بکەم و ئێوە هەمووتان بێ دەنگ بوون. عومەر بێتاقەت بوو ڕەخنەی لە عەبدولای کوڕی گرت کە نەدەبوو بێدەنگ بوایە مادام وەڵامی لابووە. عومەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر قسەت بکردایە پێم خۆشتربوو لەوەی وشترێکی گەورەی بەنرخم دەست بکەوتایە. ڕاستە هیچ شەرم و حەیایەك نییە لەبارەی زانستەوە.

# «شەرم لە خوا»

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی برد بۆ ئاسمان بۆ خزمەتی پەروەردگار، خوای گەورە لەوشەوەدا واتە لەشەوی "إسراو ومعراج"دا نوێژی فەرز کرد لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و ئیمانداران، سەرەتا پەنجا فەرز بوو لەشەو ڕۆژێکدا، پێغەمبەر (ﷺ) لە گەڕانەوەدا گەیشت بە حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێبێت) لە ئاسمانی شەشەم.

موسی فەرمووی: خوای گەورە چی بەپێویست گێڕا لەسەر خۆت‌و ئومەتەکەت؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پەنجا نوێژ لەشەو و ڕۆژێکدا.

موسا (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ خزمەت پەروەردگار، ئومەتەکەت توانای ئەم فەرمانەیان نییە. پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ خزمەت پەروەردگار داوایکرد کەبۆی کەم بکاتەوە، خوای گەورە "دە" نوێژیانی بۆ لابرد، گەڕایەوە بۆ لای موسا "سەلامی خوای لێبێت"

حەزرەتی موسا "سەلامی خوای لێبێت" داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد بگەڕێتەوە بۆ خزمەت پەروەردگار.

پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ خزمەت پەروەردگار و داوایکرد کەبۆی کەم بکاتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە هات‌و چوو لەبەینی پەرومردگار و حەزرەتی موسادا "سەلامی خوای لێبێت" بۆ کەمکردنەوەی نوێژەکان هەتا گەیشتە "پێنج" نوێژ لەشەو و ڕۆژێکدا، موسا "سەلامی خوای لێبێت" فەرمووی بگەڕێرەوە بۆلای پەرومردگار.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: شەرم دەکەم لەخوا ئەوەندە هاتم‌و چووم بۆ کەمکردنەوەی فەرزەکان لەشەو ڕۆژێکدا.

خوای گەورەش فەرمووی: بە پێغەمبەر (ﷺ) هەرکەسێ ئەو پێنج فەرزە جێبەجێ بکات، پاداشتی پەنجا نوێژی بۆ هەیە.

# «شەرمی پێغەمبەران»

کاتێـك کـە مرۆڤـەکان هـەموویان کۆبوونەتـەوە لـە دەشـتی مەحشـەر بـۆ لێپرسینەوە لەدوا رۆژدا، موسوڵمانان دەکەونەگفتوگۆ ئایا بچینە لای کێ تکامان بۆ بکات و لەم ناڕەحەتییە رزگارما بکات، دەڕۆن بۆلای حەزرەتی ئادەم "سـەلامی خـوای لێبێـت" باوکـە گـەورەمان، پێـی دەڵـێن: قوربـان هـاتووین بـۆ ئـەوەی لـەم شوێنە رزگارمان ببێ و تاوێ بحەسێینەوە وەحساب و کتابمان لەگەڵدا بکات.

حەزرەتی ئادەم بیردەکاتەوە کەوەختی خۆی پەروەردگار رێگری لێکردووە لە خواردنی بەری ئەو درەختە و ئەم ئەو فەرمانەی لەبیر کـردووە و تووشـی تـاوان هاتووە، بۆیە دەفەرموێ، بەخوا من ئەو کارەم پێ ناکرێ ئەوە کـاری مـن نییـە و شەرم دەکەم.

دەڕۆن بۆلای حەزرەتی نوح "سەلامی خـوای لێبێـت" پێـی دەڵـێن تکامـان بـۆ بکـە، ئـەویش بـیر دەکاتـەوە لـەوەی کـە بانگـەوازی دەکـرد پرسـیاری زۆر لـەخوا کـردووە لەوشـتانەی کـە زانسـتی نـەبووە پێیـان، شـەرم دەکـا و دەفـەرموێ، ئـەو کـارەم پـێ نـاکرێ وەك چـۆن ئـادەم فـەرمووی "سـەلامی خـوای لێبێـت" ئینجـا دەڕۆن بـۆ لای ئیـبراهیم "سـەلامی خـوای لێبێـت" ئـەویش شـەرم دەکـا لـەخوای پـەروەردگار، ئـەویش هـەمان قسـەی حـەزرەتی ئـادەم دەکاتـەوە. ئـەوجا دەڕۆن بۆلای حەزرەتی موسا "سەلامی خوای لێبێت" دەفەرموێ: شەرم دەکـەم لـەخوای پـەروەردگار، منـیش هەرهـەمان قسـەی حـەزرەتی ئـادەم دەکـەم، ئـەوجا دەڕۆن بۆلای حەزرەتی عیسا "سەلامی خوای لێبێت" هەرهەمان قسەی ئادەم دەکاتـەوە "خـوا لێـی رازی بێـت" ئـەوجا دەڕۆن بـۆ خزمـەتی گـەورەمان محەمـەد (ﷺ) دەڵێ: من هەڵدەستم بەوکارە، من هەڵدەستم بەوکارە، داوا لەخوای گەورە دەکات کە ڕێگـەی پێبـدات بـە تکاکردن بـۆ بـاوەڕداران، سـوجدە دەبـات بـۆ پـەروەردگار

سەربەرز ناکاتەوە هەتا پەروەردگار دەفەرموێ: ئەی محمد (ﷺ) سەرت بەرز بکەرەوە، چیت دەوێ داوای بکە، چی دەڵێی بیڵێ گوێم لێتە، ئیزنم دای تکا بکە بۆ هەرکەشتێ دەتەوێت.

پێغەمبەر (ﷺ) سەر بەرز دەکاتەوە و تکا دەکات بۆ باوەڕداران وەسوجدە دەبات هەتا ئومەتی بەدائمی لەدۆزەخدا نەمێنێ مەگەر کەسێ واجبی کردبێ بۆخۆی.

## «بێدەنگی و شەرم»

خاتوو عائیشە (ﭫ) دەفەرموێ: بیستومە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەیفەرموو: کچ دەبێ ئیزنی لێوەربگیرێ، لەکاتی بەشوودانی کچدا دەبێ بەرپرسی ئەو کچە بە کچە بڵێ ئایا تۆ رازی بەو کوڕە یان نا؟

ئەم قسە و باسە پێویستی بە روونکردنەوەی زیاتر هەیە، بابزانین کە کچان شەرم دەکەن لەبەرامبەر بەرپرسی راستەوخۆ بڵێ بەڵێ شوی پێ دەکەم، ئەگەر ئەم پرسیارەی ئاراستە کراو بێ دەنگ بوو وەلامی نەدایەوە، ئەوە لەشەرمو حەیای خۆیەتی بەرامبەر بەرپرسەکەی.

خاتوو عائیشە (ﭫ) بەپێغەمبەر (ﷺ)ی وت: کچان شەرم دەکەن.

پێغەمبەر (ﭫ) فەرمووی: بێ دەنگیان نیشانەی رازی بوونیانە، بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا (ﭫ) پارێزگاری کردووە لە ئافرەتان لەگەڵ ئەوەشدا بەپێویستی گێڕاوە کە کچانو ئافرەتان شەرمیان هەیە، وە ئەو کۆسپو تەگەرانەی لابردووە لەبەردەم هاوسەرگیری کچاندا بەپێویستی داناوە کەباوکان روخسەت لەکچەکانیان وەربگرن بۆ بەشوودانیان.

## «شەرمی پێغەمبەر (ﷺ)»

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) خاتوو (زەینەبی کچی جەحش)ی گواستەوە، نانێکی زۆریان ئامادەکرد، وەخەڵکیان بانگ کرد بۆ نان خواردن، ڕۆشتن بۆ دەعوەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و نانیان خوارد، دەرچوون لەماڵی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام سێ نەفەر مابوونەوە، وەخاتوو زەینەب لە سوچێکی ماڵەکەدا دانیشتبوو چاوەڕێی پێغەمبەر بوو (ﷺ) کاتێك پێغەمبەر هات بینی ئەو چەند کەسە دانیشتوونو قسە دەکەن پێغەمبەر شەرمی کرد لێیانو چووەوە دەرەوە، پاش کەمێکی تر هاتەوە ماڵ سەیری کرد هەردانیشتوون، شەرمی کرد و ڕۆشتەوە دەرەوە، چەند جارێکی تر هاتو ڕۆشت، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) چووە ژوورەکەی خاتوو عائیشە (﵂) دانیشت لەلای، کاتێك زانی کە ئەوان ڕۆشتوون ئینجا چوووەوە ژوورەوە بۆلای خاتوو زەینەب (﵂).

خوای پەروەردگار ئایەتی قورئانی دابەزاند تا موسوڵمانان فێرببن چۆن مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەر بکەن، چۆن سەردانی ماڵی پێغەمبەر بکەن بەتایبەتی، وەبەگشتی فێرببن چۆن مامەڵە و سەردانی یەکتر بکەن، وەکاتێ کە دەعوەت دەکرێی بزانی کاتی تەواو بوو ڕوخسەت بخوازە و بڕۆ.

خوای گەورە دەفەرموێ : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا) (الاحزاب ٥٣).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە مەچن بۆ سەردانی ماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) مەگەر مۆڵەتتان بدرێتو مۆڵەت بخوازن، ئەگەر مۆڵەت دران

بۆ نان خواردنێك چاوەڕێی پێگەیشتنی مەكەن ئەگەر پێنەگەیشتبوو "مەبەست ئەوەیە كە زوو مەچن كەهێشتا خواردنەكە پێ نەگەیشتووە"، بەلاّم كاتێك بانگكران ئەوە بچنە ژوورەوە، جاكاتێك نانتان خوارد بلاّوەی لێبكەن‌و خۆتان بەگفتوگۆوە سەرگەرم مەكەن، چونكە بەڕاستی ئەوكارەتان پێغەمبەر(ﷺ) ئازار دەدات، ئەویش شەرمتان لێ دەكات "داوای چوونە دەرەوەتان لێ ناكات" خواش شەرم لە راگەیاندنی حەق‌و رەوا ناكات.

## ﴿شەرمكردن لەباوەڕەوەیە﴾

رۆژێكیان پێغەمبەر (ﷺ) دەڕۆشت بەیەكێ لە رێگاكانی ناوشاری مەدینەدا، بینی پیاوێك لە پشتیوانان "انصار" سەرزەنشتی براكەی دەكا، وەلۆمەی دەكا لەسەر ئەو هەموو شەرم‌و حەیایەی كە هەیەتی، وە ئامۆژگاری دەكات بەوەی كە ئەوەندە شەرم مەكە و كەمی بكەرەوە، وەشەرمنیت لای خەلّك ناشكرامەكە با فرسەتت لێ نەهێنن.

پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەیدان‌و رونكردنەوەیدا بۆ كابرای پشتیوان‌و فەرمووی: خۆڕازاندنەوە بەشەرم‌و حەیا كەمن‌و عەیب نییە، بەلّكو شەرم كردن جوانی‌و زینەتە بۆباوەڕدار، وەخێر و چاكەیە بۆی، فەرمووی: بەكابرا وازی لێبێنە، چونكە شەرم لەباوەڕەوەیە.

# «شەرمکردن لە مردوو»

کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی فەرموو لە ژوورەکەی خاتوو عائیشەدا (ﷺ) ناشتیان پێغەمبەران "سەلامی خوایان لێ بێت" لەو شوێنەدا کەوەفات دەکەن، دەنێژرێن، خاتوو عائیشە (ﷺ) کە دەچووە ژورەوە بۆ سەردانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ جار عەورەتی دەردەکەوت واتە جلەکانی کورت بوو یان لادەچوو، کاتێک باوکی وەفاتی کرد ئەبوبەکر (ﷺ) ئەویش هەرلەتەنیش پێغەمبەر (ﷺ) ناشتیان.

عائیشە (ﷺ) کاتێک دەچووە سەردانیان، هەندێ لەجل و جەستەی دەردەکەوت، هەروەك ئەوکاتەی کەسەردانی پێغەمبەری دەکرد، دەیفەرموو: ئەمەیان مێردمە و ئەوەشیان باوکمە، واتە ئەمانە مەحرەمن بە من.

حەزرەتی عومەر لەدوای بریندار کردنی لەنوێژی بەیانیدا ناردی بۆلای خاتوو عائیشە فەرمووی: مۆڵەتم بدە لەخزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکردا بمنێژن. عائیشە فەرمووی: ئەو شوێنەم بۆ خۆم دانابوو ئەوا پێشکەشم کرد بەتۆ ئەی عومەر.

کاتێك عومەر وەفاتی کرد (ﷺ) لەخزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکردا ناشتیان.

گۆڕانکاری روویدا لەوڕۆژە بەدواوە خاتوو عائیشە کەبچوایە بۆسەردانیان بەشێوەیەکی پۆشتە و تەواو لەسەرخۆو هێمن دەچووە ژوورەوە، شەرمی دەکرد لەوەی کە شوێنێکی دەربکەوێ لەبەرامبەر پیاوێك کەلە مەحرەمانی ئەو نییە، هەتا ئەو پیاوە مردووش بێ و لەناو گۆڕیشدا بێ، ئەوە لەبەرامبەر عومەردا (ﷺ) کەکەسێکی داوێن پاك و ئەمانەت پارێز و بەشەرم بوو!!

# ﴿گەنجێك كە شەرم ناكات﴾

هاوەڵی بەڕێز (عەبدولاّ کوڕی حارس) (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵێکیدا دەڕۆیشتن بینیان کۆمەڵە گەنجێکی قورەیشی، جلەکانیان داکەندووە بەڕوتی دەگەڕێن بەوناوەدا، وەگەنجەکان جلەکانیان ئاڵاندبوو بەیەکەوە بەستبوویان وەك گوریس هەندێکیان لەهەندێکی تریان دەدا بەو گوریسە وەپێدەکەنین‌و گاڵتەیان دەکرد.

کەعەبدولاّ و هاوەڵەکەیان دی هیچ گوێیان پێنەدان‌و بەردەوام بوون لەسەر گاڵتە و یاری خۆیان هیچ شەرم‌و حەیایەك نەیگرتن لەو هاوەڵە بەڕێزانە، وەپاشان پێغەمبەر (ﷺ) بەوێدا تێپەڕی، کە پێغەمبەریان بەدیکرد بلاّوەیان کرد و رایانکرد خۆیان شاردەوە تا پێغەمبەر (ﷺ) نەیان بینێ، پێغەمبەر (ﷺ) تورەبوو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، فەرمووی: (پاکی‌و بێ گەردی بۆ خوا، شەرم لەخوا ناکەن، بەلاّم شەرم لەمن دەکەن‌و خۆیان دادەپۆشن).

دایکمی ئەیمەن (ﷺ) دانیشتبوو تورەیی بەدەم‌و چاوی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بینی، فەرمووی: داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە لەخوا ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر داوای لێخۆشبوونیان بۆ نەکەی، ئەوە بەردەوام حەیا و شەرمیان دادەبەزێ ئەوکارە دووبارە دەکەنەوە پێغەمبەر (ﷺ) دوعای بۆ کردن.

# ﴿شەرمی ئافرەتێکی خواناس﴾

دەگێڕنەوە کە ئەم ئافرەتە "صحابیە" کەناسراوە بەدایکی خەلاد (خوا لێی ڕازی بێت) زانی کە کوڕەکەی لەغەزادا شەهیدکراوە ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری کرد لەبارەی حاڵو ئەحواڵی کوڕەکەیەوە، دایکی خەلاد نەقابی کردبوو واتە: دەمو چاویشی داپۆشی بوو.

کە خەڵکەکە بینیان سەرسوڕمانی خۆیان دەربڕی لەوەی کەئەم ئافرەتە تەنها مویەکیشی بەدەرەوە نییە و داپۆشراوە، وە دەموو چاویشی داپۆشراوە، کارێك ناکات وەکو ئافرەتانی تر، چونکە بەڕاستی زۆرێك لە ئافرەتان لەمانای پۆشتەییو حیجاب حاڵی نین، بەڵکو ئەم ئافرەتە زۆر ڕەوشت بەرز و بێ فیز و خۆپارێزە، زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە خوای گەورە بەسەری کردۆتەوە بەوەی کەبوومتە دایکی شەهید.

یەکێ لەدانیشتوان وتی: تۆ ئافرەتێکی ئاوایت کەچی هاتووی پرسیار لە حاڵی کوڕەکەت دەکەی. دایکی خەلاد فەرمووی: من کە ئامادەبووم کوڕم لەدەست بدەم هیچ کات ئامادەنیم حەیا و شەرم لەدەست بدەم.



# «شەرمی حەزرەتی موسا "سەلامی خوای لێبێت"»

بەنو ئیسرائیل کاتێ خۆیان دەشۆری، لەبەرامبەر خەڵکیدا خۆیان رووت دەکردەوە دەستیان دەکرد بەخۆشۆرین، ئینجا لەیەکتر ورد دەبوونەوە زۆر بێ شەرمو بێ شورمیی دەبوون.

بەڵام موسا "سەلامی خوای لێبێت" شەرم وای لێکردبوو کە هیچ کات لەگەڵ ئەوان خۆی نەشۆرێ، بەڵکو دوور دەکەوتەوە و بەتەنها خۆی دەشت، گەلەکەی کەوتنە تانەو تەشەردان لە موسا وتیان: موسا عەیبێکی هەیە نایەوێ ئێمە پێی بزانین، خوای گەورە ویستی وابوو کەپاکیو تەواوی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەی دەربخاتو گەلەکەی دەمکوت بکات.

ڕۆژێکیان حەزرەتی موسا "سەلامی خوای لێبێت" رۆیشت بۆ خۆشۆردن لەپەنای بەردێکدا پۆشاکەکانی دانا و خستیە سەربەردەکە، کاتێك خۆی شۆری گەڕایەوە بۆلای بەردەکە تا پۆشاکەکانی لەبەر بکاتەوە، بەردەکە خل بۆوە و کەوتە رۆشتن، حەزرەتی موسا "سەلامی خوای لێبێت" دار عەصاکەی هەڵگرتو دوای بەردەکە کەوت.

دەیفەرموو: جلەکانم بدەرەوە ئەی بەرد، جلەکانم بدەرەوە ئەی بەرد، هەتا کۆمەڵێ لەبەنی ئیسرائیلییەکان گەیشتن پێیان، بینیان ئەوا موسا "سەلامی خوای لێبێت" روتە و جلی لەبەر نییە، وەلاشەی پیرۆزی جوانترین لاشەیە، وەهیچ عیبو عارێکی پێوە نییە.

وتیان: سوێند بەخوا موسا "سەلامی خوای لێبێت" هیچ عەیبو کەمو کورپییەکی نییە.

پاشان موسا "سەلامی خوای لێبێت" بەدار عەصاکەی کێشای بەبەردەکەدا هەتا بزانن لێدان لەبۆ بەردیش هەیە، وەبەنی ئیسرائیلییەکان حاڵی بوون لەوەی کە موسا "سەلامی خوای لێبێت" بەتەنها خۆی دەشوات لەبەر شەرمو حەیاکەیەتی.

## لە کۆتاییدا...

موسوڵمانی زیندوو، شەرمی خۆش دەوێ، وەبزانن شەرم بەشێکە لەباوەڕ، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە لەوبارەیەوە، شەرم یەکێکە لە ڕەوشتە بەرز و جوانەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وەڕەوشتێکی بەردەوامە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: بۆ هەردینێ ڕەوشتێك تایبەت بووە، ڕەوشتی ئیسلام شەرمو حەیایە. وەپێویستە هەموومان خاوەنی ئەم ڕەوشتە بین‌و بەردەوام بین لەسەری، وەپەیوەست بین پێوەی، چوکە شەرم هەمووی خێرە، وەتەنها خێر هەیە لەشەرم کردندا.

شەرم کردن والە مرۆڤ دەکات دەبێتە خۆشەویستی خوا، وەنزیك‌و جێ متمانە و بەڕێزە لای خەڵکی، تەنها شتێکە کە مرۆڤ جوان دەکات لەخەڵکانی تردا، هەمیشە ئەو کەسە چاوەکانی دەپارێزێ، وەلەگەڵ کەسدا بەخراپی مامەڵە ناکات، وەهیچ کات قسەی خراپ‌و ناشیرین ناکات، وەمافی بەرامبەر نافەوتێنێ وەبە خراپە وەڵامی چاکەی خەڵك ناداتەوە، هەموو پێغەمبەرانیش فەرموویانە (ئەگەر شەرمت نەکرد چی دەکەی بیکە واتە: کەسێك شەرمی نەبوو لەخوا، پاشان لە خەڵك‌و لەخۆی گەورەتر و لە باوك‌و دایکی چاوەڕێی هەموو خراپەیەکی لێ دەکرێت.

ئەم چیرۆکەی کە خوێندمانەوە فێرمان دەکات کە کەسێکی بەشەرم‌و حەیا بین، وەشوێن پێی ئەو کەسانە هەلگرین کە خاوەنی شەرم‌و شکۆن، وەدەرس‌و ئامۆژگاری وەرگرین لەو بەسەرهاتانە.

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی بەزەیی

نوسینی

مصطفی احمد علی + أشرف عبدالرؤوف

وەرگێڕانی

فاتح شاربازێڕی

# ﴿بەزەیی ( الرحمة)﴾

**الرحمة: واتە سۆزو بەزەیی و میهرەبانی .**

**جورجانی دەڵێت واتە:مەست گەیاندنی خێرو چاکە بێت بە خەڵك.**

**خوای گەورە خوی خاوەن سۆزو میهرەبانی یە لەبەرامبەر گوناهدا لێبوردەیە.**

-﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ (البقرة: ٥٤).

﴿وَرَبُّكَ ٱلْغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ﴾(الانعام: ١٥٤، ١٣٣، ١٤٥، ١٤٧ ).

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾(البقره: ١٤٣، ١٧٨).

**پێغەمبەر بەسۆزو بەزەیی بۆ جیهان ڕەوانە کراوە** ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾(الانبياء: ١٠٧).

**قورئان ڕەحمەت و سۆزە بۆ باوەڕداران** ﴿وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (الاعراف: ٥٢)

**+ چاکەکاران ڕویان سپی یەو لەژێر ڕەحمەتی خوادان لە بەهەشت دا** ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ (ال عمران: ١٠٧)

**٭مرۆڤ پێویستە بەبەزەیی بێت بەرامبەر مرۆڤەکان بەتایبەت:منداڵ-نەخۆش-بەساڵاچوو -دایك و باوك- گیانداران بە گشتی.**

*خوای گەورە فەرمان دەکات بە منالّ کە بالّی سۆزو میهرەبانیی بەرامبەر دایك و باوکیان ڕابخەن.﴿وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا﴾(الاسراء: ٢٤).

+ هەموو نیعمەت و بەخششەکانی خوا نیشانەی سۆزو بەزەیی خوان بۆ بەندەکانی.

﴿فَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ كَيۡفَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾(الروم: ٥٠).

پێغەمبەرﷺدەفەرموێت:(لاتُنزع الرحمةُ اِلا من شقي )الترمذي (حديث حسن)وابوداود.

(لايرحمُ الله مَن لايَرحمُ الناس)(بخاري ومسلم).

واتە:کەسێ بەدبەخت نەبێت سۆزو میهرەبانی لێ ناکرێتەوە.

-(الراحمون يَرحمهُم الرحمان :أَرحموا أَهل الارض يَرحَمُكُم مَن في السماء)(ابوداود والترمذي (حديث حسن صحيح).

ئەوا ئەی بەسۆزن خوای میهرەبان بە سۆزو بەزەییە لە گەڵیان ،بەبەزەیی بن لەگەڵ خەڵکی سەرزەوی ئەو زاتەی لە ئاسمانە بەبەزەیی دەبێت لەگەڵتان.

عومەری کوڕی عبدالعزیز دەیفەرموو:پەروەردگار ئەگەر من ئەهلی ئەوە نەبم کەبگەمە ڕەحمەت و بەزەیی تۆ ئەوا ڕەحمەتی تۆ شایستەیە بگاتە لای من و منیش بگرێتەوە،ڕەحمەتی تۆ هەموو شتێکی گرتۆتەوە ،منیش شتێکم لەو شتانە،داواکارم لەسۆزی خۆت بێ بەشم نەکەیت ئەی خاوەن سۆز.

فەیرۆز ئابادی دەڵێت:(الرحمة سببٌ واصل بين الله وَبين عبادهِ بها ارسَلَ اِليهِم رُسُلَهُ ،وَانزل عليهِم كتبَهُ ،وَبها هداهُم ،وَبها أسكنهُم دار ثوابهِ وَبها رزقهم وعافاهم).

شاعیر دەڵێت:

(رأفٍ رحيمٍ بأهل البر يرحَمهُم مُقربٍ عند ذي الكرسي مرحومِ)

لسان العرب.

# «کۆترێك و دوو بێچوو»

رۆژێکیان هاوەڵێکی بەڕێز کۆترێکی کێوی دی بەدوو بەچکەوە دوای بەچکەکان کەوت توانی بیانگرێ، کۆترەکە بەسەر سەری هاوەڵەکەدا دەهات‌و دەچوو داوای بێچوەکانی دەکردەوە، سۆز و بەزەیی دایکایەتی ئارامی لێبڕی بوو بۆیان، پێغەمبەر (ﷺ) بینی وا کۆترێکی کێوی بەسەر سەری ئەم هاوەڵەدا دەسوڕێتەوە، دڵی بێتاقەت و غەمبارە بۆ لەدەستدانی دوو بێچووە بچووکەکەی.

پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوەڵەکەی فەرموو: چیتکردووە بە بێچووەکانی؟ بێچووەکانی بۆ بگەڕێنەوە.

هاوەڵە بەڕێزەکە بێچووەکانی گێڕایەوە بۆ کۆترەکە وەخۆشی‌و ئاسوودەیی گەڕایەوە بۆ دڵی دایکە و دوو بێچوەکە بەم شێوە سۆز و بەزەیی ئیسلام بۆ هەموو شێك‌و هەموو شوێنێکە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: باوەڕتان دانامەزرێ هەتا سۆز و بەزەیتان نەبێ.

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموومان بەبەزەین پێغەمبەر فەرمووی: تەنها بەباس کردن بەزەیی ناتکاتە کەسێکی بەبەزەیی، بەڵکو بەزەیت بەهەموو شتەکاندا بێتەوە.

# ﴿میهرەبانیی و بەزەیی﴾

یەکێك لەکچە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی نارد بۆ باوکی کە کوڕەکەی مردووە، داوای لێکرد کە بڕواتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵنێرەکەی ناردەوە و سڵاوی پیانارد بۆ کچەکە، فەرمووی: هی خوای گەورەیە ئەوەی دەیبەخشێ وە ئەوەیش وەری دەگرێتەوە، وەهەموو شتێك وادەی خۆی دیاریکراوە، ئارام بگرن‌و چاوەڕێی پاداشت بن، بۆجاری دووهەم ناردی بەشوێن پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆشت لەگەڵیدا، کۆمەڵێ لەهاوەڵان وەك (سەعدی کوڕی عوبادە، مەعازی کوڕی جەبەل، ئوبەی کوڕی کەعب، زەیدی کوڕی سابت، وەهەندێ هاوەڵی تر...) (رضي الله عنه) لەخزمەتیا بوون، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە جێ منداڵەکەی گرتە باوەشی‌و فرمێسك بەچاوەکانیدا باری بۆ سەر منداڵەکە.

سەعدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە چییە؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەمە سۆز و بەزەییە خوای گەورە خستوویەتیە دڵی بەندەکانی خۆیەوە خواش بەسۆز و بەزەییە لەگەڵ ئەو بەندانەی خاوەنی بەزەیین. (البخاري و مسلم)

# ﴿ماچكردنێكی پاك و بێگەرد﴾

ئەقرەعی كوڕی حابس (ﷺ) سەردانی ماڵی پێغەمبەری كرد بوو، كاتێك دانیشتبوون پێغەمبەری بینی "حەسەنی كوڕی عەلی" كە كچەزای بوو ماچ كرد، ئەقرەع سەری سوڕما لەوكارەی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: من دە منداڵم هەیە تائێستا هیچیانم ماچ نەكردووە!!

ئایا ئێوە منداڵەكانتان ماچ دەكەن؟

من تائێستا ماچم نەكردوون ! كە (١٠) منداڵم هەیە؟!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بەلایەوە سەیر بوو كە ئەم پیاوە واتە ئەقرەع بۆ ئەوەندە وشكە و دڵ داخراوە بەرامبەر بە منداڵەكانی، رووی تێكردوو سەرزەنشتی كرد بەشێوەیەكی زۆر توند.

فەرمووی : "چی بكەم لەدڵێك كە خوای گەورە سۆز و بەزەیی و میهرەبانی تیا هەڵگرتووە!".

واتە: هیچ ناكرێ و ناوترێ لەگەڵ كەسێ كە دڵی بەزەیی تیا نەبێ، وەپێغەمبەر (ﷺ) ئەقرەعی ئاگادار كردەوە لەو دڵ رەقیو وشكیو بێ بەزەییەی.

فەرمووی: ئەوەی بەبەزەیی نەبێ خواش بەبەزەیی نابێ بەرامبەری بەو كەسە. (البخاري و مسلم)

# ﴿دڵێکی گەورە﴾

کابرایەکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك گەیشتە مزگەوتو دابەزی وڵاخەکەی بەستەوە، ئینجا چووە مزگەوتو لەدوای پێغەمبەرەوە نوێژی کرد، لەدوای ئەوەی لە نوێژ تەواو بوون، بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو وتی: خوایە ڕەحم بەمنو محمد بکەی، وەهیچ کەسێکی تر مەخەرە ژێر ڕەحمو بەزەییت.

پێغەمبەر (ﷺ) هەستایەوە و ڕوونی کردەوە بۆ ئەو کابرایە و سەرجەم باوەڕداران، فەرمووی: ڕەحمو سۆز و بەزەیی خوا زۆر فراوانە، بەڵام تۆ ئەی کابرا هەستای ئەو ڕەحمەتەت بچوك کردەوە تەنها بۆ دوو کەس، کاری وا مەکە.چونکە خوای گەورە خاوەنی ڕەحمو بەزەییە، بەزەیی خوا سەد بەشە، یەك بەشی ناردووە بۆ سەرزەوی ئەوەتا جنۆکە و مرۆڤو ئاژەڵو درەختو هەموو شتەکانی گرتۆتەوە، نەوەد و نۆ بەشەکەی تری داناوە بۆ دواڕۆژ کە تایبەتە بە باوەڕدارانەوە. (البخاری)

# ﴿خزمەتکار و قامچی﴾

ئەبو مەسعودی ئەنصاری (ﷺ) ڕۆژێکیان خزمەتکارە لاوەکەی گرتبوو بەقامچی لێی دەدا، منالّە خزمەتکارەکە هاوای دەکرد و دەیوت: پەنا دەگرم بەخوا، پەنا دەگرم بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لەوکاتەدا ئەبو مەسعود ئەوکارەی دەکرد گوێی لە دەنگێك بوو بانگی لێدەکردو دەیوت: باشبزانە ئەبو مەسعود! دەستی هەلگرتو سەیری ئەم لاو ئەو لای خۆی کرد تابزانێ کێیە بانگی لێدەکات، ئەو کەسە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دووبارە بانگی لێکردەوە و فەرمووی: "بزانە ئەبو مەسعود! بزانە ئەبو مەسعود!" ئەبو مەسعود هەستی بەهەڵەی خۆی کردو بەئاگا هاتەوە.

لەشەرمی خوا و پێغەمبەری خوادا قامچییەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بزانە ئەبو مەسعود تۆ چەند بەتوانای بەسەر ئەو خزمەتکارەدا خوای گەورە بەتواناترە لەسەرتۆ!!

ئەبو مەسعود ئیعتزاری بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێنایەوەو وتی: جارێکی تر بەهیچ شێوەیەك لەخزمەتکار نادەم،وەبڕۆ تۆش ئازادبە لەبەرخاتری خوا.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ئەم خزمەتکارەت ئازاد نەکردایە موستەحەقی ئاگری دۆزەخ دەبووی یان (دەستت بەئاگرەوە دەبوو).

# «بەزەیی هاتنەوە بەئاژەڵدا»

ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) دیمەنێکی سەرسامی بینی، بینی پیاوان دانیشتوون لەسەر پشتی ئاژەڵەکانیان، قسەو باس دەکەن لەبەینی خۆیانا، ئاژەڵەکان واتە "وشترەکان" وەستاون پیاوان دانیشتوون لەسەریان وەك کورسی.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پێیان دەڕۆن بەسەلامەتیو بێ زیان، دەگەڕێنەوە پێیان بەسەلامەتی، مەیانکەن بە کورسی لەسەریان دانیشن بۆ قسە و باسی خۆتان لەسەر ڕێگا و بانو بازاڕدا، هەندێ شتی سواری هەیە باشترە لەوەی کە سواری بووە، وەلەسوارە کە زیاتر یادی خوای خۆی دەکات.

بەڵێ بەم شێوە ئیسلام داکۆکی دەکات لەمافی ئاژەڵەکان وەداوا دەکات کەبەسۆز و میهرەبان بین بەرامبەر ئەو ئاژەڵانەی کەلە ژێر دەستماندایە.

بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ئەگەر بەڕێگەدا ڕۆشتن، دەمیان بکەنەوە و ڕێگەیان بدەن باخواردن بخۆن وە خواردنو خواردنەوەیان بدەنێ تا ئەوانیش بە هێزبن وەباشتر کارەکانتان بۆ ڕاپەڕێنن.

جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) تێپەڕی بەلای وشترێکدا بینی پشتو سکی بەیەکدا نوساوە لەبرسانا و وشك بۆتەوە، فەرمووی: لەخوا بترسن لەبەرامبەر ئەزیەت دانی ئاژەڵە بێ زووبانەکان کەبۆ سواری شتێکی چاكو باشن، وەبۆ خواردنیش گەلێك بەسوودن، بەجوانی سواریان ببنو بەچاکی بیانخۆن.

# «بەزەیی هاتنەوە بەبێ باوکدا»

پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت بۆ ماڵی جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیب (رضي الله عنه) هەتا هەواڵیان بداتێ بەشەهید بوونی لەجەنگی موئتەدا، ئەسمائی ژنی جەعفەر دەستی کرد بەگریان، (رضي الله عنها) وەمناڵەکانی دەستیان دایەگریان "عەبدولاّو عون و محمد" (رضي الله عنهم) پێغەمبەر (ﷺ) لەئامێزی گرتن و توند گوشینی بەسنگی خۆیەوە، دەستی کرد بە گریان بۆیان.

بۆ ڕۆژی سێهەم، پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بەشوێن مناڵەکانی جەعفەردا سەرتاشی بانگکرد تا سەریان چاك بكات.

فەرمووی: "محەمەد لە ئەبو تاڵیبی مامم دەچێ، وەعەون شێوەو ڕەوشتی لەمن دەچێ" وە دەستی عەبدولاّی گرت و دوعای بۆ کرد.

فەرمووی: "خوایە عەبدولاّ بکەرە جێگرەوەی جەعفەر، وەبەرەکەت برێژە بەسەر بازرگانییەکەیدا". گەورەترین بەزەییو سۆز، سۆزی ئیسلامە بەرامبەر بەبێ باوکان وەداکۆکی کردن لەمافی بێباوکان و سوور بونە لەسەر بەرژەوەندییەکانیان.

# «گریانی وشترێك»

رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) چووە باخێکەوە، بینی وشترێکی تیایە کاتێك وشترەکە پێغەمبەر (ﷺ)ی بینی دەستی کرد بەگریان فرمێسك بە چاوەکانیا دەهاتە خوارەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) لە وشترەکە نزیك بۆوە، بەدەستە پیرۆزەکانی دەستی هێنا بەسەر وشترەکەدا، وشترەکە گریانەکەی وەستایەوە پێغەمبەر (ﷺ) پرسی کێ خاوەنی ئەم وشترەیە؟

گەنجێکی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە هی منە. پێغەمبەر (ﷺ) رەخنەی زۆری گرت کەبۆ ئەوەندە دڵ رەقی، فەرمووی: پێویستە زۆر بەبەزەیی بن بەرامبەر بەئاژەڵ.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا لە خواناترسی کە ئەم ئاژەڵەی راهێناوە بۆ تۆ کەوا لەژێر فەرمانی تۆدایە.

ئەوەتا شکاتت لێدەکات، بۆ برسی دەکەی؟ لەکاتێکا ئەم وشترە تۆ ئیشی پێدەکەی، وەبارێکی لێ دەنێی کە ناتوانێ، وەحەقی خۆی پێ نادەی لەخواردنو خواردنەوە و ئیسراحەت.

## «ئافرەتێکی بەدیلگیراو»

موسوڵمانان بەسەرکەوتوویی لەیەکێ لە جەنگەکان گەڕانەوە دەست کەوتو دیلەکانیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) کەسەیری دیلەکانی کرد، بینی ئافرەتێکی داماو بێتاقەتو بێ حەوسەڵە دەگەری لەناو دیلەکانا، هەتا مناڵە بچوکەکەی دۆزییەوەو لەئامێزی گرتو شیری پێدا و ئیتر ئارام بۆوە.

پێغەمبەر (ﷺ) لەو هاوەڵانەی کەئەم دیمەنەیان بینی پرسی: باوەڕ دەکەن ئەم ئافرەتە منداڵی خۆی بخاتە ئاگرەوە !؟ هاوەڵان زۆر بیریان نەکردەوە، وتیان: نە بەخوا ! ئەم ئافرەتە ناتوانێ کاری وابکات.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەوشێوەیە (خوای گەورە زۆر بەبەزەیی ترە بۆ بەندەکانی لەو ئافرەتە بۆ منداڵەکەی) بەڵێ ئەمە نموونەیەکە بۆ بەندەکانی خوا کەبزانن پەروەردگار زۆر لەوە بەڕەحمو بەزەیتره بۆ بەندەکانی خۆی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیە ئەم نموونەیەی بۆ هێنانەوە تاتێیان بگەیەنێ کە رەحمو سۆز و بەزەیی خوا هەموو شتەکان دەگرێتەوە.

## «باڵندەیەکی دەستبەسەر»

کۆمەڵێك منداڵ چوونە دەرەوەی مەدینە بۆ یاریکردن، یەکێکیان باڵندەیەکی هێناو توند بەستییەوە بۆ ئەوەی یاری پێ بکەنو نیشانەی لێبگرن هەر تیرێك نیشانەی نەپێکا بۆ خاوەنی باڵندەکە دەبێت.

مناڵەکان هەموویان ئامادەبوون بۆ دەست کردن بەیارییەکە هەموویان تیروکەوانیان ئامادەکرد، یەکێکیان تیری خستە ناو کەوانەکەی نیشانەی خستە سەر باڵندەکە کاتێك ویستی تیرەکە بهاوێژێت هاوڕێکانی ون بوونو دیارنەمان رایانکرد، ئەویش ئاوڕی دایەوە بینی (عەبداللە کوڕی عومەر) (ﷺ) بۆلای ئەو دێت، ئەویش رایکرد و باڵندەکەیان جێ هێشت.

عبدالله کوڕی عومەر (ﷺ) بینی باڵندەکە بەستراوەتەوە پەلەی کرد تا بگاتە فریای، پەتی قاچەکانی کردەوە، ئازادی کردو باڵندەکە هەڵفڕی.

پاشان عبدالله فەرمووی: نەفرەتی خوا لەو کەسانەبێ کەکاری ئاوا دەکەن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی کردووە لەوەی کە شتێك گیانی تیادابێو بکرێتە نیشانە.

## «بەزەیی و ویژدان»

ڕۆژێکیان عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) پێشەوای باوەڕداران، دەڕۆشت بەناو مەدینەدا، پیاوێکی پیری بەساڵا چووی بینی، کابرا پشتی چەمابۆوە، خۆی دابوو بەسەرگۆچانەکەیدا، داوای لە خەڵکی دەکرد کە یارمەتی بدەن، واتە سواڵی دەکرد، ئەم پیاوە پیرە موسوڵمان نەبوو، بەڵکو لە ئەهلی "الذمة" بەوانە دەوتری کەلە دەوڵەتی ئیسلامدا دەژینو موسوڵمانیش نین، ساڵانە بڕێ پارە دەدەن بە دەوڵەتی ئیسلام لەبەرامبەر چاودێریو پاراستنیان ئیتر ئەم کەسە سەر و ماڵو گیانی پارێزراوە وەکو موسوڵمانان.

کاتێك ئەمیری موسوڵمانان بەمەی زانی واتە بەحاڵو گوزەرانی کابرا ئاشنابوو، ئیتر زۆر بەزەیی بەم پیاوە پیرەدا هاتەوە فەرمووی: بەویژدان نەبووین لەگەڵتدا، تاگەنج بوویت ئێمە جزیەمان لێ سەندی، بەپیریش فەرامۆشمان کردوویت بڕیاریدا کەئیتر سەرانە لەم پیاوە وەرنەگیرێ، وەبڕیاری دا کەمانگانە بڕێ پارەی بۆ سەرف بکرێ لەلایەن دەوڵەتەوە کەبەشی پێویستییەکانی بکات.

پیاوە پیرە زۆر خۆشحاڵ بوو وەڕازی بوو بەو بەخشندەییەی ئەمیری موسوڵمانان، وەبەزەییو سۆزی ئیسلام بەرامبەر بە ئەهلی ئیسلامو ئەهلی کتابو سەرجەم خەڵکی.

# «گەڕانەوەی ونبوویەك»

ڕۆژێکیان، سەلاحەدینی ئەیوبی گەورەی موسوڵمانان لەدەوارەکەی خۆیدا دانیشتبوو، ئافرەتێکی غەیرە موسوڵمان هات، بەڵام پاسەوانەکان نەیان هێشت بچێتە ژوورەوە بۆ لای سەلاحەدین، لەنزیکی دەوارەکە دانیشتو دەستی کردە گریان، سەلاحەدین گوێی لە گریانەکە بوو، فەرمانیدا بەوەی ئەو ئافرەتە بابێتە ژوورەوە، کە ئافرەتە چووە ژوورەوە وتی: پیاوەکەم لەجەنگدا بەدیل گیراوە، کوڕە بچووکەکەم دزو ڕێگرەکان گرتوویانەو دیارنییە.

صەلاحەدین بەحاڵی ئەم ئافرەتە بێتاقەت بوو دڵی جولاً و بەزەیی هاتەوە بەحاڵیدا، فەرمانی دا بەئازادکردنی پیاوەکەی کەدیل بوو لایان، پاشان فەرمانیدا بەچەکدارەکانی کە بگەڕێن بەشوێن کوڕی ئەم ئافرەتەدا، چەکدارەکان دەرچوون دەستیان کرد بە گەڕان بە شوێن کوڕەکەدا و دۆزییانەوە، بردیانەوە بۆلای دایكو باوکی، زۆر دڵخۆش بوونو دوعای بەخێریان بۆ صەلاحەدین کرد، صەلاحەدین هەواڵی دانێ کە ئەمە ڕەوشتی ئیسلامە، واتە موسوڵمان دەبێ ئاوا خەم خۆری خەڵك بێ، ئاوا بەبەزەییو بەسۆز بێ، ئیسلام فەرمانمان پێ دەکات کەلەگەڵ هەموو خەڵکیدا بەبەزەیی بین نەك تەنها بۆ موسوڵمان بەڵکو بۆ هەموو خەڵکی.

ئافرەتەکە وتی: دینەکەتان زۆر جوانە کە ئاوا فەرمان دەکات کە بەسۆز و بەزەییتان هەبێ ومیارمەتی لێقەوماوان بدەن.

ئافرەتەکە موسوڵمان بوو، وەپیاوەکەشی موسوڵمان بوو، ئەمەش بەهۆی ئەو هەموو بەزەییەی کەلە ئیسلامدا هەیە، لەبەر ئەوەی کەچون بەشوێن کوڕەکەیدا بەبێ ئەوەی بیناسن.

# ﴿زوو لە شیر بڕینەوە﴾

عومەر کوڕی خەتاب (ﷺ) کەزانی کۆمەڵێك بازرگان هاتوونەتە شاری مەدینە، وەچوونەتە مزگەوت تا لەوێ پشوو بدەن، عومەر لەگەڵ عەبدولرەحمن کوڕی عەوف (ﷺ) دەرچوون بۆ لایان تا ئەو شەوە پاسەوانیو پارێزگاریان لێ بکەن، لەنیوەی شەودا حەزرەتی عومەر گوێی لە دەنگی منداڵێك بوو رۆشت بەرەو لای دەنگەکە و بەدایکی منداڵەکەی وت: لەخوا بترسە و چاك بە لەگەڵ منداڵەکەتدا، پاشان گەڕایەوە بۆلای مزگەوت، وەجارێکی تر ئەمە دووبارە بۆوە، لەکۆتایی شەودا جارێکی تر حەزرەتی عومەر گوێی لەدەنگی گریانی منداڵەکە بوو رۆشتەوە بۆلای دایکی منداڵەکەو وتی: هاوار کەدایکێکی خراپن ئەم دیوە هیچ دایکێك ئەوەندە خراپ بێ بۆ منداڵەکەی ئەم شەو ئەم منداڵە ئارامی نەبوو.

دایکی منالەکە تورەبوو لەقسەکان، "حەزرەتی عومەر"ی نەناسی وتی: ئێمە زوو منداڵەکانمان لەشیر دەبڕینەوە بۆ ئەوەی پارمەتی "بیت المال" بیانگرێتەوە، چونکە عومەر پارمەتی منداڵی شیرەخۆرە نادات.

عومەر زۆر بێتاقەت بوو کەگوێی لەم قسەیە بوو، زۆر گریا، هەتا ئەوەندە گریا لەناو نوێژی ئەو بەیانییەدا خەڵك لەبەر دەنگی گریان گوێیان لە خوێندنی قورئان نەبوو، لەدوای ئەوە کە نوێژ تەواو بوو حەزرەتی عومەر وتی: خراپترین کەس عومەرە، دەبێ چەند منداڵی موسوڵمانانی کوشتبێ، فەرمانیدا بەبانگخواز کە بانگەواز بکات.

بڵێ هیچ پەلەمەکەن لەشیر بڕینەوەی منداڵەکانتان، چونکە لەمەودوا منداڵی شیرە خۆرەش بەشی خۆی هەیە لە (بیت المال).

# «منداڵێك گریا»

لەناوەڕاستی دەشتێکی چۆڵدا کەهیچ سەوزایی‌و ئاوێکی لێنەبوو، حەزرەتی ئیبراهیم بەفەرمانی خوا خاتوو هاجەری خێزانی‌و ئیسماعیلی جگەر گۆشەی هێنایە ئەم شوێنە چۆڵە، وە ئەم ئافرەتە غەیری خوا هیچ کەسێکی ترو پەنایەکی تر شك نابات.

کاتێك ئاوی خواردنەوە کەپێی بوو تەواو بوو، وەمناڵە شیرە خۆرەکەی لەتاو برسیەتی‌و تینویەتی دەگریا، خاتوو هاجر (ﷺ) دڵی دەکولا بۆ جگەر گۆشەکەی کەوتە هاتووچۆ دەچووە سەر تەپۆڵکەی صەفا و دەهاتەوە بۆلای جگەر گۆشەکەی.

دەگەڕا بەڵکو لەشوێنێکەوە چاوی بە ئاوێك بکەوێ یان بەڵکو کەسێك ببینێ لەو ناوەدا بێت بەهانایانەوە یارمەتیان بدات‌و کۆمەکیان پێبکات.

کەهیچی مسۆگەر نەدەکرد دەگەڕایەوە بۆ سەر تەپۆڵکەی مەروە، لەوێش هیچی دەست نەکەوت بەردەوام لە بەینی صەفاو مەروە دەهات‌و دەچوو، خوای پەروەردگار کە ئەمەی بینی لەم دایکە بەمیهرەبانە کەچەندە بەسۆز و بەزەییە بەرامبەر جگەر گۆشەی، ڕەحم‌و سۆز و بەزەیی خوا (جل جلاله) باری بەسەر خاتوو هاجەر و ئیسماعیلی کوڕیدا، ئاوی زەمزەم هەڵقولا لەژێر پێی ئیسماعیل دا، دایکی گەڕایەوە بینی واکوڕەکەی لەناو ئاودا یاری دەکات، خێرا چواردەوری ئاوەکەی گرت نەبادا تەواو بێ خۆی‌و ئیسماعیلی کوڕی تێر ئاوی زەمزەمیان نۆش کرد و سوپاسی پەروەردگاری کرد، بەبەرەکەتی خاتوو هاجەر و ئیسماعیلی کوڕیەوە، خوای پەروەردگار لەو چۆڵەوانی‌و وشکیەدا ئەوئاوەی پەیداکرد و ئەو شوێنەی کردە پیرۆزترین شوێن لەسەر زەویدا.

# «پرسیارێکی قورس»

ڕۆژێکیان گەورەی موسوڵمانان عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ﷺ) دانیشتو کەوتە بیرکردنەوە لە ئیشو کارو حاڵ و ئەحواڵی خەڵك، بیریکردەوە بەرپرسیارێتییەکی قورسو زۆری لەسەر شانە بەرامبەر بەخەڵکی، دەبێ ئەوکارە وەك پێویست جێبەجێ بکات.

کەوتە گریان، گریانێکی زۆر بەهێز هەتا فاتمەی کچی عەبدولمەلیك کەخێزانی بوو هاتە ژوورەوە، بینی وادەستی خستۆتە ژێر چەناگەیەوە و چاوەکانی بەبەردەوامی فرمێسك دەڕێژن، گومانی برد کەشتێك رویدابێ، پرسیاری کرد بۆچی دەگری ئەی عومەر؟

عومەر وتی: ئەی فاتیمە، من کاروباری ئومەتی محەمەد (ﷺ) وا لەگەردنما کەبیرم کردەوە لەحاڵی فەقیر و هەژارەکان کەبرسین، وەلە نەخۆشێك کەپشت گوێ خراوە، کەسێك کەبەرگو پۆشاکی نییە، کەسێك کەستەمی دەرحەق کراوە، وەکەسێك کە ئاوارەیە و هیچی نییە، وەکەسێکی بەتەمەن، وەهەموو هەژارو کەم دەستەکانی جیهان، بیرم کردەوە کە خوای گەورە لە دواڕۆژدا پرسیارم لێدەکات لەبارەی هەموو ئەمانەوە، بۆیە بیرم کردەوە ئەمەبەشی منە لە ئومەتی محەمەد: دەترسم پێغەمبەر (ﷺ) بەرامبەرم بوەستێ لە قیامەتدا و منیش حوجە و بەڵگەم نەبێت لە خزمەت پەروەردگاردا.

وەبەزەییم هاتەوە بەنەفسی خۆمدا و گریام.

ئەمە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ﷺ) ئاوا بیردەکاتەوە و ئاوا لەخوای خۆی دەترسێ لەبەرامبەر ئومەتی محەمەددا (ﷺ) لەکاتێکا ئەم پیاوە زۆر خواناس پەروەردە بووە، هیچ ستەمێکی لە خەڵك نەکردووە، وەنەوەندە ترسی دواڕۆژ لەدڵیا بووە هەمیشە بەکارەکانییەوە دیار بووە کە کەسێکی زۆر لەخوا ترسە، گریانی بۆ حاڵی خۆی دێ، بەزەیی بەحاڵی خۆیا دێتەوە.

## لەکۆتاییدا...

بەزەیی سیفەتێکی زۆر گەورە و جوانە یەکێکە لە رەوشتە بەرزەکانی ئیسلام، خوای گەورە دایناوە لەسەر نەفسی خۆی کە بەبەزەیی بێ، ئەویش سیفەتی "الرحمن والرحيم" قال تعالى: ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ أَنَّهُ مَن عَمِلَ مِنكُمْ سُوءًا بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابَ مِن بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (الانعام ٥٤).

واتە: مژدەبێ لێیان کە پەروەردگارتان فەرزی کردوە لەسەر خۆی کەلە ئاقاری ئێوەدا بەڕەحم‌و میهرەبان‌و دلۆڤان بێت.

وەبەزەیی سیفەتێکە لە سیفەتەکانی پێغەمبەران "سەلامی خوایان لێبێت" پێغەمبەرەکەمان محمد (ﷺ) بەزەیی بلاّوکردەوە لەسەر زەویدا.

قال تعالى: ﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ (التوبة ١٢٨).

واتە: ئەی خەڵکینە سوێند بەخوا پێغەمبەرێکتان بۆ رەوانە کراوە کە هەریەکێکە لەخۆتان، زۆر سەختە بەلایەوە تووش بوونتان بەبەلاّو ناخۆشی، زۆر بەتەنگیشتانەوەیە و بەپەرۆشە لەسەرتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانە و میهرەبان‌و دلۆڤانە بۆیان.

خوای گەورە وەسفی بەندە خواناسەکانیش دەکات کە زۆر بەبەزەین بەرامبەر بەیەکتری.

قال تعالى: [محمد رسول الله والذين معه أشداء على الكفار رحماء بينهم].

واتە: محمد (ﷺ) رەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کەلە خزمەتیدان‌و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێ باوەڕان‌و بەبەزەیی‌و میهرەبانن لەنێوان خۆیاندا.

وەبەزەیی بریتییە لەخۆشەویستی‌و نەرم‌و نیانی‌و هەڵس‌و کەوتی جوان‌و پاراستنی هەستی یەکتر و هەستکردن بەشتە باش‌و جوانەکان، وەکەسی بەبەزەیی

هەمیشە دەمو چاوی گەشو جوانە، دوورە لەدڵ ڕەقیو وشکیو توڕەیی، چی لەوە جوانترە کە مرۆڤ خۆی بڕازێنێتەوە بەم ڕەوشتە قورئانیانە.

وە ئەم چیرۆکو بەسەرهاتانەی کە دەیخوێنیتەوە نموونەیەکی جوانی بەزەیت پیشان دەدا، هەتا فێر ببین کە کەسێکی بەبەزەیی بین، وەشوێن ئەو کەسانە بکەوین کەخاوەنی سیفەتی بەزەین، وەکارێ بکەین لەڕیزی بەزەیی خوازانا جێمان بێتەوە.



# چەند چیرۆکێك لەبارەی ئازایەتی و جوامێری

نوسینی

محمد محمود القاضي + مصطفى احمد على

وەرگێڕانی

فاتح شاربازێڕی

# ﴿ئازایەتی و جوامێری (الشجاعە)﴾

الشجاعة: کەسێکە پێش دەکەوێت وهەڵمەت دەبات و جەریئەو خۆ ڕاگرە لە ناڕەحەتی دا.

الشجاعة: جاحظ دەڵێت: واتە: ئازایەتی و چونە پێش بۆ ناو ناڕەحەتی لەکاتی پێویست دا ئەم ڕەوشتە ئاستی مامناوەندی یە لە نێوان (ترس و هەڵچوندا) خوای گەورە باسی دامەزراوی وئازایەتی شوێن کەوتەی پێغەمبەران ﷺ دەکات کەچەند ئازاو چاو نەترس بوون و لاوازی ڕوی تێ نەکردون،

﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (ال عمران: ١٤٦).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةً فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾(الانفال ٤٥).

لێرەدا خوای گەورە فەرمانی چەسپاوی و نەترسان و دامەزراوی دەدات لە هەرجۆرە ڕوبەڕوبونەوەیەکی بێباوەڕاندا.

﴿وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾(ال عمران ١٣٩)

*عن انس ﷺ أنهُ قالَ:كانَ النبيُ ﷺ أحسن الناس واشجع الناس وأجود الناس ولَقد فزِع أهلُ المدينة،فكان النبي سبقهُم على فرس ،وقالَ:وجدناه تجراً)البخاری ومسلم.

واتە: پێغەمبەرﷺ باشترین کەس و ئازاترین کەس و بەخشندەترین کەس بوو خەڵکی مەدینە دەترسان ،پێغەمبەرﷺ بەسواری ولاخێکەوە پێشیان کەوت و نەترسا زۆر بەخێرایی غاری بەئەسپەکەی دەکرد.

*(الشجاعُ محَحَببٌ حتى الى عدوة،والجبانُ مُبغضٌ حتى الى أمهِ)صفوة الاخبار/٨٢ .

*(الشجاعُ يبادرُ للحرب غيرَ مبالٍ بها لثقتةِ بنفسة وعزمة على التغلب على عدوهُ لكنهُ في نفس الوقت يُفرِق بين الشجاعة والتهور والاقدام،وانتظار الفرصة المناسبة لينقضَ)صفوة الاخبار/٨٢.

## ﴿ئازایەتیی عەبباس﴾

**لەغەزوەی تائیفدا، پێغەمبەری (ﷺ) "حەنزەلەی كوڕی ڕەبیع"ی (ﷺ) نارد بۆ تائیف، تا بانگیان بكات بۆ ئیسلام و بەشێوەیەكی جوان باسی ئیسلامیان بۆ بكات.**

**كاتێك حەنزەلەی ڕۆیشت بۆلایان تابانگیان بكات بۆ ئیسلام ئەوان وەلامیان نەدایەوە، وەدەست درێژیان كردەسەری و ئەزیەتیاندا، شاردیانەوە، ویستیان بیخەنە قەلایەكەوە زیندانی بكەن، كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) زانی داوای كرد كەیەكێك لە هاوەلان بچێت بەهانای (حنظلة) ڕزگاری بكات لەدەستی ئەو بێباوەڕانە.**

**فەرمووی: كێ لەئێوە دەچێت، بەوێنەی هەموو ئەم غەزاكارانە پاداشت وەرگرێ لای خوای گەورە؟**

**كەس هەلنەستایەوە تەنها "عەباس كوڕی عەبدولەلیك" (ﷺ) ڕۆیشت بەدەم "حنظلة"وە تا ڕزگاری بكات، كەگەیشت "حنظلة" بەدەست كافرانەوە بوو، دەیانویست بیبەن بۆ قەلاكە و بەندی بكەن، ڕزگاری كرد لە دەستیان و شاردیەوە، هیچ نەترسا لەو هەموو بەردانەی كەتێیان دەگرت، عەباس گەڕایەوەو "حنظلة"یش لەگەلیا بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێشتا دوعای ڕزگاربوونی بۆ دەكرد.**

# ﴿جەنگاوەرێکی بەهێز﴾

لەغـەزوەی ئەحزابـدا هەنـدێ لەموشـریك توانیـان بازبـدەن بەسـەر ئـەو خەندەقەدا کە کێشرابوو بەدەوری مەدینەدا لەلایـەن موسـوڵمانانەوە یـەکێ لـەو بێباوەڕانە "عمرو بن ود" پیـاوێکی ئـازا بـوو، دەترسـان لـە ئازایـەتیو چاپوکی، عەمر بانگی کرد لە موسوڵمانان کێ خـۆی بەجـەنگاوەر دەزانـێ بابێتـە مەیـدان، کەس نەچووە دەرەوە بـۆی، زۆر دڵخـۆش بـوو بـەوەی کـەس نەچـوو بەدەمیـەوە لەخۆی بایی بوو.

ئەم جارەیان وتی: ئایا کەسێك هەیە لەناو ئێوە بتـوانێ لەگـەڵ مـن بجـەنگێ، بـەڵێ عـەلی کـوڕی ئـەبو تاڵیـب (ﷺ) هەسـتایەوە، ئامـادەبوو لەگـەڵ "عـەمر" بجەنگێ، پێغەمبەر (ﷺ) ڕازی بوو نزای بـۆ کـرد فـەرمووی: خودایـە سـەریبخە بەسەریدا.

عەلی بۆی چووە مەیدانەوە سەرەتا بانگی لێکرد بـۆ ئـەوەی موسـوڵمان ببـێو باوەڕ بهێنێ، بەڵام عەمر ڕەدیکردەوە ئەوەی خستە بەردەم عەلی کـە بگەڕێتـەوە یا نەکوژرێ، بەڵام پێشەوا عەلی ئەوەی ڕەد کردەوە، چووە پێشەوە بۆشـەڕ کـردن لەگەڵ عەمردا.

لەسەرەتای شەڕ هەردوولا زۆر ئازایانە جەنگان، بەڵام ئەمجارە عـەلی هێرشـی بردە سەر و هەروەك هەڵۆ ئەوەبوو کوشتیو بـەدەنگی بـەرز "الله اکبر"ی کـرد موسوڵمانانیش هەموو پێکەوە خۆشحاڵیان دەربڕیو "الله اکبر" یان کرد.

# ﴿ئازایەتیی حەمزە﴾

جارێکیان ئەبو جەهل دەڕوات بەلای پێغەمبەر (ﷺ) لە صەفا، جنێوی پێدەدا و ئەزیەتی دەدات، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) هیچ وەڵامی ناداتەوە، وەپشت گوێی دەخات و دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، ئافرەتێ ئاگای لەم ڕووداوە دەبێت. حەمزە کوڕی عبدالمطلب (رضي الله عنه) مامی پێغەمبەر (ﷺ) لەڕاوکردن دەبێ لەدەرەوەی مەککە، لەڕێگای گەڕانەوەیدا دەگات بەو ئافرەتە، ئافرەتەش هەواڵەکە دەگەیەنێ بەحەمزە، حەمزە زۆر تووڕە دەبێ، دەڕوات بۆ دەوری کەعبە و کەوانەکەی بۆ ڕاو بەکاری دەهێنا بەدەستیەوە بوو، کاتێك دەگات بە ئەبوجەهل بەهەموو هێزی خۆی کەوانەکە دەکێشێ بەسەری ئەبو جەهلدا، زۆر بەتوندی بریندار دەکات، ئەوجا بەئەبوجەهل دەڵێ، تۆ جنێو بە محمد (ﷺ) ئەدەی لەکاتێکدا من لەسەر دینی ئەوم، ئەوەی ئەو دەیڵێ منیش دەیڵێم، جاچیت لەدەست دێ بیکە!!

پیاوانی هۆزەکەی هەڵدەستنەوە تا تۆڵە لەحەمزە بکەنەوە، ئەبو جەهل دەڵێ: واز لەباوکی عیمارە بهێنن، ڕاست دەکات وازی لێبهێنن من جنێوی زۆر ناشرینم داوە بە برازاکەی.

## «ئازایەتیی قوتابییەك "أنصاری"»

لەسەرەتای غەزوەی ئەحزابدا، هەواڵێکیان دا بە پێغەمبەر (ﷺ) کەبەنی قورەیزە ئەو پەیماننامەیەی شکاندووە لەگەڵ موسوڵماناندا، چونە پاڵ موشریکەکان ومبڕیاریانداوە لەگەڵ قوڕەیشدا دژایەتی موسوڵمانان بکەن. پێغەمبەر (ﷺ) بەو هاوەڵانەی دەوروبەری فەرموو کێ دەچێ هەواڵێکی ناو بەنی قورەیزەمان بۆ بێنێ؟

زوبەیر کوڕی عەوام (رضي الله عنه) فەرمووی: من پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆجاری دووهەم فەرمووی: کێ دەچێ هەواڵێکمان بۆ بهێنێتەوە؟ زوبەیر وتی: من.

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر سەرسام بوو هەڵوێستو ئازایەتی زوبەیر (رضي الله عنه).

پاشان فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێ قوتابیو پشت گیرێکیان هەبووە! قوتابیو پشت گیری من زوبەیرە.

## «ئازایەتی بەسەر لوتکەی ڕمەوە»

لەجەنگی یەمامەدا، موسوڵمانان لەگەڵ سوپاکەی موسەیلەمەی درۆزن کەوتنە جەنگەوە، موسەیلەمە بانگەشەی دەکرد بۆخۆی کە پێغەمبەرە بۆیە سوپاکەی موسەیلەمە ئەوەیان کەمانەوە ڕایان کرد لەدەستی موسوڵمانان، چونە ناو باخێکی بەرز کەدەوری گیرابوو، ومدەرگای باخەکەیان داخستوو، موسوڵمانان نەیان توانی بچنە ناو باخەکەوە، بەلام بەرائی کوڕی مالك (رضي الله عنه)وتی: بمخەنە سەر ڕمەکانتانو هەڵمدەنە ئەو دیو، تادەرگاکە بکەمەوە.

بەڵێ کۆمەڵیان بەستو بەرائیان بەرزکردەوە، ئەویش خۆی هەڵدایە ئەودیو پەرژینەکەوە، لەگەڵ دەرگا وانەکە کەوتە شەڕ تاگەشتە دەرگاکەو کردییەوە، ئیتر موسوڵمانان وەك لافاو دایان بەسەر سوپاکەی موسەیلەمەدا و موسەیلەمەیان کوشت، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری سەربازەکانی.

# «ئازایەتیی ئەبوبەکری ڕاستگۆ»

لەدوای مردنی پێغەمبەر (ﷺ) زۆرێک لە قەبیلە و هۆزی عەرەبەکان هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، هەندێ لەو هۆزانە ڕێگرییان دەکرد لەوەی کە زەکاتی ماڵەکانیان بدەن، خەلیفە ئەبوبەکر (ﷺ) بڕیاری جەنگی لەگەڵ ئەوکەسانەدا زۆرێک لە هاوەڵان کەوتنە ئامۆژگاریکردنی حەزرەتی ئەبوبەکر کەچۆن دەتوانن بەرەنگاری ئەو هەموو خەڵکە ببینەوە، عومەر کوڕی خەتاب (ﷺ) فەرمووی: چۆن خەڵک دەکوژی لەکاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: فەرمانتان پێ دەکەم بەجەنگ لەگەڵ خەڵکی هەتا دەڵێن: هیچ خوایەک نییە جگە لە "الله" کە شایستەی پەرستن بێت، هەرکەس وتی: "لا الە الا الله" ئەوە قەدەغەیە لەمن ماڵیو نەفسی مەگەر بەهەقو حسابی خوانەبێ، بەڵام ئەبوبەکر ئامادەبوو وەبڕیاریدا و فەرمووی: سوێند بەخوا ئەوەی فەرقو جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکاتەوە دەجەنگم لەگەڵیدا، چونکە زەکات هەقی ماڵو سەروەتە، سوێند بەخوا ئەگەر "لغاوێک" کە دابێتیان بە پێغەمبەر (ﷺ) ئێستا ئامادەنەبن بیدەن، لەسەر ئەوەش لەگەڵیان دەجەنگم.

عومەر وتی: سوێند بەخوا ئەوەی من دەیبینم تەنها خوای گەورە سنگی ئەبوبەکری فراوان کردووە بۆ ئەوکارە واتە جەنگ کردن لەسەر زەکات، وەئێستا ئەزانم کە ئەبوبەکر هەقو ڕاستە.

## لەکۆتاییدا...

ئازایەتی سیفەتێکی زۆر جوانە لەسیفاتی ئیمانداران وەسیفەتی ئازا و گەورەکانە.

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئازاترین کەس بووە، وەپاشان هاوەڵە بەڕێزەکان (رضي الله عنه).

ئازا ئەو کەسەیە کەڕووبەڕوی ئازا و ترس دەبێتەوە، دەست پێشخەری دەکاتو لەکاتی تورەبوندا خۆی رادەگرێت وەلەگەڵ بونی مەترسی ئەو ئەرکی سەرشانی جێبەجێ دەکات وەکاری پێویست دەکات بۆ لابردنی هەموو ترسو بیمێك کەبەرەو رووی دێ، وەیان هەست بەترسی ئەو شتە دەکات.

ئازایەتی تەنها مەبەست پێی هەڵگرتنی چەكو شمشێر و جەنگو بەشداری شەڕ نییە.

بەڵکو زۆر کارەکانی رۆژانەمان پێویستی بەجۆری لە ئازایەتی هەیە، ئەویش پێی دەوترێ ئەدەبیاتی ئازایەتی، ئەم چیرۆکانەی خوێندمانەوە فێرمان دەکات کە کەسێکی ئازا و دلێر و جوامێربین، وەلەناخی خۆما واتە لەدەرونو نفسی خۆمانا دامەزراوی بچێنین.

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی شوکرانەبژێری

نووسینی
محمد محمود القاضي

وەرگێڕانی
جعفر محمد الماس

## ﴿شوکرانە بژێری (سوپاسگوزاری)﴾

الشکر: واتە دەرخستن وئاشکراکردنی بەخششێك کەپێت دراوەو پاشان بزانی کە خوای گەورە ئەو چاکەی لەگەڵ کردوویت وسوپاسگوزاری بیت.

ابن القیم دەڵێت:شوکر/ واتە: دەرکەوتنی شوێنەواری نیعمەتەکانی خوا بەشێوەیەك زوبان سوپاسگوزاربێت،لە دڵی دا خوای لاخۆشە ویست بێت ،وەلەئەندامەکانی لاشەیدا مل کەچ وگوێڕایەڵی خوا بێت.

-سوپاسگوزاری بەشێکە لەعیبادەت و بەندایەتی﴿وَٱشۡكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ﴾(البقرە: ١٧٢).

-سوپاسگوزاری مایەی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوایە﴿وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡ﴾(الزمر: ٧).

-خوای گەورە لەهەرجێگەیەکی قورئاندا باسی نیعمەتێکی کردبێت (ماددی یان مەعنەوی) لەکۆتایدا فەرموویەتی (لعلکم تشکرون) واتە: بۆیە ئەو بەخششەتان بیر دەخەینەوە تاسوپاسگوزاربن. ئەمەش لەسورەتەکانی (البقرە ١٨٥ ،ال عمران ١٢٣ ،المائدە ٦ -٧ ،٨٩ ،الانفال ٢٥ ،٢٧ ،ابراهیم ٣٧ ،النحل ١٤ ،٧٨ ،الحج ٣٦،القصص ٧٣ ،الروم ٤٦،فاطر ١٢ ،الجاثیة ١٢- ١٣ ) دەبینرێت.

-سوپاسگوزاری تەنها بەزوبان تەواو نی یە ،بەڵکو دەبێت لەکردەوەدا ڕەنگ بداتەوە بەشێوەیەك ئەو نیعمەتە (زانست، ماڵ، جوانی، پلەوپایە.....)

لەڕەزامەندی خودا بەکار ببرێت.﴿ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ﴾(سبا: ١٣).

-پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:کەسێك خواردنێك دەخوات وسوپاسگوزارە پاداشتی ڕۆژووگری بەئارامی بۆهەیە (إنَ لِلطاعم الشاكر مِنَ الاجر مثلَ مالِلصائم الصابر) (الترمذي ،حسن) (وابن ماجة واحمد).

★ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (لايشكُر الله مَن لايشكر الناس)ابو داود والترمذي وقال(حسن صحيح)واحمد.

*عجباً لأمر المؤمن إنَ امرهُ كُلهُ خير،وَليسَ ذلك لأحدٍ إلا لِلمؤمن،إن أصابتهُ سراء شكر فكان خيراً لهُ وَإن اصابتهُ ضراء صبرَ فكانَ خيراً لَهُ)(مسلم).

★عومەری کوڕی خگاب دەفەرموێت:توشی هەربەلایەك بووم ،چوار نیعمەتم تیا بینیوە ئەوبەلایە لەدینمدا نەبووە،بەلای گەورەتر نەبوو،ڕازی بووم ولەڕازی بوون لێ ی بێبەش نەبووم،وەچاوەڕێی پاداشتم کردووە بەرامبەر ئارامگرتن لەسەر ئەو بەلایە.

-شاعیر دەڵێت:

علامةُ شكر المرء إعلان حمدهِ  فمن كتم المعروف منهم فما شكَرَ.

واتە:نیشانەی سوپاسگوزاری مرۆڤ ڕاگەیاندن و ئاشکرا کردنی سوپاسە بۆ خوا،هەر کەس چاکەی خەڵك بشارێتەوە لە خەڵك ئەوە سوپاسگوزار نەبووە.

+ژیران وتوویانە:(مَن قَصُرَت يَداهَ عن المكافأة فاليُطلِ لسانهُ بالشكر) ئەگەر دەستت کورتە لە پاداشت،با زوبانت هەبێت بۆ سوپاس کردن.

# «شوکری پێغەمبەران»

پێغەمبەری خوا (سولەیمان) "سەلامی خوای لێبێت" لەزمانی باڵندە و ئاژەڵانی دەزانی، ئەوەبوو ڕۆژێکیان لەگەڵ سوپاکەیدا بەشیوێکدا تێدەپەڕین، گوێی لەوتەی مێرووولەیەك بوو کە دەیوت بەهاوەڵانی (يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ) النمل١٨.

واتە: ئەی مێرووولەکان بچنە ماڵەکانتان تانەبن بەژێر پێی سەربازەکانی حەزرەتی سولەیمانەوە، چونکە ئەوان ئاگایان لەئێوە نییە.

کاتێك (سولەیمان) گوێبیستی وتەی مێرووولە بوو دەستەکانی بەرز کردەوە و فەرمووی (رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ) النمل ١٩.

واتە: حەزرەتی سولیمان وتی: پەروەردگارا یارمەتیم بدە دڵو دەروونو ڕۆحو گیانم کۆبکەرەوە، تاسوپاس گوزاری ناز و نیعمەتەکانت بکەم کەبەسەر منو دایكو باوکمدا ڕژاندووتە، هەروەها کۆمەکیم بکە تاکار و کردەوەی چاکە ئەنجام بدەم کەتۆ پێی ڕازیت، بەرەحمەتو میهرەبانی خۆت بمخەرە ریزی بەندە چاکەکانتەوە.

ڕۆژێك لە ڕۆژان پەپۆسلیمانە هەواڵێکی هێنا، کە خەڵکانێك هەن لەوڵاتی سەبەو خۆر دەپەرستن، حەزرەتی سولەیمان بانگەوازێکی نارد بۆیان تا بانگیان بکات بۆ خواناسیو خواپەرستی، ئەوانیش گوێڕایەڵ بوونو هەموویان ئیمانیان هێنا، بۆیە حەزرەتی سولەیمان داوایکرد لەدەستو پێوەندەکەی کە عەرشی پادشای وڵاتی سەبەوی بۆ ئامادە بکەن لێرەدا، کەسێکی زانا لەماوەی تروکانی چاودا ئامادەی کرد، پاشان بەندە زاناکە ڕوویکردە خوای خاوەن نیعمەتەکانو سوپاسی کرد و وتی: (هذا من فضل ربی لیبلونی ءأشكر ام أكفر ومن شكرفأنما يشكر لنفسه ومن كفر فإن ربی غني كريم).

واتە: ئەمە لە فەزڵو نیعمەتەکانی خوایە پێی بەخشیوم تاکو تاقیکرێمەوە لەسەری، ئایا سوپاسگوزارم یان بەدنمەكو ناشکور، جائەوەی سوپاس گوزار بێت ئەوە بەڕاستی سوپاسگوزارە بۆ خۆی، ئەوەش کە سپڵەیە، ئەوە بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەند و بێ نیازە و خاوەنی بەخششە بەهەمووان .

## «سوپاسگوزاری»

یەکێك لە بەندە صاڵحەکان بەڕێگەیەکدا تێپەڕی، چڵە دڕکێکی لەسەر ڕێگەکە بینی ترسا لەوەی ئازاری موسوڵمانان بدات، لەبەر ئەوەی پیاوێکی چاك بوو حەزی لەخێر بوو، پێی ناخۆش بوو خەڵکی ئازاریان پێبگات، بۆیە چڵە دڕکەکەی هەڵگرتو بردی تادووری خستەوە لەڕێگاکە، پاشان سوپاسی خوای کرد لەسەر ئەوەی یارمەتیدا بۆ ئەنجامدانی ئەوخێرە، خوای گەورەش لەتاوانەکانی خۆش بوو خستییە بەهەشتەوە.

بەڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (کەسێك بەڕێگادا دەڕۆیشتو چڵە دڕکێکی لەسەر ڕێگەکە بینی ئەویش چڵە دڕکەکەی دوورخستەوەو شوکری خوای کرد لەسەر ئەوکارە، خوای گەورەش لێی خۆش بوو).

ئەم کارە جوانە یەکێکە لەوکارانەی کەئاینی پیرۆزی ئیسلام هانمان دەدات بۆ کردنیو فەرمانمان پێ دەدات بەلابردنی شتانێك لەسەر ڕێگە کەئازاری خەڵك بدەن، چونکە موسوڵمان دەبێت کەسێکی دڵسۆز و خزمەتگوزار بێت، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (أدناها أماطة الاذى عن الطريق) واتە: نزمترین پلەی باوەڕ بریتییە لەلابردنی شتانێك لەسەر ڕێگادا کەئازاری خەڵك بدات صەدەقەیە واتە خێرێکی گەورەیە.

# «وشترەکانی کابرای گول»

خوای گەورە فریشتەیەکی نارد بۆ لای پیاوێك کە گول بوو بوو لەناو بەنی ئیسرائیلدا تاکو تاقی بکاتەوە فریشتەکە وتی بەپیاوەکە حەز لەچی دەکەیت؟ کابرا وتی: سەروسیمایەکی جوانو پێستێکی ناسكو خاوێن، فریشتەکە دەستی خستە سەر کابرای گول خێرا شیفای بۆ هاتو چاك بوویەوە، پاشان فریشتەکە فەرمووی حەزت لەچ ماڵو سەروەتێکە؟ کابرا وتی: حەزم لە وشترە، فریشتەکە بەفەرمانی خوا دەوشتری پێ بەخشیو بەجێی هێلاً.

پاش ماوەیەك وشترەکان بەهۆی زاوزێوە زیادیان کرد و کابرای گول دەوڵەمەند بوو، فریشتەکە ئەمجارە لەشێوەی پیاوێکی هەژاری نەخۆشو توشبوو بەگولی ڕوویکردە کابرا و وتی: دەمەوێت بچم بۆ شارێکی تر و پێویستم بەوشترێکە بۆ ڕێگە تاسواری ببم داوای یارمەتیت لێدەکەم، کابرا داواکەی ڕەتکردەوە و هیچی پێنەدا، فریشتەکە وتی: من چاکت دەناسم تۆ ئەو کەسە نەبووی تووشی نەخۆشی گولی بوو بووی وەهەژار کەوتبووی! خوای گەورە شیفای دایتو دەوڵەمەندی کردی؟ کابرا وتی: نەخێر من ئەو سەروەتو سامانەم بەمیراتی بۆ ماوەتەوە، فریشتەکە وتی: ئەگەر درۆت کرد بێت خوای گەورە وەك جارانت لێبکاتەوە، بۆیە کابرا هەژارکەوتو تووشی نەخۆشی گولی بوویەوە، چونکە سوپاس گوزاری خوای نەکرد لەسەر نیعمەتەکانی.

# «مانگاکانی کابرای کەچەڵ»

خـوای میهرەبـان فریشـتەیەك دەنێرێـت بـۆلای کابرایـەکی کەچـەڵی بـەنی ئیسرائیل تاکو تاقییکاتەوە، فریشتەکە پێی دەڵێت (چیت پێ خۆشـە بـۆ خـۆت؟ کابرای کەچەڵ وتی: قژێکی نەرمو جوان- فریشتەکە دەستێکی هێنـا بەسـەریدا، پاشان شیفای بۆ هاتو قژێکی نەرمی رەشی جوان سەری داپۆشی..

پاشان فریشتەکە وتی: حەزت لەچ جۆرە ماڵێکە کابرا وتی: مانگا فریشـتەکە بەفەرمانی خوا مانگایەکی ئاوسی پێ بەخشی وەکاتێـك مانگاکـە زا، خـوای گـەرە بەرەکـەتی خسـتە وەچـەیەوە بووبـە گاگـەلێکی زۆر، پـاش چـەند سـاڵێك. دوای ئـەوەی کـە دەوڵەمەنـد بـوو فریشـتەکە هاتـەوە بـۆ لای کـابرا، بـەلام لەشـێوەی پیاوێکی کەچەڵی هەژاری بێ پارە و نـان، وتـی: دەمـەوێت بچـم بـۆ شـارێکی دی، پێویستیم بەیارمەتی هەیە بۆ ئەو سەفەرەم، کابرای خاوەن مانگا چروکی نوانـد و هیچی نەدا بەفریشتەکە!!

بۆیە فریشتەکە وتی: دەزانی من دەتناسم ئایا تۆ پێشتر کەچەڵ نەبووی خوا قـژێکی جـوانی پێـدای هـەژار نـەبووی خـوای گـەورە دەوڵەمەنـدی کـردیو ئـەم گاگەلەی پێدای، کابرای کەچەڵ وتی: ئەم سەروەتو سامانە لەباو باپیرمەوە بـۆم بەجێماوە، فریشتەکە وتی: ئەگـەر درۆ دەکـەیت خـوا وەك جارانـت لـێ بکاتـەوە، پاشان کابرا کەچـەڵو هـەژار بوویـەوە، چونکە سـوپاس گوزاری خـوای نـەکرد و خۆی لێگۆڕا.

# «مەڕەکانی کابرای کوێر»

لەناو بەنی ئیسرائیلدا کابرایەکی کوێری هەژار هەبوو خوای گەورە فریشتەیەکی نارد تاوەکو تاقی بکاتەوە، فریشتەکە وتی: چ شتێك بۆ تۆ زۆر خۆشە؟ کابرای کوێر وتی: گەڕانەوەی چاوەکانم لەلایەن خواوە، فریشتەکە دەستی خستەسەر چاوی کابرا، خێرا چاوەکانی چاك بوونەوە، پاشان فریشتەکە وتی: چ ماڵێك لای تۆ خۆشەویستە؟ کابرا وتی: مەڕ، خوای گەورە مەڕ و بەرخێکی پێ بەخشی پاش چەند ساڵێك زۆر زیادی کرد و بویە ڕانەمەڕێك، پاشان فریشەکە لەشێوەی پیاوێکی نابینای هەژاری، بێ پارەونان هات بۆلای کابرا وتی: دەمەوێت بچم بۆ شارێکی تر پێویستم بەیارمەتی تۆ هەیە بۆ ئەو سەفەرەم داوا دەکەم یارمەتیم بدە، کابراش وتی: بەڕاستی کاتی خۆی منیش نابینا بووم خوای گەورە چاوەکانی پێ بەخشیمەوە، بڕۆ بەویستی خۆت چەندت دەوێت لەو مەڕانە ببە بۆخۆت، فریشتەکە وتی: بەڕاستی خوای گەورە لێت ڕازییە، هەواڵی بەسەرهاتی کەچەڵ‌و گولەکەی بۆ باسکرد و پێی ڕاگەیاند: خوای گەورە هەرسێکیانی تاقیکردەوە تا دەرکەوێت ئایا شوکری خوا دەکەن لەسەر هەموو ئەو نیعمەتانەی کەپێی دان یان ناشکوری دەکەن.

## ﴿دەنکە خورمایەك﴾

پیاوێکی هەژار هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) داوای خێری لێکرد، پێغەمبەریش فەرمانیدا کە دەنکە خورمایەکی بدەنێ، پاشان کابرا سەیری دەنکە خورماکەی کرد کەزۆر کەمە یەك دەنکە خورما چی لێبکات بۆیە وەری نەگرت لەبەر کەمی، پاشان رۆیشت دوای ماوەیەك هەژارێکی تر هات‌و داوای خواردنی کرد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەنکە خورمایەکی بدەنێ، ئەویش وەریگرت‌و زۆر دڵخۆش بوو پێی وتی: (سبحان الله) دەنکە خورمایەك لە پێغەمبەری خواوە بۆ من زۆرە، هەرلەوێدا پێغەمبەر (ﷺ) بانگی لە کەنیزەکێك کرد و فەرمووی بچۆ بۆلای خاتوو (ئوم سەلمە) (خوا لێی رازی بێت) تا چل درهەم بدات بەم هەژارە، چونکە ئەم کەسە لەسەر دەنکە خورمایەك شوکری زۆر کرد لەبەر ئەوە ئێمەش زیاتری پێدەبەخشین‌و لێیشی رازین.

## ﴿سوپاسگوزاری بە (الله اکبر)﴾

شەوێك لەشەوان کەسێك بەرێگەیەکدا دەرۆیشت، گوێی لەدەنگی کەسێك بوو بەدەنگی بەرز دەیوت : (الله اکبر الله اکبر) کابرا بەوشترەکەی خێراتر بوو بەرەو لای دەنگەکە رۆشت تا بگاتە ئەو کەسەی الله اکبری کرد کاتێك گەیشتە جێگەکە وتی: کێ بوو الله اکبری کرد؟ هەواڵیان پێدا کە ئەبو هورەیرە بوو.

کابرا پرسیاری کرد هۆی چی بوو وای وت وتیان: الله اکبر وەك سوپاس گوزارییەك بۆخوای گەورە لەسەر ئەو نیعمەتەی پێی بەخشیوە، کابرا پرسی؟ ئەو نیعمەتە چییە داوێتی بە ئەبو هورەیرە؟ وتی: کارم دەکرد بۆ (بەرەی کچی غەزوان) لەبری ئەوەدا نانیان دەدامێ لەگەڵ جێگەی حەوانەوە و نوستن، پاش ماوەیەك خوای گەورە نیعمەتی تری رژاند بەسەرمدا (بەرەی کچی غەزوان) بووبە هاوسەری ژیانم، بوومە پیاو ماقوڵ‌و گەورەی خێڵەکەم لەبەر ئەوە بەدەنگی بەرز الله اکبر دەکەم سوپاس گوزاری خوادەکەم لەسەر نیعمەتە زۆرەکانی.

# «سەگە تینووەکە»

پێغەمبەری خوا دانیشتبوو هاوەڵان بەدەوریدا بوون، ئێری خوڕەوشتی جوانی دەکردن بەسەرهاتێکی بۆ گێڕانەوە تافێریان بکات کە پێویستە بە سۆز و میهرەبان بن لەگەڵ ئاژەڵاندا بەجوانی بۆی روونکردنەوە کە، پاداشتی کەسێك کە ئاوابێت چییە؟ فەرمووی: (پیاوێك جارێکیان بەرێگایەکدا رێی دەبڕی تینویەتی زۆری بۆهێنا، گەڕا تابیرێکی دۆزییەوە، بۆیە دابەزیە ناو بیرەکە و تێر ئاوی خواردەوە، پاشان هاتە دەرێ، بینی سەگێك لەتینووان زمانی دەرکێشاوە و لەتاواندا دەیهێنێ بەخۆڵی سەر زەویدا، کابرا وتی: (بەڕاستی ئەم سەگە تینویەتی بەئەندازەی تینویەتییەکەی من، سۆزی بۆلای جولا، بۆیە دابەزییەوە ناو بیرەکە و پێڵاوەکانی پڕکرد لەئاو پاشان بەدەمی پێلاوەکانی هەڵگرت و هاتە سەرەوە چەندجار ئەمەی کردتا سەگەکەی تێرئاو کرد، پیاوەکە سوپاسی خوای کرد کەیارمەتیدا بۆ تێرئاوکردنی ئەو سەگە خواش لێی خۆش بوو.

هاوەڵان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا لەخزمەت کردنی ئاژەڵەکانمان پاداشتمان دەست دەکەوێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تەڕکردنی جگەری هەموو جۆرە ئاژەڵێك پاداشتمان بۆ هەیە. (البخاري و مسلم).

# «ئایا سوپاسگوزار بوویت»

دەگێڕنـــەوە پیاوێـــك چـــووە خزمـــەت پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) وتـــی: ئـــەی پێغەمبـــەری خـــوا لەڕێگەیـــەی دوور و درێـــژی بیابـــان دایكـــم لەســـەر گـــەردنم هەڵگرتووە، كەلی ئەو بیابانە زۆر داخی كردبوو، ئەگەر پارچە گۆشـتت لەسـەر دانایـە دەبـرژا، ئایـا ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویسـتم توانیومـە پاداشـتی دایكـم بدەمەوە لەسەر ئەو هەموو چاكەی بەرامبەر من كردوویەتی؟ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمووی لەوانەیـە ئـەوەی كـە تـۆ ئـەنجامت داوە پاداشـتی تـەنها كـەمێك لەژانی لەدایك بوونت بووبێت.

دایكو باوك فەزڵو چاكەی زۆریان بەسەر مانەوەیە بەتایبـەت دایـك، كەئـەو زیـاتر ئـێشو ئـازاری چەشـت لـەپێناو ئێمـەدا، پێویسـتە ئێمـە سـور بـین لەسـەر سوپاس گوزارییان، ئەوەی سوپاس گوزاری دایكو بـاوكی نـەبێت سـوپاس گـوزاری پەروەردگار نابێت، خـوای گـەورەش دەفـەرموویێت: (وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ) (لقمان: ١٤).



## ﴿نهێنی سەگەکە﴾

هەرکاتێك پیاوەکە دەچوو بۆ هەرجێگەیەك سەگەکە بەدوای دەکەوت وەهەر جارێکیش سەیری دەکرد ئەو کلکە لەقەی بۆ دەکرد، بەمانای ئەوەی زۆر خۆشحاڵە کەلە خزمەت خاوەنەکەی دایە، کاتێك خەڵکی ئەمەیان دەبینی سەریان سوڕدەما و لەنهێنی هاوەڵایەتی ئەم سەگەیان دەپرسی لەگەڵیدا؟ وەلەبەرچی یەهێندە خۆشحاڵە؟

پیاوەکە وەڵامی دانەوە و وتی: (بەڕاستی ڕۆژێکیان بەرێگەیەکدا دەڕۆیشتم بینیم چەند منداڵێك یاری بەم سەگە دەکەن، گوریسێکیان لەملی توند کردووە و بەدوای خۆیاندا پەلکێشی دەکەن، کاتێك ئەوەم دی منیش سەگەکەم لێسەندن و دڵم بۆی سوتا گوریسەکەی ملیم کردەوە، هەندێك خۆراکم پێدا، ئیتر لەو ڕۆژەوە هەرچی دەم بینێ بەدوام دەکەوێت بەردەوام کلکە لەقەم بۆ دەکات، کە ئاماژەیە بۆ سوپاسی بەردەوامی بۆم بەرامبەر ئەوچاکەیەی لەگەڵی کردوومە.

## ﴿خوای گەورە شایانی سوپاسی زیاترە﴾

دەگێڕنەوە کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی دایکی کردبووە کۆڵی و تەوافی ماڵی خوای پێدەکرد بەدەم تەوافەکەوە دەیوت: من لەژێر باری چاکەکانت دەرناچم، ئەگەر سوار بگلێ، پاشان دەیوت: (لبيك اللهم لبيك لبيك اللهم لبيك).

بەردەوام ئەو وتەیەی دەوتەوە عومەری کوری خطاب و علی کوڕی ابی طالب چاویان لێ بوو ئیمامی عەلی وتی: ئەی باوکی حفص وەرە بالەگەڵیدا تەواف بکەین لەوانەیە رەحمەت دابارێ بەسەریدا با ئێمەش بگرێتەوە، بۆیە هەردووکیان لەگەڵ کابرا تەوافیان دەکرد و چی دەوت ئەمانیش دەیان وتەوە، پاشان ئیمامی عەلی فەرمووی خوا سوپاست دەکا کە چاکەت لەگەڵ دایکت ئەنجامدا.

# «بەخشندەیی و سوپاسگوزاری»

جارێکیان سێ پیاو بەلای خێمەیەکدا تێدەپەڕن کە پیرەژنێکی لێدەبێت، بەپیرەژنەکە دەڵێن داپیرە خەریکین لەتینوواندا دەمرین شتێکت لانییە بیخۆین؟ پیرەژنەکە تەنها مەڕێکی لاتی بچووکی هەبوو وتی: ئەو مەڕە بدۆشن و شیرەکەی بخۆن، دوای ئەوەی مەڕەکەیان دۆشی و تێر شیریان خواردەوە، پاشان وتیان ئەی خواردنت لانییە بیخۆین؟!

پیرەژنەکە وتی: بایەکێکتان هەستێ ئەو مەڕە سەرببڕێت، هەتا بۆتانی بکەمە ژەمە خواردنێکی باش یەکێك لەپیاوەکان هەستا و مەڕەکەی سەربڕی پیرەژنەکەش بۆی کردن بەچێشتێکی باش، هەرسێ پیاوەکە باش تێربوون، پاشان وتیان داپیرە ئێمە بۆ حەجی ماڵی خوا دەچین، ئەگەر بەسەلامەت گەڕاینەوە وەرە بۆ مەدینە تاپاداشتی ئەم چاکەیەت بدەینەوە.

پاش ماوەیەك پیرەژنەکە لەگەڵ مێردەکەی دەچن بۆ شاری مەدینەی پیرۆز یەکێك لە پیاوەکان دەبینن، ئەویش هەزار مەڕ و هەزار دیناریان دەداتێ، پاشان دەچن بۆ لای پیاوی دووەم ئەویش بەهەمان شێوە هەزار مەڕ و هەزار دیناریان دەداتێ، پاشان دەچن بۆلای پیاوی سێهەم ئەویش دوو هەزار مەڕ و دوو هەزار دیناریان دەداتێ، لەپاداشتی یەك مەڕ چوار هەزار سەرمەڕ وەردەگرێت لەگەڵ چوار هەزار دینار، بۆیە دەوترێ ئەو ماڵەی لێی دەبەخشرێ هەرگیز کەم ناکات بەڵکو زۆریش زیاد دەکات.

# «سەگ و کۆتر»

سەگێك دەگەڕا بەناو باخچەیەکدا تاکو دارێکی گەورەی دییەوە، لەبن دارەکە پاڵی لێدایەوە و خەوی لێکەوت، ئەو لەخەوی قوڵی خۆیدا بوو، لەپڕ گورگێکی گەورە پەیدابوو زۆر بەهێمنیو ئەسپایی بەرەو لای سەگەکە دەرۆیشت، لەسەر درەختەکە کۆترێکی لێبوو سەیری دەکردن، کاتێك زانی گورگەکە بەنیازە پەلاماری سەگەکە بداتو بیخوات خێرا خۆی گەیاندە سەگە خەوتووەکە و بەدەنووك بە ئاگای هێنا، کاتێك سەگەکە چاوی کردەوە بینی گورگێك بەرەو رووی دێت، خێرا خۆی دەرباز کردوو زۆر سوپاسی کۆترەکەی کرد کە رزگاری کرد لەدەستی ئەو گورگە، پاش ماوەیەك سەگەکە هاتەوە بۆ باخچەکە بینی راوچییەك بەتفەنگەکەیەوە هاتۆتە ناو باخچەکە و بەدوای نێچیری خۆیدا دەگەڕێت، خێرا سەگەکە کۆترەکەی بیر کەوتەوە بۆیە بەپەلە خۆی گەیاندە بن درەختەکە، کەهێلانەی کۆترەکە لەسەر ئەو درەختە گەورەیە بوو دەستی کردە حەپەحەپێکی توند، کۆترەکە بەئاگا هاتو هەستی کرد لەشتێکی ترسناك ئاگادار دەکرێتەوە، بۆیە بەخێرایی چاوێکی گێڕایە ناو باخچەکەدا بینی راوچییەك بەخۆیو تفەنگەکەیەوە لەناو باخچەکەدایە، کۆترەکە خێرا فڕیو زۆر دوور کەوتەوە و رزگاری بوو، وەسوپاسی سەگەکەی کرد لەسەر ئەو یارمەتییە گەورەیە، دیارە ئەوەی چاکەیەك بکات خوای گەورە دووجار پاداشتی دەداتەوە لەدنیا ئەنجامی ئەو چاکەیە وەردەگرێتو جارێکی تریش لەدوا رۆژدا پاداشت دەدرێتەوە.

# «سوجدەی سوپاسگوزاری»

ڕۆژێکیان عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف (ﷺ) چووە ناو مزگەوت بینی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوە و قیبلە سوجدەی بردووە، ئەویش وەستا و چاوەڕێی کرد تاپێغەمبەر (ﷺ) هەڵدەستێـەوە لەسوجدەکەی، ماوەیەکی زۆر ڕاوەستا، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) هەرلە سوجدەدا بوو عەبدولڕەحمان ترسا گومانی برد پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کردبێت بۆیە نزیك بوویەوە لێی، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری بەرز کردەوە و دانیشت عەبدولڕەحمان زۆر دڵخۆش بوو. عەبدولڕەحمان وتی: ترسام ئەی پێغەمبەر لەوەی کەخوای گەورە ڕۆحی کێشابێت!! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جبرەئیل "سەلامی خوای لێبێت" هات بۆلام و مزگێنی دامێ فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێت هەرکەسێك سڵاوات لەسەر بدات خوای گەورەش (١٠) سڵاوات لەسەر بەندەکە دەدات وە هەرکەسێك سەلام لەتۆ بکات خوای گەورەش (١٠) سەلام لەو کەسە دەکات، منیش لەخۆشیدا سوجدەی سوپاس گوزاریم بۆ خوای گەورە برد، سوجدەی شوکر یەکێکە لەسونتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کەهەرکاتێك هەستی بەیەکێك لە نیعمەتەکانی خوا کرد بێت یان مژدەیەکی دڵخۆشکەریان پێدابێ ئەنجامیداوە.

# «سکاڵا»

پیاوێـك دەچـێتە لای یـەكێك لەحەكیمـەكان سـكاڵای هـەژاری خـۆی دەكـات، ئەویش پێی دەڵێت ئایا پێت خۆشە كە كوێر بویتایە و خاوەنی دەهـەزار درهـەم بویتایە؟ كابرا دەڵێت: نەخێر حەكیم دەڵێت: پێـت خـۆش بـوو كـەڕ بوویتایـە و خاوەنی دەهەزار درهەم بویتایە؟ كابرا دەڵێت نەخێر، حەكیم دەڵێت: ئەی پێـت باش بوو هەردوو دەستو پێیەكانت نەبوایە، بەڵام خاوەنی بیست هـەزار درهـەم بویتایە؟ كابرا دەڵێت: نەخێر حـەكیم دەڵێـت: كەواتـە بـۆ شـەرم لـەخوای خـۆت ناكـەیت كـە بەئەنـدازەی پـەنجا هـەزار زیـاتر نیعمـەتی پێـداوی، هێشـتا سـكاڵا دەكەیت.

پیاوەكـە رۆشـتو لەبـەر خۆیـەوە بـەردەوام سوپاسـی خـوای دەكـرد لەسـەر هەموو ئەو نیعمەتانە، كەتا ئێستا بیری لێ نەكردۆتەوە، وەبڕیاریدا جارێكی دی سكاڵای هەژاری خۆی لای كەس نەكات، تـەنها داوا لـەخوا بكاتو لـەو بپاڕێتـەوە، چونكە ئەوە خاوەن نیعمەتەكانە و هەر ئەو دەتوانێت ببەخشێت ئەویش لێمـان دەسەنێتەوە.



## لەکۆتاییدا...

ئیماندار هەمیشە سوپاس گوزاری خوا دەکات لەسەر نیعمەتەکانی، وەسوپاس گوزاری دایكو باوکە لەسەر چاکەکانیان، وەسوپاسی هەرکەسێك دەکات کە چاکەیەکی لەگەڵ کردبێت، وەباش دەزانێت هەرکەسێك سوپاسی خەڵك نەکات سوپاس گوزاری خواش ناتوانێت بکات، سوپاس گوزاری تەنها لەسەر مرۆڤ قەتیس نییە، ئاژەڵانیش هەر یەکەو بەشێوەی تایبەتی خۆی سوپاس گوزاری دەردەبڕێت، لەبەر ئەوە لەبیرت نەچێت فەزڵو چاکەی ئەوانەی منەتیان هەیە بەسەرتەوە.

سوپاس گوزاران کەمن هەمیشە هەوڵبدە تۆ یەکێك بیت لەو کەسانە (وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ) سبأ: ١٣.

سوپاسگوزاری خوا بە لەهەموو حاڵو کاتێك هەتا ڕەزامەندی خوا بەدەست دەهێنیتو دەچیتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە، ئیبن قەیم دەفەرموێت: شکور نیوەی ئیمانە، کەواتە زۆر گرنگە خاوەنی بڕوانامەی شوکر بین، باشکور بین چونکە (وأن تعدوا نعمة الله لاتحصوها).

شوکرانە بێژی تەنها بەزوبان ناکرێت، بەڵکو بەکردەوە دەبێت بەمانای ئەوەی خوای گەورە هەر نیعمەتێکی پێ بەخشیت، پێویستە لەکاری جوانو چاکەو ڕەزامەندی خوادا بەکاری بهێنێ، ئەوکاتە تۆ بەندەیەکی سوپاسگوزاری.

# كۆمەڵە چیرۆكێك لەبارەی راوێژكردن

نوسینی
شعبان مصطفى قزامل
مصطفى احمد علی

وەرگێڕان
ناصح محمد شريف موبڕەیی

(ماخابَ مَن استخار،ولا ندمَ من استشار).

شاعیر دەڵێت:

شاورِ صَديقكَ في الخفىَ المُشكل ... واقبل نصيحة ناصِحٍ مُتفضل

فاللهُ قد اوحى بذاك نبيَهُ ... في قولهِ شاورهمُ وتوكّلِ.

+شاوِر مَن جَربَ الامور ،فإنهُ يعطيكَ مَن رأيهِ مادفعَ عليهِ غالياً وأنتَ تاخذهُ مجاناً.

-بەکەسی خاوەن ئەزموون ڕاوێژ بکە ،بۆچوونێك دەدات بە تۆ کە خۆی باجی گەورەی لەپێناودا داوە ،بەڵام تۆ بێ بەرامبەر وەری دەگریت.



# ﴿ڕاوێژکردن ( شورا )﴾

شورا:واتە ڕاوێژ کردنشتێك لەشتێك وەردەگریت.

ڕاوێژ کردن:واتە وەرگرتن و هەلگۆزینی بۆچوونێك لە کەسێکی تر دەربارەی ڕوداویان گرفتێك یان دەربارەی کاروبارێك کەنازانی ئەنجامی بدەیت یان نا.

+خوای گەورە فەرمان بەپێغەمبەرﷺدەکات ڕاوێژ بەهاوەلأنی بکات ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ﴾(ال عمران: ١٥٩).

+خوای گەورەستایشی باوەڕداران دەکات کەلەناو خۆیاندا‌و بۆ ڕێکخستنی کاروباریان ڕاوێژو پرس وڕا دەکەن.﴿وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾(الشورى: ٣٨).

+پێغەمبەر ﷺدەفەرموێت:کەسێك کە ڕاوێژی پێ دەگرێت مانای وایە ئەمینداره،دەبێت خیانەت نەکات.(المستشار مؤتمن)الترمذي وابوداود.

+پێغەمبەرﷺدەفەرموێت:(مَن إستشارهُ أخوهُ المسلم فاشار عليهِ بغيرِ رشدهِ فقد خانهُ)احمد والحاكم.

هەرکەس براکەی ڕاوێژی پێ بکات ئەو بۆچونێکی ڕاست و دروست و عەقلأنی نەداتێ و ڕێنمویی بکات بۆ شتێ کەخراپ بێت ئەوە خیانەتی لێکردووە.

ووتراوە: (المشاور راحة لك ،وتعبٌ على غيرِك) ڕاوێژ کردن بۆ تۆ ئارامی و ئیسراحەتە بۆ ئەوی تر ماندو بوونە.

# ﴿ڕاوێژکردن دوای جەنگی بەدر﴾

لەغـەزای بـەدر موسـوڵمانان سـەرکەوتن‌و ژمارەیـەکی زۆریـان لـەبێباوەڕان بەدیل گرت، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕویکـردە هاوەڵان‌و فـەرمووی: چـی دەڵێن دەربارەی ئەم دیلانە؟ چییان لێ بکەین؟

ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمانە کەسوکاری خۆتن نـەرم‌و نیانبـە لەگـەڵیان، بـەڵکو خـوا لێیـان خـۆش بێـت، عومـەر (رضي الله عنه) وتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا ئەمانـە تۆیان بـەدرۆ زانـی‌و شاربەدەریان کردی، لێیـان نزیـك بەرەوەو لەگەردنیان بدە، عەبدوڵا کوڕی ڕەواحـە (رضي الله عنه) وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خوا دۆڵێکی پڕ لەدار دروست بکە و بیانکەرە ناوی‌و ئاگریان اێبەربدە!

پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) میهرەبــانی‌و لێبــوردنی بەرامبــەریان هەڵبــژارد و بۆچوونەکەی ئەبوبەکری وەرگرت‌و فیدیەی لێوەرگرتن‌و ئـازادی کـردن، قورئـان هاتەخوارەوە و ڕونیکردەوە کەلەو قۆناغەدا کوشتنیان باشتر بوو بۆ موسـوڵمانان تا دڵی دوژمنـانی ئیسلام بترسێ، خـوای گـەورە فـەرمووی: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ الانفال ٦٧. (الحاكم و صححة).

## ﴿پەیامەکەی سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت)﴾

دوای گەڕانــەوەی هــود هودەکــەی ســولەیمان پێغەمبــەر (ســەلامی خــوای لێبێــت) بۆلای و باسکردنی ئەو گەلەی بینیبووی کەخەریکی ڕۆژ پەرستی بوون کەپێی دەوتـرا (مەملەکەتی سبأ).

حــەزرەتی ســولەیمان (ســەلامی خــوای لێبێــت) پــەیامێکی ئاراســتەی خەڵکەکــە و پاشـاکەیان کـرد و داوای لێکـردن موسـوڵمان بـبن و ملکەچـی سـولەیمان بـبن، ئینجـا نامەکەی دا بەهودهودەکە تاپێیان بگەیەنێت.

هودهود نامەکەی هەڵگرت و بردی بۆ بەردەم (بەلقیس)ی پاشایان، کاتێ نامەکـەی کردەوە نوسرابوو کەئەم نامەیە لەسولەیمان پێغەمبەرەوە یەو بەناوی، خـواوە داواتـان لێدەکەم کە موسوڵمان ببن و خۆبەگەورە مەزانن و ملکەچی فەرمانی خوابن.

پاشـا ڕاوێـژکارەکانی کۆکردەوە و داوای لێکـردن هەرکـەس بـیر و بۆچوونی خـۆی بڵێت.

پێی وتن: ﴿قَالُوا نَحْنُ أُوْلُوا قُوَّةٍ وَأُولُوا بَأْسٍ شَدِيدٍ وَالأَمْرُ إِلَيْكِ فَانظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ (33) قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ النمل٣٢-٣٤.

واتە: ئەی ڕێزداران بەڕاستی من نامەیەکی پیرۆز و بەڕێزم بۆ دانراوە.

نامەکە لە سولەیمانەوەیە و بـەناوی خـوای بەخشـندە و میهرەبانـەوە دەسـت پێدەکات و دەڵێ: خۆتـان بەگـەورە مـەزانن و لـێم یـاخی مـەبن و وەرن موسـوڵمان بـبن (واز لـە خۆرپەرسـتی بهێـنن و هـەر خوایەکـە بەدیهێنـەری خـۆر و مـانگ و ئەستێرە و زەویـە ...هتد) بپەرستن.. ئینجا بەڵقیس بەئامادەبووانی وت: ئـەی ڕێزداران راتان چییە؟ چی بکەم باشە؟ خۆمن هیچ بڕیارێکم نـەداوە هـەتا ئێـوە لێی ئاگادار نـەبووبن و ڕاتـان لەسـەری نـەدابێت، ئەنجوومەنەکـەی وتیـان: خـۆت دەزانیـت کەئێمـە خـاوەنی هێـز و توانـا و دەسـەڵاتی تونـد و تیـژین، فـەرمانیش

فەرمانی تۆیە، بیربکەرەوە و تێفکرە چ فەرمانێك دەدەیت (ئامادەین) بەلقیس وتی: بەڕاستی لەشکری پاشاکان کاتێك چونە شار و دێهاتەکانەوە، وێرانو کاولیان کردووە و تۆوی خراپەیان چاندووە، کەسانی خاوەن دەسەلاتو پیاوی ناوداری ئەو شوێنەیان زەلیلو ریسواکردووە و هەمیشە ئەوە پیشەیانە و بەوجۆرە دەکەنو هەرواش دەبن، لەبەرئەمە بڕیارم داوە دیاریەکیان بۆ بنێرم، جاچاوەڕێ دەکەم بزانم نوێنەرەکان چ هەواڵێکم بۆ دەهێننەوە.

جابەهۆی ئەم پرسو رایەوە کەکردی بەلقیس توانی گەلەکەیو ولاتەکەی لەشەڕێکی زیانبەخشو شکست هێنەر رزگار بکات، بەلکو زیاد لەوەش هیدایەتی وەرگرتو رێگەی راستی دۆزییەوە و باوەڕی بەپەیامی سولەیمان هێنا.

## «قودسی پیرۆز»

لەدوای ئەوەی خوای گەورە لەدوولاوە هاوکاری موسوڵمانانی کرد و توانیان بەسەر رۆمەکاندا سەربکەون، سوپای موسوڵمانان رۆمەکانیان لەناو (قودس)دا ئابلوقەدا و زۆریان بۆ هاتو ناچاری (صولح) بوون.

بۆ ئەم مەبەستە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕراح سەرکردەی سوپاکەی نارد بۆلای گەورەی موسوڵمانان "عومەری کوری خطاب" بۆ ئەوەی ئامادەبێت، کاتێ هەواڵەکە گەشتە گەورەی موسوڵمانان لەگەڵ هاوەلاندا کۆبۆوە و پرسو رای پێکردن کەئایا بچێت یان نا؟ ئەوانیش ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کەبچێت.

پێشەوا عومەر (ﷺ) بۆچوونەکەی وەرگرتنو بەرەوشام رێکەوتو سەرکردەی سوپای موسوڵمانان پێشوازیان لێکرد لەشوێنێ کە ناوی (الجابیە)بوو، پاشان لەگەڵیان رۆشت بەرەو (قودس) و لەگەڵ گاورەکاندا رێکەوتو لەو شوێنەوە کەپێغەمبەری خودا (ﷺ) لەکاتی شەو رەویدا چوو بووە ژوور، ئەویش لەهەمان شوێنەوە رۆشتە ناوقودسو لەگەڵ موسوڵماناندا نوێژی تیاداکرد.

# «ڕاوێژکردن لە بەدردا»

قورەیش سوپای کۆکردەوە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی موسوڵمانان ببنەوە کە هێرشیان کردبووە سەر کاروانە بازرگانییەکەیان کەلە شام گەڕابۆوە، ویستیان بدەن بەسەر شاری مەدینەدا، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی زانی، کۆچکردوان و پشتیوانانی کۆکردەوە و پرس و ڕاوێژی پێکردن کەئایا لەشار دەربچن بۆ شەڕی قورەیش؟ لەناو کۆچکردواندا (مقداد کوڕی عەمر) (ﷺ) قسەی کرد وتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڕۆ بۆ ئەو شتەی خوا فەرمانی پێکردوویت، ئێمەش لەگەڵتاین، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرچاوەڕێی خەڵکەکەی دەکرد و دەیفەرموو: خەڵکینە قسەم بۆ بکەن...

ئینجا لەنێو پشتیوانان (سەعد کوڕی مەعاز) (ﷺ) قسەی کرد و وتی: سوێند بەخوا ئەڵێی مەبەستت ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ..

سەعد وتی: ئێمە باوەڕمان بەتۆ هێنا و بەڕاستمان زانیت و شایەتیماندا کەئەوەی هێناوتە هەق و ڕاستییە و لەسەر ئەوەش پەیمانمان پێدایت کە گوێڕایەڵت بین، چیت دەوێت بۆی بڕۆ، ئێمەش لەگەڵتین سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی ناردووە، ئەگەر بڕۆی بۆ ناو دەریا و پێشمان بکەوی ئێمەش بەدواتا دێین، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) زۆر دڵخۆش بوو بەقسەکانی سەعد و موسڵمانان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی بێباوەڕان لەبەدردا دەرچوون و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. (مسلم)

# ﴿ڕاوێژکردن لەغەزای ئوحود﴾

بێباوەڕان بۆ پڕکردنەوەی شکستی سوپاکەیان لەغەزای بەدردا سوپایەکی گەورەیان کۆکردەوە، کاتێك هەواڵ گەشتە پێغەمبەر (ﷺ) بۆچوونی وابوو کەلەشاری مەدینەدا بمێنێ‌و بیکاتە قەلایەك‌و موسوڵمانان بەرگری لەخۆیان بکەن، بەلاَك کۆمەڵێك خەڵك بۆچوونیان وابوو، کەلەشار دەربچن، ئەو کەسانەش کۆمەڵێ بوون غەزای بەدریان نەدیبوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بمانبەرە دەرەوە بۆیان، تا لەکێوی ئوحود لەگەڵیان بجەنگین، ئومێدەوارین ئەو فەزڵەی ئەهلی بەدر دەستیان کەوت، ئەمجارەش دەست ئێمە بکەوێت. ئەم کۆمەڵە زۆر بەگەرمی هانی پێغەمبەریان دەدا بۆ دەرچوون تاپێغەمبەر پۆشاکی جەنگی پۆشی، کاتێ بەوشێوە پێغەمبەریان بینی پەشیمان بوونەوە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەشار بمێنەرەوە با بۆچوونی تۆ بێت!!

پێغەمبەر فەرمووی: بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نییە کەجل‌و بەرگی غەزا دابنێ دوای ئەوەی لەبەریکرد، تاکاتێك خوای گەورە لەنێوان ئەوو دوژمنانیدا بڕیار دەدات. بەم شێوە موسوڵمانان دەرچوون بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی موشریکەکان لەئوحود، سەرەتا موسوڵمانان سەرکەوتن، بەلاَم دوای ئەوەی تیرهاوێژەکان فەرمانی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) شکاند و جێگەی خۆیان بەجێ هێشت‌و لە کێوی ئوحود هاتنە خوارەوە بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگ سوپاکەش تێکشکا.

# «نۆژەنکردنەوەی کەعبە»

عەبدولاّ کوری زوبەیر (ﷺ) ویستی کەعبە نۆژەن بکاتەوە خەڵکی خاوەن بۆچوونو بەئەزموونی لەناو موسوڵماناندا کۆکردەوە و وتی: خەڵکینە، دەربارەی کەعبە راوبۆچوونی خۆتانم پێ بڵێن، ئایا بیڕوخێنم پاشان دروستی بکەمەوە، یان هەرچاکسازیو نوێکاری تیابکەم؟

ئیبن عەبباس (ﷺ) ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ئەو شوێنانەی کۆنو لاواز بووە، چاکی بکاتەوە و بیناکە وەك خۆی بهێڵێتەوە.

بەڵام عەبدولاّ کوڕی زوبەیر (ﷺ) ئەو بۆچوونەی وەرنەگرت وتی: ئەگەر یەکێك لەئێوە ماڵەکەی بسوتێ، هەتا تازەی نەکاتەوە رازی نابێت؟ ئەی دەربارەی ماڵی خواکەتان؟ بۆیە سێ جار نوێژی "ئیستیخارە"ی کرد، پاشان بڕیاریدا کە بیڕوخێنێتو سەرلەنوێ دروستی بکاتەوە، خەڵك لەسەرەتادا ترسان، کاتێ پیاوێك سەرکەوتو بەردێکی لێکردەوە و فڕێیدایە خوارەوە و کابراش هیچی لێنەهات، خەڵك شوێنی کەوتنو روخاندیان تا گەیاندیانە سەر ئەو بناغەی کەوەختی خۆی ئیبراهیمو ئیسماعیل پێغەمبەر (سەلامی خوایان لێبێت) دروستیان کردبوو، ئینجا لەسەر ئەوە کەعبەیان دروستکردووە.

# «دینێکی سەرکەوتوو»

ئەبوبەکر صدیق (رضي الله عنه) بڕیاری فەتح کردنی وڵاتی رۆمیدا، بۆ ئەم مەبەستە هاوەڵانی کۆکردەوە و پرس‌و راوێژی پێکردن ئەوانیش پشتگیری بۆچوونەکەیان کرد، چونکە دڵنیا بوون کەخوای گەورە سەرخەری پەیامەکەیەتی.

ئەبوبەکر (رضي الله عنه) روویکردە عەلی کوڕی ئەبو تالیب" (رضي الله عنه) پێی وت: ئەی باوکی حەسەن تۆ ئەم کارە چۆن دەبینی؟

عەلی (رضي الله عنه) وتی: وادەبینم ئەگەر خۆت لەگەڵیان بیت یان کەسێکیان بۆ بنێری "إن شاء الله" سەرکەوتوو دەبیت.

ئەبوبەکر (رضي الله عنه) فەرمووی: خوای گەورە مژدەی خێرت بداتێ چۆن ئەمەت زانی؟ عەلی (رضي الله عنه) فەرمووی: لەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)م بیست کەدەیفەرموو: (لايزال هذا الدين ظاهر على كل من ناوأ حتى يقوم الدين وأهله ظاهرون).

واتە: بەردەوام ئەم دینە سەردەکەوێت بەسەر ئەوانەی پێچەوانەو دژایەتی دەکەن هەتا دینەکە و شوێن کەوتوانی سەردەکەون.

ئەبوبەکر (رضي الله عنه) فەرمووی: پاک‌و بێگەردی بۆخوا! ئەم فەرموودەیە چەند جوان‌و شیرینە! بەڕاستی دڵخۆشت کردم، خوا دڵت شاد بکات.

بەم شێوە سوپای موسوڵمانان بەرەو شام کەوتەڕێ‌و رووبەڕووی سوپای رۆمەکان بوونەوە و لەجەنگی "یەرموك"دا موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

# «خەلیفەی دووەم»

دەگێڕنـەوە کـاتێ ئەبوبـەکر (ﷺ) ویستی عومـەر (ﷺ) بکاتـە خەلیفـەی موسـوڵمانان لـەدوای خـۆی.. خـاوەن بۆچـوون‌و بڕیـار دەرەکـانی کۆچـکرد و پشتیوانانی کۆکردەوە تـا بۆچوونیان لـەو بـارەوە بزانێـت... هەموویان ستایشی عومەریان کرد.. ئەبوبەکر (ﷺ) بەم مژدانە دڵخۆش بوو، هەندێ لەخەڵك ئـەم قسانەیان بیست، یـەکێکیان هـات بـۆلای ئەبوبـەکر و پێـی وت: تـۆ چـی بـەخوا دەڵێـی ئەگـەر پرسـیاری دانـانی عومـەری لێکردیـت بەسـەر ئێمـەدا؟ لەکاتێکـدا دەزانی توندە؟ ئەبوبەکر (ﷺ) وتی: دەمترسێنی (تیا بچێت) کـە عومـەر سـتەم لەکاروباری ئێوە دەکات دەڵێم: پـەروەردگار باشـترین کەسـم کـردووە بەجێنشین ئەم قسەیەشم بگەیەنە بەوانەی دوای خۆت.

پاشـان ڕاکشا، بـانگی عوسمـان کـوڕی عـەففان (ﷺ)ی کـرد نامەیـەکی نوسـی کەتیایـدا "عومـەر" بەخەلیفـە دەسـت نیشـان کـرد، پاشـان فـەرمانی کـرد و نامەکـەیان مـۆر کـرد، کـاتێ (عثمـان) (ﷺ) نامەکـەی هێنـاو بەسـەرخەڵکیدا خوێندییـەوە هـەموویان ڕازی بـوون‌و مـل کـەچ بـوون، پاشـان پـەیمانیان بـە (عومەر)دا بۆ خەلیفایەتی.

# ﴿خێزانێکی بەختەوەر﴾

ڕۆژێك فاتیمەی کچی قەیس (ﷺ) هات بۆ خزمەت پێغەمبەر بۆ ئەوەی ڕاوێژی پێبکات، چونکە "معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان" و "ئەبو جوهیم" هاتبوونە داخوازی‌و ئەویش نەیدەزانی کامیان باشتر و شیاوترە بۆ ئەوەی شوی پێبکات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەبو جوهیم) گۆچانەکەی لەسەر شان داناگرێت "واتە: سەفەری زۆر دەکات یان زۆر لەژن دەدات.

معاویەش هەژارە وماڵی نییە، پاش ئەوە ئاماژەی بۆکرد کە شوبکات بە ئوسامەی کوڕی زەید.

سەرەتا فاتیمە (ﷺ) ئەمەی پێخۆش نەبوو، بەڵام ئیتر فاتیمە هەستیکرد کە باشتروایە بەگوێی ڕاوێژەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بکات، بۆیە ڕازی بوو شوبکات بە ئوسامە (ﷺ).

ئیتر خێزانێکی خۆشحاڵ‌و بەختەوەریان پێکەوەنا و خوای گەورە فەڕ و بەرەکەتی ڕژاند بەسەریاندا و فاتیمە بەئوسامە دڵخۆش‌و کامەران بوو.

# «بڕیار و ویستی خوا»

ئەمیری موسوڵمانان "عومەری کوڕی خەتاب" (ﷺ) بەرەو شام رۆشت، لەڕێگەدا سوپای موسوڵمانانی پێگەیشتو هەواڵیان پێدا کەنەخۆشی (تاعون) لەشامدا پەرەی سەندووە بۆ ئەم مەبەستە (عومەر) (ﷺ) گەورە پیاوانی کۆچکرد و پشتیوانانو قوڕەیشی کۆکردەوە، راوێژی پێکردن کە سوپاکە بگەڕێنەوە بۆ خۆپاراستن لەو نەخۆشییە ترسناکەی کە هەرەشە لەژیانی موسوڵمانان دەکات، هەندێکیان بۆچوونیان وابوو کەسوپا بەردەوام بێت لە فەتحەکانی، هەندێکیش گەڕانەوەی سوپاکەیان پێ گونجاو بوو، پێشەوا عومەر (ﷺ) بڕیاری گەڕانەوەی سوپاکەی دەرکرد.

ئەبو عوبەیدە کوڕی جەراح (ﷺ) وتی: ئایا کەبڕیار و قەدەری خوا رادەکەین؟ پێشەوا رەخنەی لێگرتو پێی وت: بەڵێ لەقەدەری خوا رادەکەین بۆلای قەدەری خوا

(نعم.. نفر من قدر الله الى قدر الله).

لەمکاتەدا عەبدولرەحمن کوڕی عوف ئامادەبوو، وتی: لەپێغەمبەر (ﷺ)م بیستووە کە دەیفەرموو (إذا سمعتم به (أي: الوباء) بأرض فلاتقدموا عليه، وإذا وقع بارض وأنتم بها فلا تخرجوا).

واتە: کاتێ ئەو نەخۆشیانەی تەشەنە دەکەن بیستتان کەلە ولاتێکدا بلاوبۆتەوە، ئێوە مەڕۆنە ئەو ولاتە.. ئەگەر لەوخاکەدا بوون کە نەخۆشیەکەی تیا بلاوبۆتەوە لێ دەرمەچن بۆ راکردن لە نەخۆشییەکە.

بۆیە پێشەوا عومەر (ﷺ) بەم فەرمودە زۆر خۆشحاڵ بوو سوپاسی خوای گەورەی کرد و سوپاکەی گێڕایەوە. (البخاری و مسلم)

# «جەنگێکی یەکلاکەرەوە»

لەدوای زنجیرە شەڕێکی نێوان موسوڵمانانو فارسەکان، هەواڵ گەشتە لای گەورەی موسوڵمانان "عومەر کوڕی خەتاب" (ﷺ) کە مەجوسەکان خۆ ئامادە دەکەن بۆ شەڕێکی یەکلاکەرەوە لەگەڵ موسوڵماناندا.

عومەر (ﷺ) بڕیاریدا خۆی سەرۆکایەتی سوپایەك بکات کەلە مەدینەوە بڕوات بۆ شەڕ لەگەڵ مەجوسەکان.

هاوەڵانی کۆکردەوە و ڕاوێژی پێکردن، ئەوانیش ڕاکەیان پەسەند کرد، جگە لە "عەبدولرەحمن کوڕی عەوف" (ﷺ) ئەو وتی: دەترسم ئەگەر سوپاکەت بشکێت، ئەوا لاوازی ڕوبکاتە کاروباری موسوڵمانان لەهەموو شوێنو جێگەکاندا، بۆیە وادەبینم کەسێکی تر لەجێگەی خۆت دابنێی.

پێشەوا (عومەر) ئەم بۆچوونەی پەسەند کرد، لەجیاتی خۆی "سەعد کوڕی ئەبی وەقاص" کردە سەرکردەی سوپاکە.

سەعد (ﷺ) بەسەرکردایەتی سوپاکە بەڕێکەوتو لەشەڕی "قادسییە"دا توانی سەرکەوتنێکی گەورە "بەیارمەتی خوا" بەدەست بهێنێ بەسەر فارسەکاندا، بەمەش بەیەکجاری دەوڵەتی فارس ڕوخا.

# «ڕاوێژکردن بە "ئوم سەلەمە"»

لەساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرەو مەککە بەڕێکەوتو هاوەڵانیش لەخزمەتیدا بوون، بۆ جێبەجێ کردنی "عەمرە"، بەڵام قوڕەیش نەیانهێشت موسوڵمانان بچنە شارەکە لەو ساڵەدا، سەرەنجام ڕێکەوتنی "حودەیبیە" ی بەرهەم هێنا کە بەمەرج گیرابوو دەبێت ئەو ساڵە موسوڵمانان بگەڕێنەوە و (عەمرە) نەکەن‌و ساڵی داهاتوو بۆ ئەنجامدانی (عەمرە) بگەڕێنەوە، پێغەمبەریش بەهەموو مەرجەکان ڕازی بوو.

پاشان فەرمانی بە موسوڵمانان کرد کە قوربانییەکانیان سەربېڕن‌و سەریان بتاشن‌و ئیحرام بشکێنن، بەڵام کەس وەڵامی فەرمانەکەی پێغەمبەر (ﷺ)ی نەدایەوە، چونکە ڕازی نەبوون بەڕێکەوتنەکە.

پێغەمبەر (ﷺ) بەتوڕەیی ڕۆشتە ناو خێمەی هاوسەرەکەی "ئوم سەلەمە" (ﷺ) وە ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە ئەویش پێشنیاری ئەوەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کرد کەخۆی بچێتە دەرەوە بۆلای هاوەڵان، قسە لەگەڵ کەسدا نەکات، سەری خۆی چاك بکات‌و قوربانییەکەی سەربېڕێ، ئیتر لەدوای ئەو هاوەڵانیش هەمان کار دەکەن، پێغەمبەر (ﷺ) قسەو بۆچوونەکەی بەجوان زانی، بۆیە ڕۆشتە دەرەوە و بێ ئەوەی قسە لەگەڵ کەسدا بکات سەری چاککرد و حەیوانەکەی سەربڕی، کاتێ موسوڵمان ئەمەیان بینی، ئیتر دڵنیا بوون کە ڕێکەوتنی لەگەڵ قورەیش بەفەرمانی پەروەردگار بووە، بۆیە هەستان پێغەمبەر (ﷺ) چی کردبوو، ئەوانیش ئەنجامیانداو ئیحرامیان شکاند.

# ﴿خورمای مەدینە﴾

هۆزی (غطفان) بەسەرکردایەتی (عویینە کوڕی حصین) و (حارس کوڕی عەوف) چونە ریزی قوڕەیش بۆ شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان لەغەزای خەندەقدا، کاتێ ئابلۆقەی سەر موسوڵمانان توند بوو، پێغەمبەر (ﷺ) ویستی رێکەوتنێکیان لەگەڵ بکات کە سێیەکی بەروبومی مەدینەیان بداتێ، تائەوان واز لەشەڕ بهێنن بۆ ئەم مەبەستە راوێژی بە (سەعد کوڕی معاذ) و (سەعد کوڕی عوبادە) کرد وتیان: ئەگەر فەرمانی خوایە، ئەوە گوێڕایەڵو مل کەچین، ئەگەر شتێکە بۆ بەرژەوەندی ئێمە، ئەوە پێویستمان پێی نییە، ئێمە گەلێك بوین کە هاوەڵمان بۆ خوا بڕیار دەدا و بتمان دەپەرست لەوکاتەشدا ئەوان مەگەر بەمیوانی یان بەکڕین لە بەروبومی ئێمەیان خواردبێت، جا کەخوا رێزی لێگرتین و ئیسلامی پێ ئاشناکردینو سەربەرز بووین، تازە ماڵو بەروبومیان بدەینێ؟ سوێند بەخوا مەگەر بەشمشێر ئەگەرنا، نایاندەینێ، پێغەمبەر (ﷺ) بەمتمانە بەخۆبوونیان سەرسام بوو، بۆیە رێکەوتنی لەگەڵ هۆزی "غطفان" نەکرد، خوای گەورەش پێغەمبەر و جەنگاوەرانی موسوڵمانی سەرخستو ئەحزاب تێکشکا.

# «دایك و جیهاد»

هەمیشە هاوەڵان ڕاوێژیان بە پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد ڕۆژێك کاتێ موسوڵمانان سەرقاڵی خۆئامادەکردن بوون بۆ جیهاد کەسێك بەناوی "جاهمەی سەلەمی" (ﷺ) ویستی لەگەڵیان دەربچێت، چووە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) تا ڕاوێژی پێبکات کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ)ی بینی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەمەوێت بڕۆم بۆ غەزا، هاتووم ڕاوێژت پێ بکەم؟ پێغەمبەر (ﷺ) لێی پرسی؟ ئایا دایکت هەیە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەمووی: بڕۆ خزمەتی دایکت بکە، چونکە بەهەشت لەژێر پێی ئەودایە.

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی دایکی (جاهمە) پێویستی بە خزمەتو چاودێری هەیە و کەوتۆتە تەمەنەوە، تەنها ئەو کوڕەشی هەیە، بۆیە ئامۆژگاری کرد کەبڕوات خزمەتی بکات، ئەوا جیهادە لەپێناو خوادا.

**فەرمووی:** (فالزِمها، فإنّ الجنَّة عند رِجليها) (النسائي و أحمد و الطبراني في الاوسط و رجاله ثقات).



# ﴿پێش مردن﴾

کاتێ لەنوێژی بەیانیدا پێشەوا (عومەر کوڕی خەتاب) بەسەختی بریندار کرا بەهاوەڵانی دەوری وت: براکانم بۆ بانگ بکەن.. وتیان: کێن؟ وتی: عثمان و عەلیو طلحة و زوبێر و عبدالرحمن کوڕی عەوفو سەعد کوڕی ئەبی وقاص (رضي الله عنه) کاتێك هاتن پێشەوا وتی: دەربارەی کاروباری موسوڵمانان ورد بوومەوە، ئەم شەش کەسەم بەسەرکردە و گەورەی خەڵك دۆزیوەتەوە بۆیە گەورەیی موسوڵمانان لەنێو ئێوەدایە، ئەگەر راست بکەن، بۆئەوەی کارێ خەڵکیش راست بێت، ئەگەر جیاوازییەکیش بێت بالەنێو خۆتاندا بێت، پاشان وتی: سێ کەس لەنێو خۆتاندا راوێژ بکەن، بالەو ماوەدا صوهەیبی رۆمی پێش نوێژی موسوڵمانان بکات وتیان: راوێژ بەکێ بکەین؟ وتی: بەکۆچکردوانو پشتیوانانو بەڕێز و گەورە پیاوانی ئێرە کە سەرکردەی خەڵکن.

لەپاش مەرگی پێشەوا ئەم شەش کەسە کۆبوونەوە بەردەوام لەنێوان خۆیاندا راوێژیان دەکرد، لەکۆتایدا هەموویان "عثمان کوڕی عەففان" (رضي الله عنه) یان هەڵبژارد تاببێتە سێهەم جێنشینی بەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵمانان.

## لە کۆتاییدا...

ڕاوێژکردن بنەمایەکی گەورەیە لە بنەماکانی ئیسلام خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کردووە تاڕاوێژ بە موسوڵمانان بکات (وشاورهم في الامر .....) ال عمران ٥٩.

هەروەها لە باسی وەسفی موسوڵمانانندا فەرموویەتی ڕاوێژ لەنێو یەکتردا دەکەن (وامرهم شورى بينهم) الشورى ٣٨.

بەدڵنیاییەوە "شورا" ڕاوێژکردن چاکە و ئاشتیو ئارامی بۆ ئوممەتی ئیسلام دەچەسپێنێو ئەوەی کاری بەڕاوێژە پەشیمان نییە، لەزۆر جێگە و ڕووداوی زۆردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕاوێژ و پرسی بەهاوەڵان کردووە و فەرموویەتی (اشيروا على أيها الناس) دوای خۆشی هاوەڵانی (خەلیفەکانی ڕاشدین) لەسەر ئەم ڕێباز و ڕەوشتە جوانو بەرزە بەردەوام بوون.

بۆیە پێویستە ئێمەش لەبڕیارەکانماندا خۆسەپێنەر نەبین وەهیچ کارێک ئەنجام نەدەینو بڕیارێک نەدەین، هەتا ڕاوێژ و پرس بەکەسانی خاوەن ئەزموونو زانستو زانیاری لەو بوارەدا نەکەین، وەسود لە ڕاوێژیان وەربگرین ئەم کۆمەڵە بەسەرهاتەش کە خوێندمانەوە بۆ ئەوەیە لێی فێربینو پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرین.

الله أكبر

# كۆمەڵە چیرۆكێك لەبارەی ڕاستگۆیی

نووسینی

عەبدولعەزیز السید هاشم

وەرگێڕانی

ناصح محمد شریف موبڕە یی

# ﴿ڕاستگۆیی (الصدق)﴾

الصدق:واتە:بونی هێز لەشتێكدا قسەبێت یان كردار ،ئەمەش بەرامبەر(كذب)ە كەهێزی تیا نیە.

لەزاراوەدا واتە: هاوسەنگبوونی قسەو كردارە، واتە یەكسان بوونی ئەوەی بە زوبان دەوترێت لەگەڵ ناخ و دەرونی وتە بێژەكەدا،هەروەها هاوتا بێت لەگەڵ ڕاستی ئەو شتەی هەواڵی لەبارەوە دەدات .

ئیمام قوشەیری دەڵێت: (الصدق ان لایكون في احوالك شوبٌ ،ولا في اعتقادك رَیبٌ ولا في اعمالُك عیب).

*قورئان ڕوبەڕوی ئەوانە دەبێتەوە كە دەڵێن قورئان دانراوی (محمد)ە ،پێیان دەفەرموێت :كە وایە و ئەگەر ڕاست دەكەن ،باچەند ئایەتێك وەكو قورئان بهێنن:﴿أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ﴾(الطور: ٣٣، ٣٤ ).

*ئەوانەی باوەڕداری ڕاستن كەسانێكن باوەڕیان بەخواو پێغەمبەر هێناوەو هەرگیز پاشگەز نابنەوەو بە ماڵ و گیانیان لەڕێگەی خوادا تێدەكۆشن.

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾(الحجرات: ١٥ ).

*ڕاستگۆیان وڕاست كرداران لە قیامەتدا لەگەڵ پێغەمبەران و شەهیدان و چاكانن.

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَٰٓئِكَ رَفِيقًا﴾(النساء: ٦٩).

*ڕۆژی قیامەت ڕاستی ڕاستگۆیان سودی دەبێت و بەرەو ڕەزامەندی خواو بەهەست ڕێنموییان دەکات.﴿قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾(المائدة: ١١٩).

*خوای گەورە فەرمان دەکات لەگەڵ ڕاستگۆیان بین.﴿ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾(التوبة: ١١٩ ).

*پێغەمبەرانی خوا ﷺ هەموویان دارای ڕەوشتی ڕاستگۆیی بوون.﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا﴾(مريم: ٤١ ،٥٤ ، ٥٦ ).

*کاتێ بێباوەڕان زیندوو دەکرێنەوە بە سەرسامی دەڵێن کێ ئێمەی زیندوو کردەوە ،باوەڕداران دەڵێن:﴿قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾(يس:٥٢).

*فەرمودەو بەڵێنەکانی خوا هەموی ڕاست و دادپەروەرن﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾(الانعام: ١١٥).

*پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إضمنوا لي ستاً من انفسكم ،أضمن لكم الجنة :أصدقوا إذا حدثتم وأوفو إذا وعدتم ،وأدو إذا ائتُمنتم، واحفظو فروجكم ،وغُضوا أبصاركم ،وكُفو أيديَكم)الحكم (صحيح الاسناد).

*(دَعْ مايريبُكَ الى مالايريبك ،فإن الصدق طُمأنينةٌ، والكذِب رِيبةٌ)رواهُ الترمذي.

واتە:واز لە شتی گوماناوی بهێنە ،بڕۆ بۆ کارێك لێ ی دڵنیا بیت،چونکە ڕاستی ئارامبەخشەو درۆ نائارامیە.

*بە لوقمانی حەکیم وترا تۆ بەندەی فلان کەس نەبوویت ؟وتی:بەڵێ،وتیان:ئەی چۆن گەشتیتە ئەم پلەو پایە؟وتی:تەقوای خواو ڕاستگۆیی لەقسەدا و گێڕانەوەی ئەمانەت و وازهێنان و لەشتێ کە پەیوەندی بە منەوە نەبێت.



# ﴿ڕاستی وتن بەهێزییە﴾

بلال کوڕی ڕەباح هاوڕێی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ براکەیدا ڕۆشت بۆ ئەوەی داخوازی ئافرەتێکی لەقورەیش بۆ بکات، کاتێ چونە لای کەسوکاری ئافرەتەکە بیلال پێی وتن، ئێوە هەموو شتێك دەربارەی منو براکەم شارەزان، ئێمە دووکەسی بەندە بوینو خاوەنی خۆمان نەبوین، خوای گەورە ئازادی کردین، ئێمە گومڕا و بێدین بوین، خوای گەورە ڕێی نیشاندایین بۆ ئیسلام، ئێمە هەژار بوین، خوای گەورە دەوڵەمەندی کردین وتیان: بەڵێ وایە ئەی بیلال! بەچاکی ئەوە دەزانین چیت دەوێت؟! وتی: هاتووم داخوازی کچەکەتان بکەم بۆ براکەم، ئەگەر پێی دەبەخشن سوپای خوا دەکەم ئەگەر ڕازیش نابن دەسەلاتمان نییە و "فلا حول ولاقوة إلا بالله"

کەسوکاری ئافرەتەکە ڕۆشت بۆ ڕاوێژی خۆیان، یەکێکیان وتی: ئێوە پلەوپایەی بیلال لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەزانن کچەکەتان بدەن بەبراکەی، بەدڵنیاییەوە خێری تیایە، ئەوانیش ڕازی بوون، پاشان ڕۆیشن بۆ ئەوەی هەواڵی ڕازی بونەکە بەبیلالو براکەی بدەن، کاتی چونەدەرەوەماڵئاواییان کرد لەگەڵ براکەیدا، براکەی بەگلەییەوە بەبیلالی وت: ئەی بیلال خوا لێتخۆش بێت، ئایا باشتر نەبوو کە هەڵوێستە جوانەکانمان لەئیسلامدا لەناو کوڕەکەدا باس بکەیتو خۆشت نەشکێن؟!

بیلال پێی وت: براکەم، لەقسەکانمدا ڕاستم کردووە ئەوەش بووە هۆی ژن هێنانی تۆ.

# «ڕاستیکرد بەڵام درۆزنە»

ئەبو هریرە (ﷺ) شەوێك بینی وادزێك لەماڵی موسوڵمانان "بیت المال" دزی دەکاتو پەلاماری داو گرتی کابرا وتی: کاکە من موحتاجمو زۆر هەژارم، منداڵو خێزانم لەسەرە و پێداویستیم زۆرە، ئەبوو هورەیرە بەزەیی پێداهاتەوە و وازیلێهێنا.

بەیانی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) گەشت، پێی فەرموو: ئەبو هورەیرە ئەسیرەکەی شەوی رابردووت چی لێکرد؟!

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاڕایەوە و باسی حاڵی خۆی کرد کە هەژارە و منداڵی زۆرە، منیش رێگەمدا بڕوات فەرمووی: ئەو درۆی لەگەڵ کردیتو دەشگەڕێتەوە! بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) راستی فەرموو بۆجاری دووەمو سێهەمیش گەڕایەوە و هەردوو جارەکە ئەبو هریرە دەیگرێتو ئەویش داوای لێبوردنی دەکرد تا رزگاری بکات، جاری سێهەم کە سووربوو لەسەر ئەوەی بیبات بۆ خزمەت پێغەمبەر، کابرا پێی وت: وازم لێبهێنە چەند وشەیەکت فێردەکەم، خوای گەورە بەهۆیانەوە سودت پێ دەگەیەنێ، ئەبوو هرمیرە وتی: چیم فێردەکەیت؟

وتی: ئەگەر چویتە سەر جێگەت ئایەت الکرسی (الله لا الـه الا هـو الحي القيوم...) بخوێنە تاکۆتایی ئایەتەکە ئەگەر واتکرد خوای گەورە پارێزەرێکت بۆ دەنێرێو تابەیانی شەیتان لێتنزیك ناکەوێتەوە، ئەو شەوەش ئەبو هەرمیرە (ﷺ) وازی لەکابرا هێنا.

بۆ بەیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری روداوەکەی لێکرد. ئەبو هریرە بۆی گێڕایەوە کەچی رویداوە و ئەویش چی پێی وتووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوەی پێی وتی راست دەکات، بەڵام خۆی درۆزنە.

ئەبوهرمیرە دەزانی ئەم سێ شەوە قسەت لەگەڵ کێدا دەکرد؟ وتی: نەخێر.. فەرمووی: ئەوە شەیتان بوو.

# ﴿درۆیەك - جەنگێك﴾

کاتێ حارس کوڕی زەرار (ﷺ) موسوڵمان بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێکەوت کە بگەڕێتەوە بۆ ناو گەلەکەی و بانگیان بکات بۆ ئیسلام و هەرکەس زەکاتی لەسەر پێویستە کۆی بکاتەوە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێك لە هاوەڵانی بنێرێت بۆ وەرگرتن و گەیاندنی پارەکە، پێغەمبەریش (ﷺ) (وەلیدی کوڕی عوقبە)ی نارد بۆلای حارس بۆ وەرگرتنی زەکاتەکە، کاتێ وەلید هاتە نیوەی ڕێگە، لەحارس و گەلەکەی ترسا، چونکە پێش ئیسلام دوژمنایەتیان هەبوو، بۆیە گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حارث کوڕی ضرار زەکاتەکەی تەسلیم نەکرد و ویستی بشمکوژێت!

پێغەمبەر (ﷺ) تووڕە بوو، سوپایەکی بڕیاردا بۆ جەنگان لەگەڵ حارث و گەلەکەی، لەهەمانکاتدا حارث و گەلەکەی چاوەڕێی نوێنەری پێغەمبەرن بۆ وەرگرتنی زەکاتەکە، کاتێ کەس نەهات، حارس ترسا کەشتێك ڕوویدابێت و پێغەمبەری تووڕە کردبێت، بۆیە لەگەڵ هەندێ کەسی گەلەکەی دەرچوون بەرەو مەدینە، لەڕێگەدا گەشتن بەسوپای موسوڵمانان و زانیان بۆچی هاتوون، هەموویان گەڕانەوە بۆ مەدینە و حارث چووە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ڕاستی بۆ ڕوونکردەوە، خوای گەورەش ئایەتی نارده خوارەوە و فەرمووی: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر گوناهبارێك هەواڵێکی بۆ هێنان، بەشوێن ڕاستی و ناڕاستی هەواڵەکەدا بچن و دڵنیابن و یەکسەر بڕیار مەدەن، نەبادا گەلێك بەنەزانی توشی بەڵاو ناڕەحەتی ببن و پاشانیش لەوەی ئەنجامیانداوە پەشیمان بن (یا أیها الذین أمنوا إن جاءکم فاسق بنبأ فتبینوا أن تصیبوا قوماً بجهالة فتصبحوا علی مافعلتم نادمین).

# «ڕاستی و ڕاستگۆیی بەسە»

دەگێڕنــەوە پیاوێـك کـەمو کـوڕیو ناتــەواوی زۆر بــوو، زۆر هەوڵیــدا بــۆ چاککردنی ناتەواوییـەکانی، بـەڵام نـەیتوانیو سەرکەوتوو نـەبوو، ناچار ڕۆشت بۆلای زانایەکی ناسـراو و لـەخواترسو بـاوەڕدار، سکاڵا و گازەنـدەی حـاڵی خـۆی کرد، پاشان داوای لەزاناکە کرد چارەسەر و ئامۆژگارییەکی بکات.

مامۆسـتاکەش یەکـەمجار داوای لێکـرد لەتـەنها چارەسـەری یـەك سـیفەتی خراپـی خـۆی بکـات کـە "درۆیـە" وە ئامۆژگـاریکرد لەهـەموو کـاتو شـوێنێکدا ڕاسـتگۆ بێـتو پـەنا بـۆ درۆ نـەبات، کـابرا سەرسـام بـوو، لـەدەروونی خۆیـدا پرسیاری کرد، دەبێت پەیوەندی نێوان ڕاستگۆییو سیفاتە خراپـەکانی تـر چـی بێت، بەڵام هەرچۆن بوو بڕیاریدا بەگوێی ئامۆژگاری مامۆستا بکات.

ڕۆژان ڕۆشتن، کابرا ویستی عارەق بخوات، چوو ئامـادەی کـرد و پـەرداخێکی پڕکـرد، کـاتێ بـەرزی کـردەوە بـۆ دەمـی لـەدڵی خۆیـدا وتـی: ئەگـەر مامۆسـتا پرسیاری لێکردم، ئایا هەواڵی بدەمێ کە ئەم گوناهەم کردووە؟ یان درۆی لەگـەڵ بکـەم؟ نـەخێر، ناخۆمـەوە و درۆشـی لەگـەڵ ناکـەم، چـونکە بڕیـارم داوە، بـەم شـێوەیە، هـەرکات کـابرا دەیویسـت گوناهێـك ئـەنجام بـدات، وازی لێـدەهێنا بـۆ ئــەوەی لای مامۆســتاکە درۆ نــەکات، بەرۆشــتنی کــات وردە وردە کــابرا وازی لەسیفاتە خراپەکانی هێنا، ئەمەش لەسەرەنجامی پابەند بـوونی بـە ڕاسـتگۆییو دوورکەوتنە و لەدرۆ بوو.

# ﴿منداڵ و دزەكان﴾

منالێك خۆی ئامادەكرد بۆ ڕۆشتن بۆ بەغدا بەمەبەستی فێربوون‌و بەدەست هێنانی زانست‌و زانیاری دایكی بڕی (٤٠) دیناری پێدا بۆ خەرجی سەفەرەكەی كاتێ ڕۆشت دایكی وتی: كوڕم بەڵێنم پێبدە كە هەرگیز درۆنەكەیت، لەهەرحاڵ‌و بارێكدا بوویت، منالەكەش بەڵێنی بەدایكیدا، پاشان لەگەڵ كاروانێكدا بەڕێكەوت، لەناو بیاباندا دەرۆشتن لەشوێنێكدا كۆمەڵێك چەتە و دز ڕێگەیان لێگرتن‌و هەرچی پارە و سامان‌و شتوومەكیان پێ بوو بردیان، پاشان یەكێكیان بەگاڵتەوە ڕووی لە منالەكە كرد و پرسی: ئەی تۆ هیچت پێیە؟ منداڵەكە وتی: بەڵێ چل دینارم پێیە، كابرای دز دای لەقاقای پێكەنین‌و وای زانی منداڵەكە گاڵتە دەكات، یان شێت بووە!! بردی بۆلای گەورەكەیان‌و ڕووداوەكەی بۆ گێڕایەوە... گەورەی دزەكان بەمنالەكەی وت: كوا پارەكە؟ كاتێ دەری هێنا و دەركەوت كەڕاستی وتووە! پێی وت: خۆ ئەگەر بتوتایە هیچم پێنییە باوەڕی پێدەكردی، بۆچی ڕاستت وت؟ منداڵەكە وتی: ئاخر بەڵێنم بەدایكم داوە كە درۆنەكەم‌و لەهەموو كاتێكدا ڕاستی بڵێم ..!!

منیش نامەوێت بەڵێنەكەی دایكم بشكێنم!

گەورەی دزەكان سەرسام بوو، ماوەیەك بیری لەقسەی منالەكە كردەوە، ئینجا سەری بەرز كردەووە بەمنالەكەی وت: تۆ لەبەر ئەوەی پەیمانێك نەشكێنی كەلەگەڵ دایك كردووتە ئامادەی قوربانی بەماڵ‌و سامانەكەت بدەیت !!

وە دەترسی لەشكاندنی پەیمان، بەلام من هێندە دڵڕەقم ترسی شكاندنی پەیمانێكم نییە كەبەخوام داوە! فەرمانی كرد هەرچی پارە و شتوومەك هەیە لەكاروانەكەیان سەندووە بۆیان بگێڕنەوە، بەمنالەكەشی وت: لەسەر دەستی تۆ ئەوا من تەوبەم كرد و گەڕامەوە بۆلای خوا.

دزەكانی تریش بەگەورەكەیان وت: تۆ لەڕێگریدا گەورەمان بوویت، ئەمڕۆش لەتەوبە و پەشیمانیدا هەر گەورەمانی، ئیتر هەموویان تەوبەیان كرد.

دەڵێن ئەم منالە شێخ عەبدولقادری گەیلانی بووە (ﷺ).

# ﴿سزای درۆزنێك﴾

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) کاربەدەستی شاری کوفە بوو، خەڵکەکەی گازەنـدەو گلـەییان بـردە لای گـەورەی موسـوڵمانان، (عومـەری کـوڕی خـەتاب) (ﷺ) وتیان: نوێژەکانی باش ئەنجام نادات ..

سـەعد وتـی: دەی سوێند بـەخوا، وەك پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) نوێـژیان بـۆ دەکەمو لـەوە کـەمترم نـەکردووە، ئـەوەتا نوێـژی عیشایان بـۆ دەکـەم، دووڕکاتی یەکەم درێژ دەکەمەوە و دووڕکاتی دوایی هێواش.

عومەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی باوکی ئیسحاق هـەر ئـەو گومانـەم پێـدەبردی، واتە گومانی باش، پاشان پیاوێکی لەگەڵ سەعد نـارد، بـۆ ئـەوەی هـەواڵی سـەعد لەخـەڵك بپرسـێت، ئـەو پیـاوەش بەمزگەوتـەکانی کوفـەدا گـەڕا و پرسـیاری سەعدی لەخەڵك دەکرد، ئـەوانیش ستایشـیان کـرد کـاتێ بـەلای مزگـەوتی بـەنی عەبەسـدا ڕۆشـتو پرسـیاری کـرد پیاوێکیـان وتـی: سـەعد لەگـەڵ سـوپادا دەرناچێتو بەیەکسانی شت دابـەش ناکاتو دادپـەروەر نییـە لـەبڕیاردا، کـاتێ سەعد بەم وتەیەی زانی دوعای کردوو وتی: پـەروەردگار ئەگـەر ئـەو بەندەیـەت درۆ دەکاتو هەربۆ خۆنوانـدنو ڕوپامـایی ئـەو درۆیـەی کـردووە، تەمـەنی درێـژ بکەیت، هەژاری بەسەردا بدەیت، تووشی بەڵای بکەیت چـەندین ساڵ تێپـەڕبوو، خوای گەورە دوعاکەی سـەعدی وەرگـرت تەمـەنی کابرا درێـژ بـوو تاتـەواو لاواز بوو، هەژاری زۆری بۆ هێنا و حاڵی خراپ بـوو، دەربـارەی خـۆی دەیـوت: پیرێکـی بەساڵاچوو کە تووشـی بـەڵا بـووم، دووعاکـەی سـەعد گرتمـی. بەمشێوە تووشـی سزای درۆکەی بوو.

# ﴿لەگەڵ خوادا راستیکرد - خواش راستی لەگەڵ کرد﴾

دەگێڕنەوە کابرایەکی دەشتەکی لەشەڕی خەیبەر لەڕیزی جەنگاوەرە موسوڵمانەکاندا بەشداری کرد، دوای سەرکەوتنی موسوڵمانان پێغەمبەر(ﷺ) داهاتی جەنگەکانی دابەش دەکرد بەسەر موسوڵماناندا، بەشێکیشی جیاکردەوە و دای بەهاوەڵانی بۆ ئەوەی بیبەن بۆ ئەو کابرا دەشتەکییە، هاوەڵان بەشەکەیان بۆ برد و تەسلیمیان کرد، ئەویش بەشەکەی هەڵگرت، بەرەو لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) رۆشتو لەخزمەتیدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ص)، من بۆ ئەمە شوێنت نەکەوتووم! بەڵکو بۆ ئەوە شوێنت کەوتووم کە تیرێک لەگەردنم بدرێتو بمرمو بچمە بەهەشت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەگ راست بکات لەگەڵ خوادا خواش راستی لەگەڵ دەکات لەدوای ئەوەی ئەو کابرایە لەشەڕێکی تردا بەشداری کرد وەك کەسێکی ئازا و دلێر جەنگا، دژی بێباوەڕان وەستا تا لەناکاو تیرێك هاتو لەگەردنی کابرا چەقیو شەهید بوو، دوای تەواو بوونی شەڕەکە، تەرمی ئەو کابرایەیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەمە کابرایە؟ هاوەڵان وتیان: بەڵێ، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەگەڵ خوادا راستی کرد و خواش راستی لەگەڵکرد.

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) عەباکەی خۆی داگرتو کردی بەکفنی کابرای دەشتەکیو نوێژی لەسەر کرد و لەخوا پاڕایەوە، فەرمووی: پەروەردگار ئەمە بەندەی تۆیە، لەپێناوی تۆدا کۆچی کردووە و بۆغەزا دەرچووە تا بەشەهیدی کوژرا، من شایەتی ئەمەی بۆ دەدەم!!.

# «کابرای زانا و دەشتەکی»

دەگێڕنەوە یەکێك لە زانایان کەسەرقاڵی کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو، بۆ ئەوەی بیان نوسێتەوەو تۆماریان بکات، هەواڵی بیست کابرایەك فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەبەرە، بۆ وەرگرتنی ئەو فەرموودەیە ڕۆشت بۆ لای کابرا، کاتێك زاناکە گەشتە لای کابرای دەشتەکی، بینی وا لکی کراسەکەی گرتووە وەك ئەوەی خۆراکێکی تیابێت، وەبانگی ولاخەکەی دەکرد، ئەویش خێرا گەڕایەوە بۆ خواردنی شتەکە، کە گەشتە لای کابرای خاوەنی، گرتیو بردیەوە بۆ ماڵەوە، کابرای زانا پرسی؟ :ئەوە هیچ خۆراکێك لەکراسەکەتدا هەبوو بۆ ولاخەکە کەبانگت کرد؟ وتی: نەخێر، ئەوە فێڵم لێکرد تا بیگرمەوە..

زاناکە تورە بوو، پێش ئەوەی فەرمودەکەی لێوەربگرێ بەجێی هێشتو ڕۆشت، کابرا بانگی کرد، چاوەڕێبە، تافەرموودەکەت بۆ دەڵێم، بەلام زاناکە لە ڕۆشتنی خۆی بەردەوام بوو بەدەم ڕێگەوە بەکابرای وت: بەڕاست نازانم، چونکە تۆ لەگەڵ گیانلەبەراندا درۆ دەکەیت، من فەرموودە لەکەسی درۆزن وەرناگرم.

# «خورمایەك یان درۆیەك»

موسوڵمان هەمیشە سوورە لەسەر ڕاستگۆیی لەگەڵ هەموو کەسێکدا، وەدەزانێ پێچەوانەی ڕاستی درۆیە، ئیتر جیاوازی نییە لەنێوان درۆیەکی بچوك لەگەڵ درۆیەکی گەورە هەردووکیان لای خوا بەدرۆ تۆمار دەکرێن.

دەگێڕنەوە دایکێك بانگی مناڵە بچوکەکەی دەکاتو دەڵێ: وەرە شتێکت پێ دەبەخشم.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێی لێ دەبێت، پرسیار لە ئافرەتەکە دەکات، دەتەوێت چی پێ ببەخشیت؟

وتی: خورما. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر شتێکت پێنەبەخشیایە درۆیەك لەسەرت دەنوسرا !!

# ﴿ڕاستی و قبوڵبوونی تەوبە﴾

کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بەرەو غەزای تەبوك ڕۆشتن هەندێ لەهاوەڵان دواکەوتن‌و لەگەڵیان دەرنەچوون، کەعبی کوڕی مالیك (ﷺ) یەکێك بوو لەوانە، کاتێ بیری لەخۆی کردەوە کەلە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دواکەوتووە و ئەو پاداشتە گەورەی بەزایە داوە، زۆر غەمگین‌و نارەحەت بوو، دەترسا خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) لێی توڕەبن، کەوتە بیرکردنەوە و تێرامان، بەچ ڕوویەکەوە ڕوبەڕووی پێغەمبەر(ﷺ) ببێتەوە و داوای لێبوردنی لێ بکات، ئایا درۆیەك بکات؟ تا ڕزگاری ببێت یان ڕاست بکات با ئەو ڕاستییەش توشی سزای بکات؟! لەکۆتاییدا کەوتە سەر ئەو بڕیارەی کە ڕزگار بوون لەم ناهەمواریە تەنها بەڕاستگۆیی دەبێت لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ)، بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، ئەوانەی کەلە غەزاکە دواکەوتبوون‌و نەڕۆشتبوون چوون‌و عوزر و بەهانەیان هێنایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) بەهانەکانی وەرگرتن‌و ئەوەی لەدڵیاندا بوو حەواڵەی خوای کردن، کەعبیش بەشەرمێکەوە هات‌و لەبەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشت، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێکرد چی دوای خستووە و لەگەڵیان نەڕۆشت؟! کەعب بەوپەڕی ڕاستی وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەر (ﷺ) سوێند بەخوا من هیچ بەهانەیەکم نییە، سوێند بەخوا هیچ کات ئەوەندە بەتوانا و دەوڵەمەند نەبووم!!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئا ئەمە ڕاستی وت: هەستە بڕۆ تا خوای گەورە بڕیاری خۆی دەدات بەسەرتا، هەروەها مورارەی کوڕی رەبیع‌و هیلال کوری ئومەییە (ﷺ) هاتن ئەوانیش لەغەزاکە دواکەوتبوون‌و لەخزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ڕاست قسەیان کرد و دانیان بەهەڵە و کەم‌و کوڕی خۆیاندانا و وتیان: هیچ بەهانەیەکمان نییە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد کەهیچ موسوڵمانێك قسە لەگەڵ ئەو سیانەدا نەکات، موسوڵمانانیش پەیوەندی‌و قسەیان لەگەڵ پچڕاندن، ئەوسیانە وەك نەناس‌و ڕێبواریان لێهات، هەستیان دەکرد دنیا بەو فراوانییە

بەتەواوی لەسەر ئەوان بچوك بۆتەوە، دەرونیان زۆری بۆ هێنابوون، هەستیان بەئازاری دەرونی دەکرد، رۆژەکان لەم سێ موسوڵمانە زۆر بەناز رەوە دەرۆشت، رۆژ بەرۆژ نارەحەتو غەمبار دەبوون، رۆژەکان لەلای ئەوان ئاسایی نەبوونو سەخت دەرۆشت بەم شێوە مانەوە تا پەنجاهەم شەو، کەعب لەسەربانی ماڵەکەی خۆیان نوێژی بەیانی کرد، کەوتە یادی خوای گەورە لەپڕ خامۆشی ماڵو کۆڵان بەدەنگێك شڵەقا دەنگێکی بەرز کەهاواری دەکرد، ئەی کەعبی کوڕی مالیك ! مژدە بێت، مژدە، کەعب زانی کە خوای گەورە پەشیمانی لێ قبوڵ کردووە، لەگەڵ ئاباریی فرمێسکی شادیدا خۆی پێ رانەگیرا و سەری نەوی کرد و سوجدەی سوپاسگوزاری بۆخوا برد.

خەڵك لەدەوری ماڵیان کۆبوونەوە پیرۆزباییان ئاراستە دەکرد، لەکەعبو دوو هاوەڵەکەی تریش، کەعب چیتر خۆی رانەگرتو بەرەو مزگەوت رۆشت، بینی وا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتووە، سڵاوی لێکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) بەدەم زەردەخەنەوە فەرمووی: مژدەبێت بەخۆشترین رۆژ کەبەسەرتا هات، لەو رۆژەوەی لەدایك بوویت رۆژی واشاد و خۆشت نەدیووە.

کەعب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلایەن جەنابتەوە یان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخێر ... لەلایەن خوای گەورەوە !

پاشان کەعب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوای گەورە بەهۆی راستگۆیمەوە رزگاری کردم، وەبەشێك لە تەوبەم ئەوەیە کە پەیمان دەدەم هەتا لەژیانمدا بمێنم جگە لەڕاستی هیچی تر نەڵێم بەم شێوە خوای گەورە لەکەعبو دوو هاوەڵەکەی خۆش بوو، بەهۆی راستگۆییان لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) و خۆدورگرتنیان لەدرۆ، ئایەتی قورئان دەربارەیان هات کەدەبێت بخوێنرێتەوە و باسی سەرگوزشتە و قبوڵ بوونی تەوبەی ئەوسێ هاوەڵە راستگۆیە بگێڕێتەوە.

# ﴿خوا شایەتی ڕاستی دەدات﴾

لەیەکێك لە غەزاکاندا "زەیدی کوڕی ئەرقەم" کە گەنجێکی منداڵ بوو گوێی لە "ئوبەی کوڕی سەلول" بوو کە هەڕەشەی لە موسوڵمانەکان دەکرد بەدەرکردنیان لەمەدینە، شوێنکەوتوانی هاندەدا بۆ ئەو مەبەستە، و پێی دەوتن: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە خاوەن دەسەڵاتەکان، (کەمەبەستی خۆیان بوو)، لاواز و زەلیلەکان (کەمەبەستی موسوڵمانان) بوو شاربەدەر دەکەن. زەید لەم قسەیە توڕە بوو، بڕیاریدا موسوڵمانان ئاگادار بکاتەوە بۆ ئەوەی خۆ لەئازاری دوو ڕووەکان بپارێزن، ڕۆشت بۆ لای مامی‌و ئەو هەواڵەی پێگەیاند، مامیشی بەپەلە ڕۆشت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ). کاتێ هەواڵەکەی پێگەیاند، پێغەمبەر (ﷺ) زەیدی بانگ کرد و ئەویش دڵنیای کرد کەخۆی گوێی لەو قسەیە بووە کەلەلایەن دوو ڕووەکانەوە کراوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بەشوێنیدا و " ئوبەی کوڕی سەلول‌و هاوەڵەکانی" هاتن، لەبەردەم پێغەمبەردا (ﷺ) سوێندیان خوارد کە ئەوان قسەی وایان نەکردووە!، پێغەمبەریش (ﷺ) بەڕاستی زانین، چونکە سوێندیان خوارد، وەزەیدی بەدرۆ زانی، زەید زۆر بێتاقەت‌و خەمبار بوو ڕۆشتە ماڵەوە و نەهاتەدەر، هەتا سورەتی (المنافقین) هاتە خوار و درۆی دوو ڕوەکانی هەڵماڵی‌و ڕوونی کردەوە کە ئەوان درۆ دەکەن‌و زەید ڕاستی وتووە، پێغەمبەریش (ﷺ) ناردی بەشوێن زەیددا و سورەتەکەی بۆ خوێندنەوە و فەرمووی: ئەی زەید، خوای گەورە شایەتی ڕاستگۆیی تۆیدا.

# ﴿ڕاستگۆ و بەڕاست دانەر﴾

لەشەوێکدا موعجیزەی شەو ڕەوی‌و بڵندبوونەوە "الاسراء والمعراج" رویدا، خوای گەورە شەو ڕەوی بە پێغەمبەرەکەی کرد لەمزگەوتی حەرام بۆ مزگەوتی ئەقصا، پاشان بڵندی کردەوە بۆ ئاسمانەکان، پێغەمبەر (ﷺ) جاری دووەم گەڕایەوە بۆ مەککە و خەڵك هێشتا لەخەودا بوون.

لەبەیانیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆشتە دەرەوە بۆ ئەوەی هەواڵی ئەو موعجیزەیان پێبداتو بانگیان بکات بۆ باوەڕهێنان بەخوا، هەرکە بێباوەڕەکان ڕووداوەکەیان بیست بەدرۆیان خستەوە و باوەڕیان نەکرد و بەگاڵتەوە هەواڵەکەیان دەماودەم دەگێڕایەوە و پێدەکەنین‌و دەیان وت: ئێمە بەمانگێك دەگەینە شام‌و بەمانگێك دەگەڕێینەوە ئایا "محمد" چۆن بەشەوێك ڕۆشت‌و گەڕاشەوە.

بێباوەڕان بەخێرایی بەرەو ماڵی ئەبوبەکر ڕۆشتن تا ئەو هەواڵەی پێ بدەن بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوەوە ناکۆکی لە نێوان ئەو و پێغەمبەردا(ﷺ) دروست بکەن.

وتیان: ئەی ئەبو بەکر هەواڵی هاوڕێکەت بیستووە واگومان دەبات کەئەمشەو چۆتە مزگەوتی قودس‌و نوێژی تیا کردووە و گەڕاوەتەوە بۆ مەککە.

ئەبو بەکر وتی: جا شتی وای فەرمووە؟

وتیان بەڵێ: ئەوەتا لە "کەعبە" ئەو باسە دەکات ئەبوبەکر وتی: ئەگەر ئەو فەرموبێتی ڕاست دەکات!! چوبێتە مزگەوتی قودس‌و پێش بەیانی گەڕابێتەوە؟

وتی: بەڵێ، من لەشتی لەوە دوورتریش بڕوام پێکردووە، سوێند بەخوا ئەو هەواڵی ئەوەم پێدەدا کە هەواڵی ئاسمانی بۆ دێتە سەرزەوی لەهەر ساتێکی ڕۆژ

یان شەودا بێت، من بەڕاستی دەزانم ئایا ئەمە سەرسام تر نییە لەوەی ئێوە باسی دەکەن !

پاشان ئەبوبەکر ڕۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، بینی خەڵك لەدەوری پێغەمبەر (ﷺ) سەرسامن بەم باسە و داوای بەڵگە دەکەن لەسەر ڕاستی، قسەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایان پێبدات کەلەڕێگەی ڕۆشتنو گەڕانەوەیدا بینیونی، هەروەها باسی مزگەوتی ئەقسای بۆکردن کەچۆنو چەند دەروازەی هەیە و هەمویشی ڕاست بوو هەموو جارێك ئەبوبەکر دەیوت: ڕاست دەکەی شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوای(ﷺ)، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) ئەبوبەکری ناونا "الصديق".

 

## لە کۆتاییدا:

بەدڵنیاییەوە، ڕاستگۆیی ڕەوشتێکی بەرز و جوانە کە پێغەمبەرانی پێی ناسراوەتەوە، وە پێغەمبەری ئێمە (محمد) (ﷺ) بەڕاستگۆ ناسرابوو لەنێو گەلەکەیدا، بە (الصادق الامين) بانگیان دەکرد، ڕاستگۆیی لە گرنگترین ڕەوشتەکانی باوەڕدارە، مەشخەڵی هەمیشەیی موسوڵمانی ساغ ڕاستگۆییو دوورییە لەدرۆ.

ڕاستگۆی ڕێگەی چونە بەهەشتو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەیە لە دونیا و دوارۆژدا.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إن الصدق يهدي الى البر، وإن البر يهدي الى الجنة وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عندالله صديقاً، وإن الكذب يهدي الى الفجور، وإن الفجور يهدي الى النار، وإن الرجل ليكذب حتى يكتب عندالله كزاباً) ئەم چیرۆکانەش باسی ڕاستگۆ و درۆزنان دەکات فێرمان دەکات کە هەمیشە پابەندی ڕاستیو ڕاستگۆیان بینو خۆدوور بگرین لەدرۆ.

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی گوێڕایەڵی

**نوسینی**

شعبان مصطفی قزامل

**وەرگێڕانی**

**ناصح محمد شریف موبڕەیی**

# ﴿گوێڕایەڵی ( الطاعة )﴾

الطاعة: واتە مل کەچی و لەگەڵ ڕۆشتن

الطاعـــة: واتـــە ئەنجامـــدانی کـــارە فـــەرمانپێکراوەکان و وازهێنـــان لـــە قەدەغەکراوەکان وە هەرشتێکە ڕەزامەندی خوای تیا بێت و بەهۆیەوە لە خوا نزیـك ببێتـەوە .هەنـدێکی تـر فەرمویانـە: ئەوەیـە مـرۆڤ لـە ظـاهیرو دیـوی دەرەوەیـدا مـل کـەچ بێت،لـەناوەو لەناخیـدا ڕازی بێـت بـە بڕیارەکـانی خـواو پێغەمبەرﷺ.

*پێغەمبەران وباوەڕداران باوەڕ دەهێنن وگوێڕایەڵی خوان ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾ (البقرە: ٢٨٥).

*گوێڕایەڵی پێغەمبەران(علیه السلام) وەك گوێڕایەڵی خوای گەورە وایە.

﴿قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾(ال عمران: ٣٢ ). واتە: گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکەن.

﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾(ال عمران: ١٣٢).

*خاوەن دەسەڵات وکار بەدەست ئەگەر گوێڕایەڵی خوا بوو،هەڵبژاردەی موسوڵمانان بوو ،وەکەسێك بوو لەخۆیان دەبێت گوێڕایەڵی بکرێت﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ

فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾(النساء: ٥٩).

*ئەی کۆمەڵی باوەڕداران گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەرو کاربەدەستەکان کەلە خۆتانن (موسوڵمانن)بکەن.

*سەرفرازی قیامەت بەستراوە بە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ [وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾(النور: ٥١، ٥٢ ).

*گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ مایەی دابارینی ڕەحمەتی خوایە﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾(النور: ٥٦ )

*گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن هەتا خواش بەزەیی بێتەوەو ڕەحمتان پێ بکات.

*هەموو دروستکراوان گوێڕایەڵی فەرمانی خوان﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾(ال عمران: ٨٣ ).

*پاداشتی گوێڕایەڵان لەگەڵ بوونی پێغەمبەران وبەدەست هێنانی بەهەشت وسەرفرازی قیامەتە﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا﴾(النساء: ٦٩).

﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾(النساء: ١٣ ).

*پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:(اسمعوا وَأطيعوا ،وَان إستعملَ عليكُم عبد حبشيٌ كانَ راسَهُ زَبيبةٌ )(البحاري).

·(السمعُ وَالطاعةُ على المرء المسلم فيما أحب وَكره،مالم يؤمر بِمعصية فاذا أُمِربمعصية فلا سمع ولا طاعة)(البخاري ومسلم).

واتە:بیستن و گوێڕایەڵی پێویستە لەسەر موسوڵمان لەو شتانەی پێی خۆشەو ئەوەش لای ناخۆشە ،مادام فەرمانی بە گوناە پێنەكراوە ،ئەگەر فەرمانی بەخراپە پێكرا نابێت گوێڕایەڵ بێت.

(مَن نذر ان يُطيعَ الله فاليُطعهُ وَمَن نذر ان يعصِيَهُ فلا يعصبهِ)(البخاري).

*ابوالدرداو دەفەرموێت:(بە ندە ئەگەر گوێڕایەڵی خوابوو،خوا خۆشی دەوێت،كە خۆشی ویست لەنێو بەندەكانیدا خۆشەویستی دەكات،ئەگەر سەرپێچی خوای كرد خوا لێی تورە دەبێت،ڕقی لێی دەبێت ،پاشان لای خەڵكیش وای لێدێت وخۆشیان ناوێت).

إذا كنتُ أعلَم عِلماً يقيناً بأنَ جميع حياتي كساعة
فلم لا اكونُ ضنيناً بها وَأجعلُها في صلاحٍ وَطاعة

تَعصى الالهَ وَانتَ تُظهِرُ حُبَهُ هذا مُحالٌ في القياس بديع
لوكانَ حُبك صادقاً لأطعتَهُ إنَ المُحِبَ لِمن يُحبُ مُطيعُ.

واتە:سەرپێچی خوا دەكەیت و دەڵێی خۆشم دەوێت،بەڕاستی ئەمە كارێكی ناسەمەو قسەیەكی نوێیە ،ئەگەر خۆشەویستی ڕاست بووایە گوێڕایەڵ دەبوویت،چونكە خۆشەویست گوێڕایەڵی ئەوەیە خۆشی دەوێت.

إذا كنتَ في نِعمة فارعَها وحطها بطاعة رب العبا
فان الذنوب تُزيلُ النعم دفربُ العباد سريع النقم

واتە:ئەگەر بەخششێكت پێدرا چاودێری بكە،چونكە گوناهو تاوان لابەری نیعمەتەكانە بە گوێڕایەڵی خوا ئەو نیعمەتە بپارێزە ،خوای خەڵك لە تۆڵە دا خێرایە وریابە.

# «ئافرەتانی گوێڕایەڵ»

کاتێ ئایەتی قورئان هاتە خوارەوە کە فەرمانی بە ئافرەتانی موسوڵمانو باوەڕدارکرد سەرپۆش بدەن بەسەرو ملیاندا (وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ) النور:۳۱.

ئافرەتانی باوەڕدار زۆر بەخێرایی کەوتنە جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە خواییە و هەریەکێك لەوانە پارچەیەك لە عەباکانیان دڕیو سەر و گەردنی خۆیانیان پێ داپۆشی، ئەمەش بەڵگەی دامەزراندنی باوەڕو تەسلیم بوونیان بوو بەفەرمانی خوا، کاتێك پیاوان ئەو ئایەتانەیان بۆ ژنو کچو خوشکەکانیان دەخوێندەوە، زۆر بەخێرایی و بێ هیچ دوودڵیو گفتوگۆیەك فەرمانەکەیان بەجێهێنا.

خاتوو عائیشە (ﷺ) دەفەرموێت: خوای گەورە بەسۆزو میهرەبان بێت بەرامبەر ئافرەتانی کۆچکردوی یەکەم، کاتێ ئایەتی (وليضربن بخمرهن على جيوبهن) هاتەخوار پارچەیەك لەقوماشێ کەلە ملیان دەئاڵاند دەکردەوە و سەریان پێ دادەپۆشی.

# «گوێڕایەڵی و خێزانداری»

جولەیبیب (ﷺ) پیاوێکی هەژار و نەداربوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای کچی پیاوێکی ئەنصاری بۆ کرد، کابرا دوو دڵ بوو، بە پێغەمبەری وت: بابەدایکی کچەکە بڵێم، کاتێ گەڕایەوە ماڵو باسەکەی بۆ دایکی کچەکە گێڕایەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) داوای کچەکەیانی کردووە بۆ جولەیبیب، هاوسەرەکەی رازی نەبوو، کابراش هەڵسا بۆ ئەوەی بچێت بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بڵێت کەدایکی کچەکە رازی نییە.

لەوکاتەدا کچەکەیان هات بۆلایان، بەباوكو دایکی وت: کێ داوای منی کردووە و هاتۆتە داخوازیم؟

دایکیشی وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای کردووی بۆ جولەیبیب.

کچەکە وتی: جاچۆن فەرمانو داوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرپەرچ دەدەنەوە!!

من رازیمو شوی پێدەکەم، دڵنیام زەرەر ناکەمو فەرامۆشم ناکات.

ئینجا کابرا چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و قسەی کچەکەشی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) کچەکەی لە جولەیبیب مارەکرد، خوای گەورە ئەو ئافرەتەی بەختەوەر و شاد کرد و بەرەکەتی زۆری بەخشی بەو خێزانە، ئەمەش سەرەنجامی گوێڕایەڵی ئەو کچە بوو بۆ فەرمانو داوای پێغەمبەری خوا (ﷺ).

# «ئەنگوستیلەیەكی ئاڵتون»

ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) لەدەستی پیاوێكی موسوڵماندا "ئەنگوستیلە"یەكی ئاڵتونی بینی، دەستی كابرای هێنا و ئەنگوستیلەكەی لەپەنجەی دەرهێنا و فڕێیدا و بەكابرای وت: ئەگەر پارچەیەك پشكۆی ئاگر لەدەستی یەكێكتاندا بوو بالەدەستی فڕێی بدا، كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) كۆڕەكەی بەجێ هێشت، یەكێك لەهاوەڵان بەكابرای وت: كەبچێت ئەنگوستیلە ئاڵتونەكە هەڵبگرێتەوەو سودی لێ وەربگرێ یان بیفرۆشێتو پارەكەی هەڵبگرێت.

بەڵام كابرا ڕازی نەبوو، بەهاوەڵەكەی وت: سوێند بەخوا هەرگیز شتێك هەڵناگرمەوە كەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فڕێی دابێت، لەكاتێكا پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی لەكابرا نەگرتبوو كەسود لە ئەڵقە ئاڵتونەكە وەربگرێتو تەنها ڕێگەی لەدەست كردنی لێگرتبوو، بەڵام هاوەڵەكە لەبەر خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و زیاتر گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری ئەوكارەی كرد، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو كە بەكارهێنانی ئاڵتون بۆ پیا و قەدەغەیە و بۆ ئافرەتان دروستو حەڵاڵە و دەتوانن بەكاری بهێنن بۆ جوانكاریو خۆڕازاندنەوە.

# ﴿گەورەیی لە گوێڕایەڵیدایە﴾

لەوڵاتی شامدا و بەسەرکردایەتی خالید کوری وەلید (ﷺ) سوپای موسوڵمانان لەبەرامبەر سوپای ڕۆمەکاندا دەجەنگان، گەورەی موسوڵمانان (عومەری کوڕی خەتاب) (ﷺ) لەنامەیەکدا کەبە (ئەبو عوبەیدە کوڕی جەراح)دا ناردی پەیامێکی ئاراستەی خالید کرد، لەوپەیامەدا فەرمان بەخالید دەکات کە بەگەشتنی ئەم نامەیە، واز لەسەرکردایەتی سوپاکە دەهێنی و تەسلیمی "ئەبو عوبەیدە"ی دەکەیت.

کاتێ ئەبو عوبەیدە (ﷺ) دەگاتە شام، دەبینێ جەنگ لەگەڵ ڕۆمەکاندا دەستی پێکردووە، چاوەڕێ دەکات تا شەڕەکە کۆتایی دێت و موسوڵمانان سەرکەوتوو دەبن، پاشان نامەکە دەداتە خالیدی کوڕی وەلید.

خالید نامەکە دەخوێنێتەوە، دەستبەجێ مل کەچی فەرمانەکە دەبێت و گوێڕایەڵی خەلیفە بۆ تەنها ساتێك دواناخات، بانگەواز دەکات کە لەم ساتەوە بەفەرمانی گەورەی موسوڵمانان سەرکردایەتی سوپا دراوەتە دەستی "ئەبو عوبەیدە" و "خالید" دەبێتە سەربازێکی ئاسایی لەسوپاکەدا، ئەوەی کەلە سەرکردایەتی سوپا لابراوە نەبووە ڕێگری خالید کە لەجیهاد و تێکۆشانی خۆی بەردەوام بێت.

بەم شێوەیە خالید (ﷺ) بووە نموونەیەکی جوان و بەرجەستە بۆ گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری گەورەی موسوڵمانان.

بەمەش ئاشکرایکرد کارەکانی مەبەست ڕەزامەندی خوایە، جائیتر سەربازێکی ئاسایی بێت، یان سەرکردەیەکی جەنگ هیچ جیاوازییان نییە.

# «فەرمانکردن بە گوێڕایەڵی»

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بەیانی کرد، پاشان ڕویکردە هاوەڵان و وتارێکی بۆدان و ئامۆژگاری کردن، تا ئەوانیش گریان، کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ئامۆژگاری ماڵئاوایی کردن دەچێت؟ داوای چیمان لێدەکەیت؟ ئامۆژگاری چیمان دەکەیت؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: فەرمانتان پێدەکەم بەپارێزگاری و لەخواترسان و بیستن و گوێڕایەڵی "مەبەستی گوێڕایەڵی کاربەدەست و فەرماندار و لێپرسراوی موسوڵمانان بوو" هەرچەندە ئەوکەسە بەندەیەکی حەبەشی بێت، چونکە هەرکەس لەئێوە دوای من بکەوێ، جیاوازی زۆر دەبینێ، داواتان لێدەکەم کەپابەندی ڕێرەو و ڕێبازی من و ڕێبازی خەلیفەکانی ڕاشدین ببن، چونکە ئەوان ڕێنیشاندراون، دەست بەو ڕێگەوە بگرن و بەددانەکانتان توند بیانپارێزن، وە ئاگادارتان دەکەمەوە لە تازە داهێنراوەکان، چونکە شتی تازە بیدعەیە و هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە.

لەم ئامۆژگاریەوە گرنگی فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵیمان بۆ کاربەدەستی موسوڵمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە لە شتانێکدا کە بێ فەرمانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) تیا نەبێت.

هەروەها پێویستە گوێڕایەڵی خوای گەورە بەشوێن کەوتنی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) شوێن کەوتن و خۆ شوبهاندن بەهاوەڵان و کردەوەکانیانەوە بێت (ﷺ).

# ﴿دوو ئەمیری﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەجەنگی "ذات السلاسل"دا عەمری کوڕی عاصی هەڵبژارد بۆ سەرکردایەتی سوپای موسوڵمانان، کاتێ عەمر سوپاکەی گەیاندە ئەو شوێنە، بینی دوژمنان ژمارەیان زۆرە، هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و داوای کۆمەكو یارمەتی لێکرد.

پێغەمبەریش(ﷺ) ژمارەیەك لەکۆچکردوانی سەرەتا "المهاجرین الاولین" بە سەرکردایەتی "ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح" نارد و فەرمانی پێکرد کەلە "عەمر" دوانەکەوێت. کاتێ ئەم یارمەتییە گەشتە سوپاکەی "عەمر" پێی وتن: من لێپرسراوتانم، کۆمەڵی "مهاجرین" وتیان: تۆ تەنها ئەمیری سەرباز و کۆمەڵەکەی خۆتی، "ئەبو عوبەیدەش" ئەمیری ئێمەیە، عەمر وتی: ئێوە یارمەتیەکن کەمن داوام کردووە، لەبەر ئەوە من ئەمیرتانم کاتێ "ئەبو عوبەیدە" زانی "عەمر" لەسەر هەڵوێستی خۆی سوورە، بیری لەفەرمانو ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کردەوە کەفەرمووی: لەئەمر دوامەکەوە. بۆیە ڕوویکردە عەمر و وتی: دەزانی ئەی عەمر کەکۆتا فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ من ئەوەبوو کە فەرمووی: ئەگەر گەشتیتە هاوەڵەکەت یارمەتی بدە، ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی من نەکەیت من گوێڕایەڵی تۆ دەکەم، پاشان ئەبو عوبەیدە ئەمیرییەکەی بەخشی بە"عەمر" لەترسی ئەوەی ئەبادا بێ فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بکات، یان بەهۆی هەڵوێستی ئەوەوە لەنێو سوپای موسوڵماناندا ئاژاوە و دووبەرەکی دروست بێت.

# «یاساکانی گوێڕایەڵی»

موسـولمانان لـەدوای وەفـاتی پێغەمبـەر (ﷺ) ئەبوبـەکریان بەجێنشـین هەڵبژارد، ئەویش هەڵسا و وتاری بۆ موسوڵماناندا، سوپاسی خـوای گـەورەی کـرد و ستایشی بەشێوەیەکی شایستە کرد، پاشان وتـی: لەپاشـان خەڵکینـە، مـن بومـە کاربەدەستی ئێوە، ئەمە مانای وانییە کەمن باشـترین کەسـی نـاو ئێوەبم، ئەگـەر چاکەم کرد، یارمەتیم بـدەن، ئەگـەر خراپـەم کـرد راسـتم بکەنـەوە، راسـتگۆیی‌و راستی مایەی رزگارییە، درۆش خیانەتـە، لاواز لـەنێو ئێوەدا لای مـن بـەهێزە تـا ئەوکاتەی لاوازی نامێنیۆ ستەمی لەسەر هەڵدەگرم "إن شاء الله" بەهێزیشـتان لاوازە لـەلام تـا ئەومافـەی داگیری کـردووە، لێـی دەسـەنمەوە "إن شـاء الله" هـەر گـەلێك واز لـە تێکۆشـان بهێنێـت لـە پێنـاوی خـوادا توشـی رەزیلی‌و ژێردەسـتی دەبـن، هەرگـەلێك بەدڕەوشـتی‌و خراپـە لەناویانـدا پەرەبسـێنێ، خـوای گـەورە هەموویان توشی بەلا دەکات، ئەگەر من گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبـەرم(ﷺ) کـرد ئێـوەش گوێڕایـەڵی مـن بکـەن، هـەرکات بـێ فـەرمانو سەرپێچـی خـوا و پێغەمبەرم(ﷺ) کرد ئەوە ئێوە گۆڕایەڵی من ناکەن.

بـەم شـێوە پێشـەوا "ئەبوبـەکر" (ﷺ) یاسـا و بنـەماکانی گوێڕایـەڵی بـۆ کاربەدەستی موسوڵمان رۆشنکردەوە کە دەبێت لە چوارچێوەی گوێڕایەڵی خـوا و پێغەمبەر (ﷺ) دەرنەچێت.

# ﴿ئەمیرەکە و ئاگرەکە﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەلقەمەی کوڕی میحرزی بەسەرکردایەتی سریەیەك نارد بۆسەر رێگەیەك "عەلقەمەش" کۆمەڵێکی بەسەرکردایەتی "عەبدولاّ کوڕی حوزافە" نارد بۆ لایەکی تر، (عەبدولاّ) پیاوێکی قسەخۆش‌و گاڵتەچی بوو حەزی بەگاڵتە و سوعبەت دەکرد.

لەڕێگەدا عەبدولاّ و سەربازەکانی وەستان‌و دابەزین بۆ حەوانەوە، ئاگرێکیان کردەوە، ئەوەش فرسەتێك بوو بۆ "عەبدولاّ" کەهەندێ قسەی خۆش‌و گاڵتە بکات، رویکردە ئەوانەی لەگەڵیدا بوون وتی: ئایا پێویست نییە لەسەر ئێوە گوێڕایەڵی من بکەن؟ وتیان: بەڵێ.

عەبدولاّ هەموویانی سەرسام کرد کاتێ فەرمانی پێکردن کە خۆیان بخەنە ناو ئەو ئاگرەوە و گوێڕایەڵی سەرکردەکەیان بکەن! هەندێك خەریك بوو، فەرمانەکە جێبەجێ بکەن، بۆیە وتی: گاڵتەم لەگەڵ کردن ویستم پێبکەنین، کاتێ جەنگاوەرەکان گەڕانەوە، رووداوەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی هەرکەس فەرمانی پێکردن بەشتێك کە گوناهو بێفەرمانی خوای تێدابوو گوێڕایەڵی مەکەن.

# «منداڵی سەرکەش»

نوح پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی یەکتا پەرستی بەگەلەکەی گەیاندو ماوەیەکی زۆر لەگەڵیان خەریك بوو، تەنها ژمارەیەکی زۆرکەم نەبێت باوەڕیان پێنەهێنا، ئەوانی تر لەسەر تاوان و بێ باوەڕییان بەردەوام بوون، سەرەنجام و دوای نائومێد بوون لەگەلەکەی، "نوح" داوای لەخوای گەورە کرد تا بێ باوەڕان لەناوببات" خوای گەورەش فەرمانی پێکرد کەشتییەك دروست بکات، دوای تەواو بوونی لە دروستکردنی کەشتییەکە خوا فەرمانی پێکرد کەخۆیی و دەستە موسوڵمانەکە، بچنە ناو کەشتییەکە و لەهەر گیاندارێك، نێرو مێیەك لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن.

ئەوەی خوا فەرمانی پێکرد "نوح" جێبەجێی کرد ئینجا لەئاسمانەوە لێزمە باران دەستی پێکرد، زەویش تەقی و ئاوی لێ دەرهات، لافاوی ئاو سات بۆسات لەزیاد بووندابوو، دنیا لەساتێکی تورە و سامناکدا بوو، هێندەی نەبرد، ئاو گەشتە سەرئەو شاخەی "کەشتی نوح"ی لەسەر بوو، ئاو هات و کەشتی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و خستییە ناو شەپۆلی ئاوەکەوە !!

"نوح" "سەلامی خوای لێبێت" کوڕێکی بێ باوەڕی هەبوو، هاواری لێکرد "کوڕم وەرە لەگەڵ ئێمەدا سەربکەوە و لەگەڵ بێ باوەڕان مەبە" (يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلاَ تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ) هود ٤٢.

بەڵام کوڕی گوناهبار و سەرکەش لەسەر بێ باوەڕی خۆی بەردەوام بوو، بەگوێی باوکی نەکرد و پێی وت: "دەچمە سەر ئەو شاخە بەرزە و لەلافاوەکە دەمپارێزێ" باوکی وتی: ئەمڕۆ هیچ شتێك دەرناچێت، مەگەر خوا ڕەحمی پێبکات.. ئیتر زۆری نەخایاند ئاوەکە گەشتە لای کوڕەکەی نوح و شەپۆلی ئاوەکە ڤوتیدا و ونبوو ئەویش لەگەڵ بێ باوەڕاندا لەئاوەکەدا تیاچوو.

# «كڕنوشی فریشتەكان»

خوای گەورە ئادەمی دروستكرد و فەرمانی بەفریشتەكان كرد سوجدەی بۆ ببەن، فریشتەكان فەرمانەكەیان جێبەجێ كردو هەموویان سوجدەیان برد، جگە لە"ئیبلیس" كە فەرمانی خوای شكاند و ئامادە نەبوو سوجدە بۆ ئادەم ببات، خوای گەورەش "ئیبلیس"ی لە رەحمی خۆی دەركرد و نەفرەتی لێكرد، لەسزای سەركەشییەكەیدا بەرامبەر خوا.

ئینجا خوای گەورە ئادەمو خێزانەكەی "سەلامی خوایان لێ بێت" لەبەهەشتدا نیشتەجێ كرد و فەرمانی پێكردن كەلە فلان درەخت نەخۆن، ئیبلیس كە ئەمەی بیست ویستی لە بەهەشت دەریان بكات، بۆیە چووە دەرونی ئادەمو هاوسەرەكەیی و وەسوەسەی خواردنی درەختەكەی بۆ دروست كردن، وەخۆی وا نیشاندا كە ئەو خەمخۆر و دڵسۆزی ئەوانە و بۆ بەرژەوەندی ئەوان قسە دەكات، بەم شێوەیە توانی ئادەم واڵێبكات سەرپێچی فەرمانی خوا بكاتو لەدرەختەكە بخوات، بەهۆی ئەو كارەشیانەوە "ئادەمو حەووای هاوسەری" لەبەهەشت دەركرانو لەسەر زەوی نیشتەجێ كران.

# «گوێڕایەڵییەکی بێ هاوتا»

کاتێ ئایەتی حەرام کردنی "مەی" هاتە خوارەوە و فەرمووی: (یاایها الذین آمنوا إنما الخمر والمیسر الانصاب والازلام رجس من عمل الشیطان فاجتنبوه لعلکم تفعلون)

بانگەوازێك هاتە بازاڕی مەدینە و کۆڵانەکانو هاواری دەکرد: ئەی موسوڵمانان ئاگاداربن عارەقو مەی حەرام کراوە.

لەوکاتەدا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) لەماڵی "ئەبی تەلحە"دا مەی بۆ کۆمەڵێك دەگێڕا، ئەبو تەلحە وتی: بچۆ بزانە ئەو دەنگە چییە؟ ئەنەس چووە دەر کابرای بینی کە دەیوت: ئاگاداربن "مەی "حەرام کراوە.

ئەنەس چووە ژوور و هەواڵەکەی گەیاند بەمەجلیسەکە ئەبو تەلحە عارەقەکەی دەستی لابرد و بەئەنەسی وت: هەرچی "مەی" لەماڵەکەدا هەیە بیڕێژێ، ئەویش هەمووی رشت، بەم شێوە هەرچی "مەی" پێبوو رشتیان، تاوای لێهات کۆڵانو گەڕەکەکانی مەدینە عارەقی زۆری تیاڕژا و رێگەکان پڕ لە "مەی" بوون. موسوڵمانان بەم شێوە بێهاوتایە گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورەیان کرد.

# «هاوەڵی گوێڕایەڵ»

رۆژێك "عەبدولا کوڕی رەواحە" (ﷺ) بەرەو مزگەوتی پێغەمبەر رۆیشت، کاتێ لەمزگەوت نزیك بۆوە گوێی لێبوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری دەدا بۆ موسوڵمانانو دەیفەرموو: "دانیشن".

عەبدولا هەرلەگەڵ ئەو فەرمانەی بیست لەجێگەی خۆی دانیشت هەرچەندە هێشتا نەگەشتبووە ناو مزگەوت، بەوشێوە مایەوە هەتا پێغەمبەر (ﷺ) لە وتارەکەی تەواو بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیە ئەو قسەی فەرموو، چونکە هەندێ لە موسوڵمانان لەکاتی وتاردا بەپێوە وەستابوون.پاش تەواو بوونی وتارەکە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە "ئیبن رواحە" لە دەرەوەی مزگەوت هەرکە گوێی لەتۆ بوو فەرمووت: دانیشن، لەجێگەی خۆی دانیشت پێغەمبەریش (ﷺ) بە عەبدولای فەرموو: "زادك الله حرصاً علی گواعیە الله، وگواعیە رسوله" واتە خوای گەورە سوربونت لەسەر فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) زیاد بکات.

# ﴿لە ساتی ئابڵوقەدا﴾

لەمیانەی ئابڵوقەدانی "ئەحزاب" بۆ شاری مەدینە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی بەهاوەڵان کرد کە یەکێکیان بچێت بۆ ناو بێباوەڕان تا هەواڵیان بزانێ فەرمووی: هەرپیاوێك بچێت بۆ ناو بێباوەڕان‌و بزانێ خەریکی چین، پاشان بگەڕێتەوە، داواکارم لە خوای گەورە ئەوکەسە هاوەڵم بێت لەبەهەشتدا، کەس لە هاوەڵان هەڵنەستا!! ئینجا حوزەیفەی کوڕی یەمانی بانگکرد و پێی فەرموو: ئەی حوزەیفە بڕۆ بۆ ناویان، بزانە خەریکی چین، بەڵام هیچ نەکەیت تا دەگەڕێیتەوە بۆ لامان.

حوزەیفە (رضي الله عنه) فەرمانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بەجێهێنا و بەنهێنی ڕۆشت بۆ ناو سەربازگەی بێباوەڕان‌و هەواڵ‌و دەنگ‌و باسی پێویستی کۆکردەوە، کاتێ ویستی بگەڕێتەوە ئەبو سوفیانی سەرکردەی موشریکەکانی بینی کە بەتەنها دانیشتبوو، ویستی تیرێکی لێبدات‌و بیکوژێت، بەڵام بیری فەرمانەکەی پێغەمبەری(ﷺ) کردەوە کە فەرمووی: هیچ شتێ مەکە تا دەگەڕێیتەوە بۆلامان.

ئیتر وازی لەو خەیاڵە هێنا و لەبەر فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ هیچ کارێك گەڕایەوە.

# «گوێڕایەڵی و قوربانی»

شەوێك ئیبراهیم پێغەمبەر "سەلامی خوای لێبێت" لەخەویدا فەرمانی پێکرا ئیسماعیلی کوڕی سەربڕێت، چەندجار ئەم خەوە دووبارە بۆوە، ئیبراهیم دڵنیا بوو کە ئەو خەوە نیگای خوایە و دەبێت ئەنجامی بداتو خوای گەورە تاقیدەکاتەوە، بۆ بەیانی بانگی ئیسماعیلی کوڕی کرد و وتی: [ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ] الصافات ١٠٢

کوڕم لەخەومدا فەرمانم پێکراوە تۆ سەربڕم، (تەنها خەوی پێغەمبەران وەحییە و پێویستە جێبەجێی بکەن).

کوڕی باوەڕدار بۆ ساتێکیش ڕاڕا نەبوو، بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا "ملی لەموو باریکتر بوو" وتی: [يأبت أفعل ماتؤمر ستجدني إن شاء الله من الصابرين] ئیبراهیمو ئیسماعیل "سەلامی خوایان لێبێت" فەرمانی خوایان جێبەجێ کرد و چەقۆی هێنا و ئامادەی سەربڕینی کوڕەکەی بوو، بەڵام لەئاسمانەوە دەنگێك هاتو فەرمووی: [يا أبراهيم قد صدقت الرؤيا إنا كذلك نجزي المحسنين]

ئەی ئیبراهیم بەڕاستی فەرمانەکەت جێبەجێ کرد و ئێمەش بەوشێوە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، ئینجا لەئاسمانەوە بەرانێك دابەزی خوا فەرمانی کرد بە ئیبراهیم ئەو "بەرانە" بکاتە قوربانی لەجیاتی "ئیسماعیل"ی کوڕی ئەمەش سەرەنجامی گوێڕایەڵیو وەڵامگۆی بانگەوازی خوایی بوو.

## «گوێڕایەڵینەکردن و شکست»

لەغەزای ئوحود، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپای موسوڵمانانی دابەشکردو فەرمانی بە کۆمەڵێك لە تیرهاوێژەکان کرد بچنە سەرشاخی ئوحود و پشتەوەی موسوڵمانان بپارێزن نەبادا زەفەریان پێ ببەن فەرمووی: هەرچی رووبدات، ئێوە شوێنی خۆتان چۆڵ ناکەن.

شەڕ دەستی پێکرد و گەرم بوو، سەرەتا موسوڵمانان سەرکەوتن‌و دوژمنانیان راونا، کاتێ تیر هاوێژەکان بینیان وا بێ باوەڕان هەڵهاتون گومانیان برد کە شەڕەکە کۆتایی هاتووە، ویستیان بڕۆنە خوارەوە، بەڵام سەرکردەکەیان بیری خستنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردون شاخەکە چۆڵ نەکەن !

قسەکەیان نەبیست‌و گوێڕایەڵ نەبوون، وتیان: ئێمەش دەچین وەك براکانمان داهاتی جەنگ کۆدەکەینەوە.. سوارەکانی قورەیش بینیان وا تیرهاوێژەکانی موسوڵمانان لەسەر شاخی ئوحود هاتنە خوار، لە پشتەوەی شاخەکە هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان‌و زیانێکی زۆریان لێدان سوپای موسوڵمانان شپرزە بوون‌و تێکشکان، بەم شێوەیە گوێڕایەڵی نەکردنی تیروهاوێژەکان بۆ فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هۆکاری شکستی موسوڵمانان بوو.

## لەكۆتاییدا...

گوێڕایەڵی ڕەوشتێكی مەزنە. خوا فەرمانی پێكردووە و دەفەرموێ [یاایها الذین امنوا اطیعوا الله واطیعواالرسول واولی الامر منكم] پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿علی المسلم السمح والطاعة فیما احب وكرة، إلا أن یؤمر بمعصیة، فلاسمع ولاطاعة﴾ واتە: لەسەر موسوڵمان گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) و كاربەدەس و ئەمیری موسوڵمان پێویستە لەشتانێك پێی خۆشە یان پێی ناخۆشە، مەگەر فەرمان بە گوناهو خراپە بكرێت، ئەوكاتە گوێڕایەڵی ناكات.

گوێڕایەڵی خوا واتە كاركردن بەقورئان و پەیامەكەی، گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شوێن كەوتنی ئەوشتانەیە كە ئەو لەلایەن پەروەردگارەوە هێناویێتی، گوێڕایەڵی ئەمیر و كاربەدەست لەشتانی چاكەدا دەبێت، خوای گەورە پاداشتی گەورەی بۆ گوێڕایەڵەكان بڕیار داوە ﴿ومن یطع الله والرسول فأولئك مع الذین أنعم الله علیهم من النبیین والصدیقین والشهداء والصالحین وحسن أولئك رفیقاً﴾ ئەم چیرۆكانەش كە خوێندمانەوە، كۆمەڵێك نموونەی بەرز و جوانن بۆ بەرجەستە كردنی ئەم ڕەوشتە فێرمان دەكات و پەند و ئامۆژگاری لێوەردەگرین.

# کۆمەڵە چیرۆکێک لەبارەی لێبوردن

**ئامادەکردنی**

شعبان مصطفی قزامل

**وەرگێڕانی**

*محمد حامد بانیشاری*

# ﴿لێبوردن (العفو)﴾

العفو: وازهێنان و سڕینەوەی شتێك، لێبوردن و سزانەدانی کەسێك کە هەقی سزادانی هەیە.

العفو: ناوی پیرۆزی خوایە چونکە خوای گەورە گوناهەکان دەسڕێتەوە ،واز لەبەندەکەی دەهێنێ ولەسەر گوناهو تاوانەکان سزای نادات ئەگەر تەوبە بکات و پەشیمان بێتەوە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ (النساء: ٤٣ ).

﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾(المجادلة: ٢ ).

*لێبوردن سیفاتی موسوڵمانی ڕاست ولەخوا ترسانە ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾(ال عمران: ١٣٤ ).

*خوای گەورە داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکات لێبوردە بێت بەرامبەر هاوەڵان و ئومەتەکەی .﴿ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾(ال عمران: ١٥٩ ).

*خوای گەورە داوا لە بڕوادار دەکات ڕەوشتی لێبوردنیان هەبێت بەرامبەر بەکەسانێك بەخراپ باسیان دەکەن وخراپەیان لەگەڵ دەکەن﴿وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(النور: ٢٢ ).

*مرۆڤ دەتوانێ سزای کەسێك بدات کەخراپەی لەگەڵ کردووە، بەڵام لێبوردن و چاکخوازی لای خوا گەورەترە:

﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾(الشورى: ٤٠ ).

*عبدالله کوڕی عومەر دەفەرموێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی ،چەند جار لەخزمەتکارەکانمان ببورین کەهەڵە دەکەن ؟پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو!کابرا قسەکەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو،جاری سێ یەم قسەکەی کردەوە، فەرموی:لەهەموو ڕۆژێکدا(٧٠ )جار لێ ی ببورە.(ابوداود والترمذي (اسناده حسن).

*پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:(خوای گەورە لەهەموو کەسێکی ئوممەتەکەم دەبورێت جگەلە (المجاهرين)ئەومیە کەبەندمیەك شەو کارێك دەکات ،بەیانی خوای گەورە دای دەپۆشێت و ئاشکرای ناکات ،کەچی ئەو دەچێت باسی گوناهەکەی دەکات و دەڵێت:واو وام کردووە! یان بە ڕۆژ کارێك دەکات خوای گەورە ئاشکرای ناکات کەچی خۆی شانازی پێوە دەکات و لە ناو خەڵك دا باسی گوناهەکەی دەکات)البخاری ومسلم.

*پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:(مانقصت صدقةٌ من مالٍ ومازاد اللهُ عبداً بعفوٍ إلا عزاً وما تواضع أحدٌ الله إلا رفعهُ الله)مسلم.

*ابوبکر رضي الله عنه دەفەرموێت: (بلَغنا أن الله تعالى يأمر منادياً يومَ القيامة فيُنادي:مَن كانَ لهُ عند اللهِ شيءٌ فليقم ،فيقوم أهل العفو،فيُكافئُهُم الله بما كانَ من عفوهم عن الناس)الاحياء.

*ليسَ الحيلم مَن ظلم فَحَلم ،حتى إذا قَدر أنتقم، ولكن الحلم مَن ظلَم فحَلم حتى إذا قدر عفا)الاحياء.

واتە:لێبوردە کەسێك نیە کەستەمی لێدەکرێت ،ئەو ئارام دەبێت تا دەسەڵاتی دەبێت ،ئینجا تۆڵە دەسێنێ ،بەڵکو نەرم و نیان کەسێکە کە دەسەڵاتی بوو دەبورێ لە خەڵك.

(فالعفو عن جاهلٍ أو أحمقٍ أدب     نعم وفيه لِصَونَ العرضِ إصلاح)شافعی.

# ﴿لێبوردنی باشترین مرۆڤ﴾

لەجەنگی "ذات الرقاع"دا موسوڵمانان هاتن بۆلای درەختێكی گەورە، پاشان وازیان لێهێنا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا لە سێبەرەكەیدا ئیسراحەت بكات، پێغەمبەر(ﷺ) شمشێرەكەی هەڵواسی بەدارەكەوە، لەژێر دارەكەدا خەوت.

لەم كاتەدا پیاوێك لە بێباوەڕان هاتو شمشێرەكەی گرت بەدەستەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) بەخەبەر هاتەوە، كابرای بێباوەڕ شمشێرەكەی بەرەو رووی پێغەمبەر (ﷺ) بەرز كردەوە، وتی: دەترسی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخێر .. پیاوەكە وتی: دەی كێ دەتوانێت من قەدەغە بكات لە كوشتنی تۆ؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "الله".

ئیتر شمشێرەكە لەدەستی كابرا كەوتە خوارەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هەڵیگرتەوە، ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەی كێ دەتوانێ من قەدەغە بكات لەتۆ؟

پیاوەكە وتی تۆ باشترین كەسێكی كە شمشێرت بەدەستەوە بێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بڵێ: "أشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمداً رسول الله" پیاوەكە وتی نایڵێم، بەڵام پەیمانت دەدەمێ كە شەڕت لەگەڵ نەكەم وە لەگەڵ هیچ كۆمەڵێكیشدا نەبم كەشەڕ لەگەڵ تۆدا بكەن، پێغەمبەر (ﷺ) لێی خۆش بوو.

ئەنجا كابرا رۆشتەوە بۆلای قەومەكەی، وتی پێیان لەلایەن باشترین پیاوەوە هاتووم بۆلاتان.

پێغەمبەر (ﷺ) لەهەموو كەس زیاتر پێی خۆش بووە كە لێبوردن بكات لەكاتی تواناد‌ا.. لەهەموو كەس زیاتر سور بووە لەسەر چاكەكردن بەرامبەر بەوكەسەی كە خراپەی لەگەڵ كردووە.

خوا دەفەرموێت بە پێغەمبەر (ﷺ) "خذ العفو وأمر بالعرف وأعرض عن الجاهلين".

## ﴿لێبوردنی پێغەمبەر (ﷺ)﴾

باسکراوە کابرایەکی دەشتەکی هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) داوای چاکەی لێکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوەی لەتوانایدا بوو پێی بەخشی، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : چاکەم لەگەڵ کردی؟! کابرا وتی: نەخێر .. هاوەڵان تووڕە بوون هەستان بۆلای کابرا تۆڵەی ئەو ئەزیەتەی لێ بستێنن.

پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆکردن کەوازی لێ بهێنن.. ئەنجا پیاوەکەی بردەوە بۆماڵەوە.

زیاد لەوەی پێدا کە پێی دابوو، ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: چاکەم لەگەڵ کردی؟ کابرا وتی: بەڵێ.. پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: تۆ پێش ئێستا وتت (نا) لەدڵی هاوەڵانمدا شتێ دروست بووە بەرامبەر بەتۆ، ئەگەر پێتخۆشە وەرە لەبەردەمی ئەواندا ئەم قسەیەی ئێستا بکە.

پیاوەکە وتی: باشە. بەیانی پیاوە هاتە مەجلیسی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم پیاوە دوێنێ قسەیەکی کرد کە چاکەکەمان بۆ زیاد کرد وتی: رازیم روویکردە کابرا فەرمووی: وایە؟

پیاوەکە وتی: بەڵێ وایە.. جزاك الله خیراً خوا پاداشتی چاکەتان بداتەوە.

ئەنجا پیاوەکە بەدڵی خۆشەوە ڕۆیشت.

## «پاداشتیان لەسەر خودایە»

ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: هەرکات بەندەکان راوەستان بۆ لێپرسینەوە، کۆمەڵێك دێن شمشێرەکانیان لەسەر گەردنی خۆیان داناوە و خوێنی لێ دەتکێ.

قەرەباڵغیتان لەسەر دەرگای بەهەشت دروست کردووە.

پرسیار کەرێك دەپرسێ؟ ئەمانە کێن؟ لەوەڵامیاندا دەوترێت ئەمانە دەستەی شەهیدەکانن، کەلەنا و گۆڕدا زیندوو بوون رزقیان هەبووە.

ئەنجا بانگ کەرێك بانگ دەکات: با ئەوەی پاداشتی لای خوایە هەستێ بڕوا بۆ بەهەشت.

پرسیار کەرێك دەپرسێت؟ ئەوانە کێن پاداشتیان لای خوایە؟

لەوەڵاما پێیان دەوترێت: ئەوانەی لێبوردە بوون لەخەڵکی ئەنجا جاری سێهەم بانگ کردنەکە سێ بارە دەکرێتەوە، دەڵێت کێ پاداشتی لەسەرخودا خۆیەتی باهەستێ بڕواتە بەهەشت.. بەم شێوەیە هەزار نەفەر هەڵدەستێ دەڕۆنە بەهەشت بەبێ موحاسەبە.

# «کۆشکە ئاڵتونییەکان»

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوو لەگەڵ هاوەڵەکانی پێکەنی، عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) پرسیاری لە پێغەمبەر کرد؟ (ﷺ) دەربارەی ئەم پێکەنینە فەرمووی: دووپیاو لەئومەتی من لەسەر ئەژنۆیان دانیشتبوون، لەبەردەم پەروەردگارا..

یەکێکیان وتی: ئەی خوایە حەقی ستەملێکراویم بسێنە لەم برامە..

خوا فەرمووی: چی ئەکەی لەبراکەت هیچ چاکەی نەماوە.

فەرمووی: ئەی خوایە، با لەتاوانەکانم هەڵبگرێ.

خوا پێی فەرموو: چاو هەڵبڕە و سەیرکە، ئەویش وایکرد و وتی: ئەی خوایە شارێ دەبینم لە ئاڵتون، وە چەندەها کۆشکی ئاڵتونی دەبینم دەورە دراون بە گەوهەر، ئەمانە بۆ کام پێغەمبەرە(ﷺ) یان بۆ کام ڕاستگۆیە، یان بۆ کام شەهیدە؟!

وتی: ئەی پەروەردگارا کێ دەبێت بەخاونی ئەمانە، خوا فەرمووی تۆ دەبیت بەخاوەنیان، وتی بەهۆی چییەوە؟ فەرمووی: بەهۆی لێبوردنت لەوبرایەت. کابرا وتی ئەی خوایە: ئەوا لێی خۆش بووم، خوا فەرمووی: دەی دەستی براکەت بگرە و بڕۆرە بەهەشت.

# ﴿لێبوردنی گشتی﴾

بێباوەڕان لـە مەککـەدا ئەزیـەتی پێغەمبـەرو(ﷺ) هاوەڵانیـان زۆر دەدا. وەکو چۆن لە مەککە دژایەتی پێغەمبەریان(ﷺ) دەکرد دوای ئـەوەش کەکۆچی کرد بۆ مەدینە بەردەوام بوون.

لەگەڵ ئەمانەشدا لەسیرەدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دوای فەتحی مەککـە تـەوافی کەعبـەی کـرد کاتێـک تـەواوبوو فـەرمووی: ئـەی کۆمـەڵی قـورەیش، بۆچوونتان چۆنە کەمن چیتان لەگەڵ بکەم؟!

لەوکاتەدا بەتەمای لێبورنی پێغەمبەر(ﷺ) بوون دانیشتوانی مەککە وتیـان: چاکە لەتۆ چاوەڕێین.

برایەکی بەڕێزی   کوڕی برایەکی بەڕێزی

ئـەنجا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: مـن وتەکـەی یوسـف پێغەمبـەرتان پـێ دەڵێم، کەوتی بەبرایەکی: (لاَ تَثْرَيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ) یوسف: ٩٢.

واتە: یوسف وتی: حـەقتان نـەبێ ئـەمڕۆ نـیتر هـیچ سەرزەنشتێکتان لەسـەر نییـە. خـوا لێتـان خـۆش بێـت، بێگومـان ئـەو زاتـە لەهـەموو میهرەبانـان میهرەبانترە.

پێغەمبـەر(ﷺ) لێیـان خـۆش بـوو خـەڵکی ئـازاد بـوون بـەدڵ خـۆش بـوون بەلێبوردنی پێغەمبەر (ﷺ) لێیان.

# ﴿هەرچاوەڕێی لێبوردن لە پێغەمبەر دەکرێت﴾

کەعب کوڕی زوهەیر و براکەی کەناوی بوجەیر بوو بانگەوازە تازەکەی پێغەمبەریان(ﷺ) بیست.

بوجەیر وتی بەکەعبی برای، چاوەڕوان بە تا دەڕۆمو گوێ دەگرم بزانم محمد(ﷺ) چی دەڵێ، کاتێ رۆشت بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)و گوێی لەفەرموودەکانی گرت، خوا رێنمایی کرد بۆ قبولکردنی ئاینی ئیسلامو موسولمان بوو، کاتێك کەعب زانی بوجەیری برای موسولمان بووە، تورە بوو دەستی کرد بەوتنی شیعر کە قسە وتنی بە پێغەمبەر(ﷺ) لەخۆ گرتبوو.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) پێی زانی بڕیاری کوشتنی کەعبی رەوادا بوجەیر کە موسولمان بوو کەعبی برای ئاگادار کردو و ئامۆژگاری کرد کەبڕوا داوای لێبوردن لە پێغەمبەر(ﷺ) بکاتو موسولمان ببێت.

بەلام کەعب بە پێچەوانەوە نەڕۆشتو رەفزی کرد، هەلاتو خۆی شاردەوە، رۆژان تێپەڕی خوا دلی کەعبی والاکرد بەرەو ئیسلام، هاتەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) پەیمانی دایە و داوای لێبوردنی کرد و ستایشی پێغەمبەری(ﷺ) کرد لە هۆنراوەیەکدا... ئەمە کۆپلەیەکێتی ..

واتاکەی: هەوالم پێدرا کە پێغەمبەر (ﷺ) هەڕەشەی لێکردووم، بەلام لێبوردن لە پێغەمبەر(ﷺ) چاوەڕێ دەکرێ.

مۆلەت وەرگری رێنماییت بکات ئەو کەسەی کە سوننەتی پێیە کە ئامۆژگاریو روونکردنەوەی تیایە.

پێغەمبەر (ﷺ) نورێکە رۆشنایی پێ وەردەگیرێ جۆرە شمشێرێکی چاکە لە شمشێرەکانی خودا و ئامادەیە لە کێلان دەرهێنراوە.

کەکەعب تەواو بوو لەهۆنراوەکەی پێغەمبەر (ﷺ) عەباکەی خۆی پێدا و لێی بورا.

## ﴿لێبوردنی یوسف پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت)﴾

یەعقوب "سەلامی خوای لێبێت" یوسفی کوڕی زۆر خۆش دەویست زیاتر لەبراکانی تری، ئیتر براکانی توشی ئێرەیی بوون لەسەر ئەو خۆشەویستە زیادەیە، غیرەت گرتنی بەرامبەر یوسف "سەلامی خوای لێبێت". بڕیاریاندا خۆیان رزگار بکەن لەیوسف، داوای مۆڵەتیان کرد لەباوکیان کە یوسف ببەن لەگەڵ خۆیان بۆ دەشت تا یارییان لەگەڵ بکات... لەوێ خستیانە ناو بیرێکەوە.

ئەنجا گەڕانەوە بۆلای باوکیان ئێوارە و دەستیان کرد بەگریان وەبە باوکیان وت کە یوسف گورگ خواردوویەتی.

ئیتر یەعقوب (باوکی یوسف) زۆر بێتاقەت بوو خەفەت باربوو زۆر.

ڕۆژێك کاروانییەك بەلای بیرەکەدا تێپەڕی یوسفیان دەست کەوت، لەبیرەکە دەریان هێنا و لەگەڵ خۆیان بردیان وەفرۆشتیان بە گەورەی مصر یوسف لەماڵی گەورەی میصردا گۆشکرا و گەورەبوو..

لەبەر رەوشت جوانی وەلەبەر زانیاری فراوانی بووبە وەزیر لە مصر .. لەکاتی بەڕێوەبردنی ئیشی وەزارەتەکەیدا براکانی هاتن بۆلای بۆ ئەوەی هەندێ خۆراك ببەنەوە. بۆ خۆیانو ماڵو منداڵیان.. کاتێ ڕۆشتنە رووی یوسف ناسینییەوە، بەلاَم ئەمان ئەویان نەناسییەوە، چەند جار هاتنو چوون، کات گونجاو بوو یوسف تۆڵەیان لێ بسێنێتەوە، بەلاَم یوسف لێیان خۆش بوو.

وەپێی وتن: (لاَ تَثْرَيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ) یوسف:۹۲.

واتە: یوسف وتی: خەمتان نەبێت ئەمڕۆ ئیتر هیچ سەرزەنشتێکتان لەسەر نییە خوالێتان خۆش بێت، بێگومان ئەوزاتە لەهەوو میهرەبان میهرەبان ترە.

# «لێبوردن و چاكەكردن»

دەگێڕنــەوە لەعــەلی كــوڕی حســین (ﷺ) كــە منــداڵێك ئــاوی دەكــرد بەدەســتیا بەمەسینەیەك كەلە سواڵەتە (قوڕی سورەوەكراو) دروست كرابوو.

مەسینەكە كەوتــە خــوارەوە و شكا، دای بەقاچی "عــەلی"دا توڕەبــوو دەمو چاوی گۆڕا. منداڵەكە خزمــەتكاربوو وتــی: گــەورەم خــوا دەفــەرموێت: "والكاظمين الغيظ" واتە: ئەوانەی رق دەخۆنەوە.

علی وتی: رقەكەم خواردەوە.

منداڵەكە وتی: والعافين عن الناس. (واتە: ئەوانەی لەخەڵكی دەبوورن.)

علی وتی: ئەوا لێت بورام

منداڵەكە وتی: "والله يحب المحسنين" (واتە: خوا چاكەكارانی خۆش دەوێت.)

علی وتی: كەواتە تۆ ئازادبە لەبەرخوا.

# «لێبوردنی نەوەیەكی پێغەمبەر (ﷺ)»

دەگێڕنەوە عەلی كوڕی حسین (ﷺ) كەبە "زیــن العابــدین" ناســراوە دەڕۆشــت بــۆ مزگەوت كۆمەڵێ گەنجی لەگەڵدابوو.

پیاوێــك بــەرە و ڕووی "عــەلی" هــاتو دەســتی كــرد بــەجنێو و قســەی ناشــیرین بەرامبەر بە عەلی گەنجەكان ڕۆشتن بۆلای پیاوەكە و لێی بدەن، بەڵام عەلی نەیهێشت ئەزیەتی بدەن.

ئەنجا عەلی سەیری پیاوەكەی كرد و وتی: من زیاترم لەوەی تۆ پێم دەڵێی، ئەوەی كە نایزانیت دەربارەی من زیاترە لەوەی دەیزانیت!!

ئەگەر پێویستیت بەم زانیاریە هەیە دەربارەی خۆم باپێت بڵێم.

پیاوەكــە شــەرمی كــرد لــە "زیــن العابــدین" پاشــان كراســەكەی داكەنــد و دای بەپیاوەكە، وەفەرمانی كرد هەزار درهەمی بدرێتێ.

پیاوەكە ڕۆشتو دەیوت: شایەتی دەدەم كەئەم گەنجە نەوەی پێغەمبەرە (ﷺ).

## «لێبوردنی ڕاستەقینە»

دەگێڕنەوە یەکێك لەکاربەدەستان دەستی گرت بەسەر هەندێ دیلدا، کاتێك سەرکردەکە ویستی بیان کوژێ، یەکێ لە دیلەکان لەم کاتەدا سەیری سەرکردەکەی کرد و داوای کرد پێش ئەوە بیان کوژێ خواردنو خواردنەوەیان بداتێ، ئەویش فەرمانیکرد خواردنو خواردنەوەیان بۆ هێنان.

ئەوانیش خواردیان خواردیانەوە تێر بوون.

پاشان یەکێك لە دیلەکان وتی ئەی گەورەم خوا تەمەن درێژت بکات... ئێمە ئێستا کە دیلی تۆ بووین وەئێستا بوین بەمیوانت، سەیرکە تۆ چی دەکەیت بە میوانەکان لەم کاتەدا؟ کابرا بەدیلەکانی وت: دڵنیابن ئەوا لێتان خۆش بووم و ڕێزم لە میوانەکان گرت.

## «لێبوردنی پێشەوای موسوڵمانان»

عەیینەی کوڕی حیصن (ﷺ) هات بۆ مەدینەو لای برازاکەی کەناوی حوڕی کوڕی قەیسە (ﷺ) وەستا، ئەم برازایە یەکێك بوو لەکەسە زۆر نزیکەکانی پێشەوای موسوڵمانان عومەری کوڕی خەتاب "خوا لێی ڕازی بێت" کەزۆریش زانا و شارەزا بوو لە قورئان.

عەیینە وتی: بەحوڕ ئەی برازام ڕوخسەتم بۆ بخوازە.

بابڕۆم بۆلای پێشەوای موسوڵمانان ئەویش ڕوخسەتی بۆ خواستو عومەریش (ﷺ) ڕوخسەتی دا.

پاشان کاتێك کەلەبەردەم عومەردا وەستا و وتی: ها یاعومەر سوێند بێت بەخوا ماڵی زۆرمان نادەیتێ لەبەینماندا دادپەروەر نیت.

عومەر (ﷺ) توڕە بوو.. تا کار گەشتە ئەوەی لێی بدات.

بەڵام حوڕی کوڕی قەیس وتی:ئەی پێشەوای موسوڵمانان خوا دەفەرموێت: [خذ العفو وامر بالعرف واعرض عن الجاهلين] ئەم کابراش نەزانە.

کاتێك عەمر (ﷺ) ئەم ئایەتەی بیست لە عینیە و قسەکانی بورا.

# ﴿دووبەرەکی و پاشان لێبوردن﴾

عەبدولای کوڕی زوبێر (ﷺ) لە خانوویەکدا دادەنیشت کەهی پووری بوو واتە خوشکی دایکی کەناوی عائیشە بوو حەرەمی پێغەمبەر (ﷺ) عائیشە خانووەکەی فرۆشت. عەبدولا تووڕە بوو وتی: نایەڵم دەستکاری بکەیت.

کە عائیشە ئەمەیزانی سوێندی خوارد قسەی لەگەڵی ناکات تامردن.

ئەم دووبەرەکییەی درێژەی کێشا، لەپاشان عەبدولا خەڵکی زۆری نارد تالەم هەڵەیەی ببورێت عائیشە ڕەفزی کرد.

ڕۆژێکیان میسوەری کوڕی مەخرەمەو عەبدولرەحمانی کوڕی ئەسوەد (ﷺ) ڕۆشتن بۆلای عائیشە، عەبدولاشیان لەگەڵدا بوو روخسەتیان لە عائیشە خواست کە بڕۆن بۆ لای، ئەویش روخسەتی دان، وتیان هەموومان؟ فەرمووی: بەڵێ هەمووتان. کە ڕۆشتنە ژوور عەبدولا دەستی کردە ملی پوریو زۆر زۆر گریا داوای گەردن ئازادی لێکرد بارشتەی خزمایەتیمان نەپچڕێت.

میسوەر و عەبدولرحمانیش حەدیسێکی پێغەمبەریان(ﷺ) بۆ خوێندەوەو بیریان خستەوە کە دەفەرموێت: "لا يحل لمسلم ان يهجر اخاه فوق ثلاث" واتە: دروست نییە بۆ هیچ موسوڵمانێك کە دەنگ لەبرای موسوڵمانی دابڕێت زیاتر لەسێ ڕۆژ.

ئیتر عائیشە دەستی کرد بەگریانو لەعەبدولا خۆش بوو وەکەفارەتی سوێندەکەی دا.

# ﴿لێبوردنی ئەبوبەکری صدیق﴾

ئەبو بەکر یارمەتی یەکێك لە خزمە هەژارەکانی دەدا، کەئەویش مسطح بوو، ئەم هاوکارییە وای نەکرد لە مسطح کە هاوکاری دوو ڕووەکان نەکات لەبلاّوکردنەوەی بوختانە هەڵبەستراوەکە بۆ عائیشە (ﷺ) کاتێك کە ئایەت دابەزی درۆی دوو ڕووەکانی ئاشکراکرد، پاکی عائشەی دەرخست، ئەبوبەکر بڕیاریدا یارمەتی مسطح نەدات.

بەڵام خوای پەروەردگار ویستی وابوو موسڵمان فێربکات کە لێبوردنت هەبێت بەرامبەر بەوکەسەی خراپەت لەگەڵ دەکات.

ئەم ئایەتە دابەزی [ وَلا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ] نور: ٢٢.

واتە: ئەوانەی کەخاوەنی سامانو بەخشندەیین لە ئێوە باسوێند نەخۆن کەیارمەتی خزمانو هەژارانو کۆچبەران لە پێناوی خوادا نەدەن "لەبەر ئەوەی بەشداربوون لە وتنی بوختانەکەدا" دەبا لێبوردەبن، دەبا چاوپۆشی بکەن، مەگەر حەزناکەن خوا لێتان خۆش ببێت، خوایش هەمیشە لێخۆش بوو میهرەبانە.

ئیتر ئەبوبەکر دوودڵی نەکرد لە لێبوردندا، بۆیە لە مسطح خۆش بوو.

ئیتر یارمەتی دەدا وەکو چۆن لەوەو پێش یارمەتی دەدا وتی: بە ڕاستی من پێم خۆشە خوای گەورە لێم خۆش بێت.

# «لێبوردنی دایکی بڕواداران»

دایکی بڕواداران صەفییەی کچی حویە (ﷺ) خزمەتکارێکی ئافرەتی هەبوو، ڕۆژێك ئەم خزمەتکارە ڕۆشت بۆلای عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) خەلیفەی موسوڵمانان، شکاتی کرد لەصەفیە، وتی: صەفیە ڕۆژی شەممەی پێ خۆشە، چونکە جەژنی جولەکەیە و هەفتانە لەو ڕۆژەدا دەڕوات بۆ سەردانی جولەکەکان، پاشان عومەر ناردی بەدوای صەفیەداو پرسیاری لێکرد، دەربارەی قسەی ئەو ئافرەتە خزمەتکارە.

صەفیەش عومەری دڵنیا کردەوە لەوەی کەلەو ڕۆژەوەی کەموسوڵمان بوو ڕۆژی شەممەی خۆش ناوێ، چونکە خوا بۆی گۆڕیووە بەرۆژی هەینی.

بەلاّم کەدەڕۆم بۆ سەردانی جولەکە وەکو بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی بووە، ئەوانە خزمی منن، کەصەفیە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە پرسیاری لەئافرەتەکە کرد دەربارەی ئەوەی کە کردی لای عومر، ئەویش وتی: شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کردم، بۆیە صەفیەش ئەو خراپەیەی گۆڕیەوە بەچاکە .. لەئافرەتە خزمەتکارەکە خۆش بوو ئازادیکرد فەرمووی: بڕۆ ئازاد بووی.

# ﴿هەڵەیەکی ناشیرین﴾

دەگێڕنەوە یەکێك لە دەوڵەمەندەکان، کەپلەو پایەیەکی تایبەت هەبوو فەرمانیدا بەخزمەت کارەکەی کەخواردنێکی بۆ دروست بکات، تا هەندێ لەهاوکارەکانی بۆ بانگ بکات.

خزمەتکارەکە دەستی کرد بە ئامادەکردنی سفرە، تەشتێکی هێنا کەشلەیەکی گەرمی تیابوو، خزمەتکارەکە لەڕێگەدا قاچی هەڵکەوتو هەندێ لەشلەکە ڕژا بەسەر جل‌وبەرگی پیاوە دەوڵەمەندەکەدا، توڕەبوو فەرمانیدا بە پاسەوانەکانی کەبدەن لەگەردنی ئەم خزمەتکارە، ئەنجا خزمەتکارەکە بینی کە گەورەکەی سوورە لەسەر کوشتنی ئەمیش تەواوی شلەکەی ڕژاند بەسەر جل‌وبەرگی گەورەکەیدا، دەوڵەمەندەکە هەڵچوو زیاتر تووڕەبوو، وتی: تیاچی !! بۆ وادەکەی خزمەتکار؟

خزمەتکارەکە وەڵامی دایەوە: گەورەم ئەمەم لەبەر خاتری تۆ کرد، ترسام سومعەی تۆ بشکێ، تاخەڵکی نەڵێن تۆ خزمەتکارەکەت کوشت لەسەر هەڵەیەکی بێ قابیلەت، ویسم تاوانێ ئەنجام بدەم کەپاشان بمکوژی، تاخەڵکی تۆ تاوانبار نەکەن بە ستەمکار، ئیتر کابرا دەوڵەمەندەکە هەندێ تێڕاما و لەگەڵ خۆیدا چەند چرکەیەك وتوێژی کرد، ئەنجا لای کردەوە بەلای خزمەتکارەکەدا وتی پێی: ئەوا لێت بورام لەبەرئەوەی زۆر جوان پۆزشت هێنایەوە بۆم، ئیتر بڕۆ تۆ ئازادی لەمەودوا !!

## لەکۆتاییدا...

لە رۆشنایی ئەم چیرۆکانەوە بۆمان دەرکەوت کە لێبوردن رەوشتی خواناسانە، سیمای گوێڕایەڵانە وەرەوشتێکە لەو رەوشتانەی کەخوا خۆشی دەوێن.

وەبانگی مرۆڤایەتی بۆ دەکات، سەرجەم پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت خۆیان پێ رازاندوەتەوە، چرای سەرجەم بەندە ئیماندارانە کە لێبوردنیان کردووەتە گوڵەباخی چاکیو داویانە لەیەخی ئەو کەسانەی خراپەیان بەرامبەر کردوون. چونکە زانیویانە پلەی چاکەکاران چەند بەرزە لای خوا، چونکە خوا دەفەرموێت. [الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ] ال عمران: ١٣٤.

واتە: رقو کینەی خۆیا دەخوێنەوە و خۆگرن، لەخەڵکی خۆش دەبنو لێبوردەن، خوای میهرەبانیش چاکەکار و چاکە خوازانی خۆش دەوێت وەخوا لەهەڵەی ئەو کەسانە خۆش دەبێت کەلەخەڵکی دەبورن. وەکو دەفەرموێت: [وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ] النور:٢٢.

واتە: دەبا لێبوردەبن دەبا چاو پۆشی بکەن، مەگەر حەزناکەن خوا لێتان خۆش بێت، خوایش هەمیشە لێخۆشبوون میهرەبانە موسوڵمان لێیدەبوریو چاوپۆشی دەکات لەکاتێکدا کەدەسەڵاتی هەیە، ئەوە بەرزترین پلەکانی لێبوردنە.

چەند جوانە چاوبکەین لەو نموونە جوانانە، چاوپۆشی بکەین لەوکەسەی خراپەمان بەرامبەر دەکات، دڵمان پاکو صاف بکەین کە خۆشەویستیو چاکە هەڵگرێ بۆ هەموو کەس.

# کۆمەڵە چیرۆکێك لەبارەی بەخشندەیی

ئامادەکردنی

مستەفا ئەحمەد عەلی

وەرگێڕانی

ناصح محمد شریف موبڕەیی

# ﴿بەخشین (الانفاق)﴾

الانفاق: بە واتای بچڕینی شت و شاردنەوەی.

لە زاراوەدا واتە:دەرهێنان و جیاکردنەوەی ماڵێکی پاك و حەلاڵ و بەکارهێنان و بەخشینی لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا.

★(الانفاق -النفقه) لەقورئاندا بەواتای: زەکات و خێری سونەت و بەخشین لە پێناو سەرخستنی بەرنامەی خواداو بەخشین بۆ دابین کردنی ژیانی ماڵ و خێزان هاتووە،

★بەخشین جیاکردنەوەی ماڵ و سامان و هەر شتێکی ترە وە هەڵگرتن و شاردنەوەیەتی لە خەزێنەی خودا بۆ ڕۆژی قیامەت.واتە قەرزێکە لای خوا کەلە ڕۆژی قیامەتدا خاوەنەکەی وەریدەگرێتەوە ،﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾(البقره: ٢٤٥).

★بەخشین ڕەوشتی باوەڕداری ڕاستەقینەیە﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾(الانفال ٢-٣)

★بەخشین بازرگانیەکە هەرگیز زیان ناکات ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرۡجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ﴾(الفاطر: ٢٩).

*بەخشین دەبێت لە ماڵی پاك و حەلاڵ بێت﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا كَسَبْتُمْ﴾(البقرة: ٢٦٧).

*بەخشین مرۆڤی باوەڕدار دەخاتە نێو کاروانی (المتقين)﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِى ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾(ال عمران: ١٣٣ ).

*باشترین بەخشین ئەوەیە مرۆڤ لەژیانی خۆیدا و پێش مردنی دەیبەخشێت وپێش خۆی دەخات﴿وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقْنَـٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾(المنافقون: ١٠).

* نەبەخشین لە پێناو خوادا مایەی تیاچوون وبەهیلاك چونی مرۆڤە(وانفقو في سبيل الله ولا تلقوا بأيدكم الى التهلكة).

*خێری بەخشین هەڵدەوەشێتەوەبە:١/منەت کردن ٢./ڕیاکاری و ڕوپامایی.٣/ئازاردانی دڵی ئەو کەسەی پێی دەبەخشیت. ٤/بەخشینی شتێك بە حەرام دەست کەوتبێت.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبْطِلُواْ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ۖ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُواْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾(البقرة: ٢٦٤ ).

*خوای گەورە لەهەموو کەس بەخسندە ترە. ﴿ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ﴾(المائده: ٦٤).

*پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:(ئەگەر ئافرەت لە خۆراکی ماڵەکەی بەخشی و زیادە ڕەوی نەکرد ،ئەوە خێری بەخشین بۆ ئەو هەیەو بۆ مێردەکەشی خێری پەیداکردنی ،ئەمینداری سەر صندوقیش وایە و لەخێری کەسیان کەم ناکات)(البخاری ومسلم).

(ان المسلم اذا أنفق على اهله نَفَقةً وهوَ يحتسبُها كانت لهُ صَدقة)(البخاري ومسلم).

(مامن يوم يُصبحُ العبادُ فيهِ الا ملكان ينزلان فيَقولُ أحدهُما :اللهم أعطِ مُنفقاً خلفاً ويقول الاخر:اللهم اعطِ ممسكاً تلفاً)البخاي ومسلم.

*(من استطاع منكُم أن يستتِر من النار ولَو بشق تمرةٍ فاليفعل)مسلم.

*ئەبو زەر دەڵێت :چومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەسێبەری کەعبەدا دانیشتبوو،کەمنی بینی فەرموی:سوێند بە خوای کەعبە تیا چون ؟!وتم:دایك و باوکم فیدات بن کێن؟!فەرموی:ئەوانەی ماڵیان زۆرە مەگەر کەسێ بە ڕاست و چەپ ببەخشێت،ئەوانەش کەمن.

*پێغەمبەر ﷺ بەخشندەترین کەس بووە بەتایبەت لەمانگی ڕەمەزاندا.

-ابن عباس دەفەرموێت:پێغەمبەرﷺ (بەخشندەترین کەس بووە ،بەتایبەت لە ڕەمەزاندا کەبە لیقای جبریل دەگەشت و جبریل هەموو شەوێکی ڕەمەزان پێی دەگەشت و قورئانی پێ دەور دەکردەوە،ئەو کاتانە پێغەمبەرﷺ وەك شەماڵی بەخشندە بەخشندەبوو) (البخاری ومسلم).

*لەسورەتی (البقره) ئایەتی (٢٦١ تا٢٦٧ )باسی بەخشین و ئادابەکانی بەخشین دەکات.

# «بەخشندەیی»

ئەصمەعی هاوڕێیەکی بەخشندەی هەبوو زۆر سەردانی دەکردو دەچوو بۆلای‌و دیاری‌و بەخششی لێ وەردەگرت، رۆژێك وەك عادەتی جارانی سەردانی کرد، بەڵام خزمەتکارەکەی نەیهێشت بچێتە ژوورەوە بۆلای!! ئەصمەعی تووڕە بوو، کاغەزێکی هێناو تیایدا نووسی:

إذا كان الكريم له حجاب فضل الكريم على اللئيم

واتە: ئەگەر بەخشندە کەسێکی هەبێت‌و رێگری خەڵك بکات لەچوون بۆلای، ئیتر جیاوازی لە نێوان بەخشندە و نادان‌دا چیە؟!

پاشان کاغەزەکەی دایە کابرا بۆ ئەوەی بیبات بۆ هاوڕێکەی، ئەویش لێی وەرگرت‌و چووە ژوورەوە بۆلای، دوای چەند سات‌ێك خزمەتکار گەڕایەوە و کاغەزەکە و کیسەیەك پارە کە (٥٠٠) دیناری تیابوو هێنایەوە بۆ ئەصمەعی، کاتێ سەیری کاغەزەکەی کرد لەپشتەکەی نوسرابوو:

إذا كان الكريم قليل مال تحجب بالحجاب عن الغريم

واتە: ئەگەر بەخشندە ماڵ‌و سامانی کەم بوو ناچار کەسێك لەبەردەرگا دادەنێت تا رێ لەخاوەن قەرزەکان بگرێت.

ئەصمەعی بەهەڵوێست‌و بەخشندەیی کابرا سەرسام بووە کەباری گرانە و هێشتا ئاواش دەبەخشێت، بۆیە رۆشت بۆلای مەئمونی خەلیفە و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، کاغەزەکە و کیسەکەی نیشاندا، مەئمون سەرسام بوو، پیاوێکی بانگ کرد پێی وت: لەگەڵ ئەصمەعی برۆ بۆلای هاوڕێکەی بەبێ ئەوەی بێتاقەتی بکەن، بۆم بهێنە بۆ ئێرە، کاتێ لەگەڵ کابرا هاتن بۆلای مەئمون، بەسەرسامی پرسیاری لێکرد، ئایا تۆ دوێنێ نەهاتی بۆلای ئێمە؟ کابرا وتی: بەڵێ، وتی: ئایا باسی حاڵەتی خۆتت نەکرد بۆمان؟

کابرا وتی: بەڵێ.

مەئمون وتی: ئەصمەعی بەدێرە هۆنراوەیەك داوای لێكردی تۆ كیسەكەی دوێنێت هەمووی پێبەخشی؟!!

كابرا وتی: بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران سوێند بەخوا دەربارەی شكاتی حاڵی خۆم درۆم لەگەڵدا نەكردویت، بەڵام شەرمم لەخوا كرد كە ئەو كەسەی داوام لێدەكات وەك داوای ئەمیری باوەڕداران وەڵامی نەدەمەوە.

واتە: دەبێت ئەویش وەك ئەمیر بەخشندە بێت.

مەئمون زۆر شانازی پێوەكرد و وتی: بەڕاستی عەرەب لەتۆ بەخشندەتری نەبووە!

پاشان رێزی لێگرتو ماڵو سامانێكی زۆری پێبەخشی.

## ﴿بازرگانییەكی بەسوود﴾

عەبدولرەحمان كوڕی عەوف (ﷺ) پیاوێكی بازرگان بوو خەریكی كەسابەتو بازرگانی گەورەبوو، چونكە خاوەنی سامانێكی زۆر بوو كاتێ كاروانی بازرگانییەكەی دەگەیشتە مەدینە و هەلایەكی زۆری دەنایەوە لەبەر زۆریو گەورەیی كاروانەكەی، بەڵام ئەم پیاوە بازرگانییەكی تریشی لەگەڵ خوادا هەبوو، چونكە پیاوێكی سەخیو بەخشندەبوو لەپێناوی خوادا، دەگێڕنەوە كە لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) نیوەی هەموو سامانەكەی بەخشیووە، وەدەگێڕنەوە كە (٥٠٠) وڵاخی لەپێناوی خوادا بەخشیووە، دەوڵەمەندە موسوڵمانەكان ئاوا ژیاون، هەرگیز لەبەخشین لەبەرخوا كەمتەرخەمیان نەكردووە، رازی نەبون خۆیان لەجێگەی نەرمو گەرمدا بنو براكانیشیان لەسەرما خەویان نەبێتو منداڵەكانیان ئازاری برسێتی بچێژن.

# ﴿خۆشبوون لەقەرز﴾

دەگێڕنەوە قەیسی کوڕی سەعد (ﷺ) باخێکی هەبوو فرۆشتی بەمعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (ﷺ) بەحەفتا هەزار، کاتێ نرخەکەی وەرگرت نیوەی بەخشی بەخەڵك" پاشان بەکەسێکی وت: لەمەدینە بانگەواز بکات کێ پێویستی بەپارە هەیە و قەرزی دەوێت بابڕوات بۆلای "قەیس کوڕی سەعد" بۆ وەرگرتنی قەرز، خەڵکێکی زۆر هاتن‌و ئەویش قەرزیدا بەهەموویان تانیوەی ماڵەی تریشی تەواو بوو، لەهەرکەسێك قەرزی لێکردبوو قەیس، کاغەزێکی نوسراوی وەردەگرت. پاش ماوەیەك نەخۆش کەوت، تەنها ژمارەیەکی کەم لەخەڵك سەردانیان کرد، بەخێزانەکەی وت: بۆ خەڵك کەم سەردانم دەکەن؟ ئەویش وتی: زۆربەی خەڵك قەرزای تۆن‌و شەرم دەکەن سەردانت بکەن.

قەیس کاغەزەکانی هێنا کەناوی قەرزارەکانی تیا نووسی بوو، هەموو کاغەزەکانی گەڕاندەوە بۆ خاوەنەکانی کە قەرزیان لێکردبوو، وەبەپێی ڕاگەیاندن کەقەیس لە قەرزەکەت خۆش بووە، بەم شێوەیە لەهەموویان خۆش بوو خەڵك هەموو دڵخۆش‌و شادومان بوون وەسوپاسیان کرد. زۆری نەبرد، خەڵك‌و سەردانکەر زۆر بوون لەماڵی قەیس تا ماڵەکەیان پڕ بوو، بەم شێوەیە قەیس (ﷺ) قەرزی دەبەخشی بەکەسێك پێویستی بوو وەبەشی هەژارانیشی دەدا ئەو هەمیشە لە دوعاکانیدا دەیوت: (اللهم ارزقني مالا فعالاً فإنه لايصلح الفعالة إلا باعمال).

پەروەردگار داوات لێدەکەم ماڵ‌و کردەوەم پێ ببەخشی چونکە کردەوەش "بەخشین" بەماڵ نەبێت ناکرێت.

# «خانووەکەش و پارەکەش بۆ ئێوە»

دەگێرنەوە پیاوێکو هاوسەر و منالەکانی زۆر بەخۆشیو شادی ژیانیان لەخانوویەکدا بەسەر دەبرد، بەختەوەری بالی بەسەریاندا کێشابوو، سالێك گرانی هاتو زۆر بێ پارە و سامان بوون بەناچاری بریاری فرۆشتنی خانووەکەیاندا، پیاوێك هاتو دوای مامەلە و گفتوگۆ خانووەکەی لێکرینو پارەکەی پێدان، پاش چەند رۆژێك.

ئەوان مالیان بەجێ هێشتو کابرای کریار مالو منالی هاتنە ناو خانووەکە، کاتێ شەو داهات کابرا گوێی لەدەنگی گریانێك بوو پرسی ئەوانە کێن دەگرین؟

وتیان: خێزانو منالی ئەو پیاوەیە کەخانووەکەمان لێکریون؟

کابرا پرسی: بۆچی دەگرین؟

پێیان وت: دلگرانو بۆ ئەو خانووە دەگرین کە ئێمە لێمان کریون! تەنها ئەو خانووەیان هەبووە و لەبەر ناچاری بژێوی فرۆشتویانە، ئەم پیاوە کەسێکی خواناسو بەخشندەبوو، دلی بۆ ئەو مالە هاتە جۆشو بیری کردەوە کە بەناچاری خانووەکەیان فرۆشتووە، ئێستا خێزانێك بێلانە و خانوو بوون، بۆیە بانگی خزمەتکارەکەی کرد و پێی وت: برۆ بۆ لایانو پێیان بلێ: کە سبەینێ خانووکەیان بۆ چۆل دەکەین خانووەکەشو پارەی خانووەکەش بەگەردن ئازادی بۆ خۆیان !!

# ﴿ئەی هۆزەکەم - موسوڵمان بن!﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر دڵفراوان‌و بەخشندە بوو بەهەموو کەسێکی دەبەخشی، دڵی کەسی نەدەشکان‌و هەرکەسێ داوای لێبکردایە بێبەشی نەدەکرد، زۆرکەس لەبەخشندەیی پێغەمبەردا(ﷺ) موسوڵمان بوون، یان بۆ ئەوەی پێیان ببەخشێ، بەلاّم کاتێك خوای گەورە دڵ‌و دەرونی پڕدەکردن لەباوەڕ و دڵیان بەنوور و ڕۆشنایی ئیسلام ڕۆشن دەبووەوە، ئیتر خوا و پێغەمبەری خوایان(ﷺ) لەهەموو سامانی دنیا لا خۆشەویست تربوو، ساڵێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڵێ مەڕو بزنی هەبوو لەوکاتەدا لەنێوان دوو شاخدا مەڕ و مالأتەکەیان دەلەوەڕاند پیاوێك بینی‌و پێی سەرسام بوو.

ڕۆشت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد ئەو مێگەلەی پێ ببەخشێ ئەویش بێدڵی نەکرد و پێی بەخشی، بەدڵخۆشییەوە گەڕایەوە بۆلای گەلەکەی ، هاواری کرد: ئەی گەلەکەم وەرن موسوڵمان ببن، سوێند بەخوا محمد (ﷺ) وەك کەسێك دەبەخشێت کەهەرگیز لەهەژاری نەترسێت؟!

لەم بارەوە ئەنەس کوڕی مالیك دەڵێت: زۆرجار بووە کەسێك تەنها لەبەر ماڵ‌و سامانی دونیا هاتووە و موسوڵمان بووە، بەلاّم بە ڕاستی ئیسلامەتی تەواو نابێت ئەگەر ئیسلامی لا گەورەترو خۆشەویست تر نەبێت لەهەرچی دونیا و ئەوەش لەدونیادایە بە (مسلم).

# ﴿هاوڕێیەكی قەرزار﴾

پیاوێك ڕۆشت بۆماڵی هاوڕێیەكی خۆیو پێی وت: هاتووم بۆ داوای شتێك، هاوڕێكەی وتی: پێویستت بەچییە؟ وتی: قەرزێكی زۆرم لەسەرەو كاتی تەسلیم كردنەوەشی هاتووەو دەمەوێت لەوادەی دیاریكراوی لانەدات.

هاوڕێكەی هەستا و ئەوپارەیەی داوای كردبوو لەگەڵ زیادەیەكیشدا بۆی هێنا، هاوڕێكەی زۆر سوپاسی كرد و بەخۆشحاڵییەوە گەڕایەوە لەدوای ئەوە كابرای هاوڕێی دەستیكرد بەگریان، ئەوەندە بەتوندی دەگریا خێزانەكەی واگومانی برد بۆ ماڵو سامانەكەی دەگری كە هاوڕێكەی بردوویەتی بۆیە پێی وت: گریانی بۆچییە، ئەگەر حەزت نەدەكرد پارەكەی بدەیتێ، داوای لێبوردنت لێ بكردایە و پارەكەت بەقەرز نەدایە، ئیتر پێویستی بەم خەمو گریانە نەدەكرد، خۆتۆ دەتزانی ئێمە ئەوەندەمان پارە نامێنێ كەبەشی خۆمان بكات.

كابرا وتی: من بۆ پارەكەم ناگریم، بەڵكو بۆ ئەوە دەگریم كە دەبوو پێش ئەوەی ئەو داوام لێبكات، من خۆم پرسیارم لێبكردایەو ئاگاداری حاڵی بوومایەو نەمهێشتایە كەقەرزار زۆری بۆ بهێنێ، پێش ئەوەی خۆی داوابكات.

ئەوە هاوڕێیەتییە كە نەمهێشتایە قەرز لەخەڵكی تر بكات، نەك قەرز بكاتو پاشان داوا لەمن بكات.

# «بەخشین بەنهێنی»

سەرلەبەیانیەك هەژارەکانی شاری بەغدا کەهەستان و چونە دەرەوە بۆ پەیداکردنی بژێوی ڕۆژانەی ژیانیان، لەبەر دەرگای ماڵەکانیان کیسەی پڕلە پارەیان بینی کەپڕ بوو لەدینار، بەسەرسامی پارەکەیان هەڵگرتەوە و پرسیاریان دەکرد، دەبێ ئەم پارە لەکوێوە هاتبێ و کێ ناردبێتی؟؟

دوای ماوەیەك بۆیان ئاشکرابوو کە فەزل کوڕی یەحیا وەزیری عەبباسی فەرمانی بەخزمەتکارەکانی کردووە کە بچن ئەو کیسە پارانە بەنهێنی لەبەردەگای ماڵە هەژارو کەم دەرامەتەکاندا دابنێن لەشاری بەغدا، وەفەرمانی کردبوو کەزۆر بەنهێنی کارەکە ئەنجام بدەن و کەس نەیان بینێ.

فەزل یەکێك بووە لەدەوڵەمەندە دڵفراوان و سەخییەکان، بەخشندەیی بەشێوەیەك بووە کەشەوی وابووە سەد هەزار دیناری بەخشیوە، یان لەزستاندا هەرچی لەخەزێنەکەیاندا بووە بەخشیویەتی وەلەهاویندا بەهەمان شێوە، بۆیە خەڵکی ئەم پیاوە بەخشندەیان زۆر خۆش دەویست.

خوای گەورە بەخشندەترە، موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێ) لەخوای گەورەی پرسی کە کەمترین پلەی بەهەشت و نزمترین کەس لەبەهەشتدا کێیە؟

خوای گەورە فەرمووی: لەدوای ئەوەی خەڵکی بەهەشت دەچنە بەهەشت پیاوێك دەهێنن دەڵێت: پەروەردگار واخەڵك چونە شوێنی خۆیان و پاداشتی خۆیان وەرگرت؟!

پێی دەوترێ: ئایا تۆش ڕازی دەبیت بەئەندازەی پاشایەك لەپاشاکانی دنیا سەروەت و ماڵت هەبێ؟ دەڵێت: بەڵێ پەروەردگار ڕازیم.

پاشان موسا "سەلامی خوای لێبێ" پرسیار لە پەروەردگار دەکات کە بەرزترین پلە لەبەهەشتدا چ کەسێکە؟

پەروەردگار دەفەرمویێت: ئەوانە کەسانێکن کەخۆم دەمەوێت بەخششەکانیان بەدەستی خۆم دیاری کردووە و مۆرم لێداوە، هیچ چاوێك نەیدیووە، هیچ گوێیەك شتی وای نەبیستووە و بەدڵی هیچ کەسێکدا نەهاتووە، واتە: ئەوانە خۆم هەڵم بژاردوون، هیچ کەسێك ناتوانێ خەیاڵی ئەوە بکات کەبۆم ئامادەکردوون و پێیان دەبەخشم، کەس نازانێ چیم لەخۆشیو نیعمەتەکانی بەهەشت بۆسازو ئامادە کردوون (مسلم).

## «پێشبڕکێ لەسەر چاکە»

هاوەڵان (رضي الله عنه) هەمیشە لەکردەوەی چاکدا پێشبڕکێیان کردووە، ئەبوو بەکر (رضي الله عنه) لەپێش هەموویانەوە بوو.

جارێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای لەهاوەڵان کرد بۆ بەخشین لە پێناوی خوادا، هەموویان دەستیان کرد بەجێبەجێ کردنی فەرمانەکە.

عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) گەڕایەوە بۆ ماڵو نیوەی ماڵەکەی هێنا، لەگومانی خۆیدا وایدانابوو کە ئەو لە ئەبوبەکر زیاتری هێناوە بۆیە دەیوت: ئەمڕۆ پێش ئەبوبەکر دەدەمەوە.

کاتێ عومەر پارەکەی دایە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: چیت بۆ ماڵو مناڵت جێ هێشتووە؟ عومەر فەرمووی: بەئەندازەی ئەوەی کەهێناومە واتە: نیوەی.

پاش چەند ساتێك ئەبوبەکر (رضي الله عنه) هاتو هەموو ماڵەکەی هێنا، لەبەردەم پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) داینا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر چیت بۆ ماڵەوە هێشتووەتەوە؟

وتی: خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

ئینجا عومەر وتی: سوێند بەخوا لەهیچ شتێکدا پێشت نادەمەوە "مەبەستی ئەوەبوو کە ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کەس لەخێرو چاکەدا نەیتوانیووە پێشی بداتەوە.

# «بەخشندەیی خاوەنی دوو نوور»

عوسمان (ﷺ)کە بەخاوەنی دوو نور ناسراوە، چونکە دوو کچی پێغەمبەر (ﷺ) هاوسەری بوون، هەمیشە بەخشندە بووە، ژیانی پڕە لە هەڵوێستی بەخشندەیی کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچ دەکات بۆ مەدینە، بینی خەڵك لەبیرێك ئاو دەخۆنەوە کەناوی بیری "ڕومەتە"یە کەباشترین بیری مەدەینە بوو، خاوەنی بیرەکە نەیدەهێشت خەڵك ئاوی لێدەربهێنن تا نرخەکەیان نەدایە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کێ بیری ڕەومەتە دەکرێت‌و خۆشی وەك موسوڵمانان ئاوی لێدەر دەهێنێ ئەوە بۆی چاکترە، ئەو کەسە لەبەهەشتدایە.

عثمان بەپەلە ڕۆیشت‌و مامەڵەی لەگەڵ خاوەنی بیرەکەدا کرد و کڕی، پاشان کردی بەخێر بۆ هەژاران‌و دەوڵەمەند و ڕێبوار، هەموویان بێ بەرامبەر لێی بخۆنەوە.

جارێکی تر پێغەمبەر بینی وانوێژکەران ڕوو لە زیادبوونن‌و مزگەوتە کە بچوکە و جێگەی کەمە، پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوەڵەکانی فەرموو: کێ پارچە زەوی فلان خێزان دەکرێت کە (دراوسێی مزگەوت) بوو وەدەیخاتە سەر مزگەوت بەخێر و چاکە، ئەوە لەبەهەشتە؟ لێرەشدا عوثمان پەلەی کرد و پارچە زەویەکەی کڕی‌و خستییە سەر مزگەوت.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری دەرچونیدا بۆ غەزای تەبوك موسوڵمانان لەو ڕۆژگارەدا لەهەژاری‌و نارەحەتیدا بوون، پێغەمبەری خواش (ﷺ) نەیدەتوانی سەربازەکان ئامادە و ساز بکات‌و پێداویستی سەربازی هەموویان دابین بکات، بۆیە ئەو سوپایە ناونرا سوپای سەختی.(العسرە)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگیکرد: هەرکەس پێداویستی سوپای (العسرە) دابین بکات بەهەشتی بۆ هەیە.

عوسمان (ﷺ) پێداویستی هەموو سوپاکەی دابینکرد لەماڵ‌و سامانی خۆی بەمەش چەندین جار مژدەی بەهەشتی لەلایەن پێغەمبەری خواوە پێ دراوە.

# ﴿دارخورمای بەهەشت﴾

یەکێك لەهاوەڵان خاوەنی باخێك بوو، لەوباخەدا دارخورمایەك هەبوو کەخاوەنەکەی پیاوێکی تربوو، ڕۆژێك ئەم هاوەڵە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێکرد لەنێوان ئەو و هاوەڵەکەیدا (خاوەنی دارخورماکە) ببێتە ناوبژیوان تا دارەکەی پێ ببەخشێ.
پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بەشوێن کابرادا، کاتێ هاتە خزمەتی داوای لێکرد ئەو دارخورمایەی بداتێ لەبەرامبەر دارخورمایەك لەبەهەشتدا.
کابرا ڕازی نەبوو، کاتێ ئەبو دەحداحی هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ڕووداوەی بیست، ڕۆشت بۆلای خاوەنی دارخورماکە و داوای لێکرد ئەو دارەی پێ بفرۆشێت لەبەرامبەر باخێکدا!!
کابراش ڕەزامەندی نواند، چونکە هەموو باخەکەی ئەبوو دەحداح لەبەرامبەر تەنها دارخورمایەکدا وەردەگرێت!!
پاشان ئەبو دەحداح چووە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەهەواڵی پێدا کە دارخورماکەی کڕیوە و ئێستا دەیبەخشێ بەپێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش بیدات بەکابرای خاوەنی باخەکە، کە دارخورماکەی تیابوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئای لەژمارەی دارخورماکانی ئەبو دەحداح لەبەهەشت چەندە زۆرە کە خوای گەورە لەبەرامبەر ئەوکارەیدا بۆی ئامادە کردووە.
ئەبو دەحداح گەڕایەوە بۆناو باخەکەی کە فرۆشتبووی بەدارخورماکە، چونکە خۆی و ماڵ و منداڵی لەوباخەدا دەژیان، بانگی هاوسەرەکەی کرد وتی: دایکی دەحداح، لەباخەکەدا وەرە دەرەوە من فرۆشتوومە بەدارخورمایەك لەبەهەشتدا، هاوسەری خواناس و باوەڕداری وتی: بەڕاستی مامەڵەکەت قازانجی کردووە.

## ﴿درهەمەکان تەواو بوون﴾

ڕۆژێك عەبدوڵلاّ کوڕی زوبەیر (ﷺ) سەد هەزار درهەمی نارد بۆ خاتوو عائیشەی پوری (ﷺ) ئـەویش پارەکـەی لەسـەر تافێـك دانـا و دەسـتی کـرد بەدابەشـکردنی بەسـەر هەژارانـدا، هـەتا تافەکـە درهـەمێکی تیانـەما وەلـە ماڵەکەشیاندا درهەمێك نەبوو، ئەو ڕۆژە خاتوو عائشە دایکی ئیمانـداران (ﷺ) بـەڕۆژوو بـوو کـاتێ ئێـوارە هـات بەخزمەتکارەکـەی وت: خواردنێـك بهێنـە، خزمەتکار لەماڵەکەدا هیچی نەبینی کە بیهێنێ بۆ خـاتوو عائشە جگـە لـەنان و زەیت، وتی: ئەی دایکی بـاوەڕداران نـەدەکرا درهـەمێك بهێڵیتـەوە تاگۆشتی پێ بکڕین؟!

دایکی باوەڕداران وتی: ئەگەر ئەوکاتە بیرت بخستمایەوە وام دەکرد.

بەم شێوەیە خاتوو عائیشە (ﷺ) بەهەژارانی دەبەخشی‌و بیری خۆی نەبوو.

## ﴿بەخشینێکی مەزن﴾

دووهاوەڵ پێکـەوە گەشـتێکیان ئەنجامـدا، لـەناو بیابانـدا دەڕۆشـتن لەوکاتـەدا بایەکی زۆر توند هەڵیکرد و ئاسمـان بـوو بەهـەور تاریـك بـوو، بـارانێکی لێزمـە دەستی پێکـرد، ئـەودوو هاوەڵـە گـەڕان بـۆ شـوێنێك تالـە بارانەکـە بیانپـارێزێ، خێمەیـەکیان بـەدی کـرد کـە ئـافرەتێکی تێـدابوو، چوون‌و داوای یارمـەتیان کـرد کەلـەناو خێمەکـەدا بمێننـەوە تابارانەکـە خـۆش دەکاتـەوە، ئـەویش مۆڵەتیـدان کـاتێ مێردەکـەی لـەدەرەوە گەڕایـەوە، هاوسـەرەکەی پێـی وت: ئـەمڕۆ دوومیـوان هاتوونە لامـان، پیاوەکە ڕۆشـت‌و پێشوازی‌و بـەخێرهاتنی لێکـردن، پاشـان چـوو وشـترێکی هێنـا و سـەری بـڕی‌و گۆشـتی بـۆ ئامـادەکردن کـەمێك لەگۆشـتەکەیان خوارد.

لەڕۆژی دووەمدا یەکێکی تری بۆ سەربڕین، دووکەسەکە پێیان وت: ئەوەی دوێنێ سەرت بڕی پارچەیەکی کەممان لێخواردووە، ئیتر بۆ وشتری تر سەردەبڕی.

پێی وتن: من خواردنی بەسەرچوو نادەم بەمیوانەکانم!! بەم شێوە چەند ڕۆژێك باوبۆران بەردەوام بوو، ئەوانیش بەناچاری لەلای ماڵەکە مانەوە، ئەویش هەموو ڕۆژێك حەیوانێکی تازەی سەر دەبڕی.

کاتێ باوبۆرانەکە تەواو بوو دنیا سامالّی کرد دوو هاوڕێکە خۆیان بۆ ڕۆیشتن ئامادەکرد، پێش ئەوەی بڕۆن (١٠٠) دیناریان لەناو خێمەکەدا وەك وەفا و پاداشتێك بۆ پیاوەکە بەجێ هێشت، چونکە لەوکاتەدا پیاوەکە ڕۆیشتبوو بۆ کار و لەناو خێمەکەدا نەبوو وەبە خێزانەکەیان وت: داوای لێبوردن لەهاوسەر و مێردەکەت دەکەین، بەڕاستی چەند ڕۆژێکە ماندوومان کرد و بووینە ئەزیەت بۆتان، ئەم پارەیەش وەفاداری ئێمە بۆ ئێوەی میوان دۆستو بەڕێز

کاتێ پیاوەکە گەڕایەوە و خێزانەکەی قسەکانی بۆ گێڕایەوە و پارەکەی کە جێیان هێشتبوو دای بەمێردەکەی، زۆر تووڕەبوو پارەکەی هەڵگرتو سوار ولآخێك بوو، لەدوایان ڕۆیشت پاش ماوەیەك گەیشتەوە بەدوو هاوەڵەکەو بەتوندیو توڕەیی قسەی لەگەڵ کردن، نەیانزانی هۆی چییە، کابرا کیسە پارەکەی بۆ فڕێدانو وتی: هەڵیبگرنەوە ئەگەر نا بەتیرەکەم بریندارتان دەکەم، پاشان پێی ڕاگەیاندن کەئەو هەرگیز نرخی میوانداری لەمیوانەکانی وەرناگرێت!!

دووهاوەڵەکە پارەکەیان هەڵگرتەوە و شادو سەرسام بوون بەهەڵوێستی کابرا.

## لەکۆتاییدا...

بەخشندەیی ڕەوشتێکی جوانو گەورەیە، پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) خاوەنی ئەم ڕەوشتە بوون، پێغەمبەری ئیسلامیش (ﷺ) لەناو گەلەکەیدا بەڕەوشتی بەخشندەیی ناسرابوو، هەروەها هاوەڵانو یارانیشی بەهەمان شێوە.

بەڕاستی بەخشندەیی لەگرنگترین ڕەوشتەکانی باوەڕداری ڕاستە، وەهەمیشە مەشخەڵو بەیداخێتی.

موسوڵمان هەمیشە بەخشندەیە و هەرگیز چروكو نەبەخش نییە.

بەخشندەیی ڕەوشتێکە خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشیان دەوێت پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (إن الله تعالى كريم يحب الكرم ويحب معالي الاخلاق، ويكره سفسافها) الطبراني.

بەخشندەیی ڕێگەی چوونە بەهەشتو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای میهرەبانە لەدنیا و دواڕۆژدا.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (السخاء شجرة من اشجار الجنة اغصانها متدليات في الدنيا، فمن اخذ بغصن منها قادة ذلك الغصن الى الجنة، والبخل شجرة من اشجار النار اغصانها متدليات في الدنيا، فمن اخذ بغصن منها قادة ذلك الغصن الى النار) (البيهقي).

واتە: سەخاوەتو دڵفراوانیو بەخشندەیی درەختێکی بەهەشتە، چڵو لقەکانی درێژ بۆتەوە بۆ دنیا، هەرکەس دەست بەلقێکی ئەو درەختەوە بگرێت بەرە و بەهەشتی دەبات، چروکیش درەختێکی دۆزەخە، چڵو لقەکانی درێژ بۆتەوە بۆ دنیا، هەرکەس دەست بە لقێکی بگرێت بەرەو دۆزەخی دەبات.

ئەم چیرۆکانەش باسی بەخشندەیی دەکات فێرمان دەکات چۆن پابەندبین بەبەخشینو دووربین لەچروکی .

ئەم نموونانەش نموونەی کەسانی بەخشندەن کە مامۆستاکەیان پێغەمبەری ئیسلام (محمد) (ﷺ) و لەقوتابخانەی ئیسلامدا پەروەردەکراون.

## ناوەرۆك

## بەرهەمەکانی پرۆژەی هیوا

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئیسراو میعراج | ژمارە ١ | ڕەوشتی باران | ژمارە ٢٤ |
| (٣٠) تایبەتمەندی ڕۆژی هەینی | ژمارە ٢ | جولەکە | ژمارە ٢٥ |
| دڵ و زوبان | ژمارە ٣ | کۆمەڵە پرسیارو وەڵامێك سەبارەت بە گەشتیاری مسوڵمان | ژمارە ٢٧ |
| جەستەی مرۆڤ | ژمارە ٤ | گوڵبژێرێك لە وتارەکانی م.سید احمد | ژمارە ٢٨ |
| چۆن دوعا بکەین | ژمارە ٥ | سڵاوات | ژمارە ٢٩ |
| گۆرانی و مۆسیقا | ژمارە ٦ | (١٢٥) پرسیارو وەڵام | ژمارە ٣٠ |
| هاوسەرگیری لە نێوان خزماندا | ژمارە ٧ | باڵاپۆشی | ژمارە ٣١ |
| چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان | ژمارە ٨ | وەسوەسە | ژمارە ٣٢ |
| وەسوەسە | ژمارە ٩ | البنوك الاسلامیه | ژمارە ٣٣ |
| چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان | ژمارە ١٠ | تەفسیری قورئان بە وێنە | ژمارە٣٤ |
| چۆنێتی نوێژی پێغەمبەر | ژمارە ١١ | مسوڵمانی بەهێز | ژمارە ٣٥ |
| ئیسلامو جەنگی ئاینی | ژمارە ١٢ | ٤٠ هۆکار بۆ ڕەمەزان | ژمارە ٣٦ |
| ئیمان بنچینەو حەقیقەتو...... | ژمارە ١٣ | سەربوردێکی خێرا بە مێژووی مسوڵمان | ژمارە ٣٧ |
| دوایین میوان | ژمارە ١٤ | تەقوا لەقورئان و سوننەتدا | ژمارە ٣٨ |
| چیرۆکی ئادابە ئیسلامیەکان | ژمارە ١٥ | حەوت کۆمەڵی ژێر سێبەری عەرش | ژمارە ٣٩ |
| بیلالی حەبەشی | ژمارە ١٦ | هاوڕێی دۆلفین/منداڵان | ژمارە ٤٠ |
| قەزاو قەدەر | ژمارە ١٧ | ئادابی منداڵی مسوڵمان | ژمارە ٤١ |
| ٣٠ هەڵوێستی بانگەواز | ژمارە ١٨ | ٤٠ ئامۆژگاری بۆ جگەر گۆشەکەم | ژمارە ٤٢ |
| درودی خوایی | ژمارە ١٩ | محمد هەڵبژاردەی خوایی | ژمارە ٤٣ |
| هاوسەرگیری خەریزەیەکی شەرعی | ژمارە ٢٠ | فەزڵی زانست | ژمارە ٤٤ |
| با منداڵانمان وا پێبگەن | ژمارە ٢١ | ٢٠ بنچینەی پێشەوا بەننا | ژمارە ٤٥ |
| ئاسەوارەکانی گوناه | ژمارە ٢٢ | | |
| پێغەمبەرەکەت بناسە | ژمارە ٢٣ | | |

## لەم پەڕاوەدا ..

کۆمەڵێك چیرۆك و بەسەرهاتی ڕاستەقینە لەژیانی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت)و هاوەڵان و پێشبینانی ئوممەتی ئیسلام دەخوێنیتەوە کەباس لەڕەوشتەکانی :

- نەرم و نیانی
- شەرم
- بەزەیی
- جوامێری
- شوکرانە بژێری
- ڕاوێژکردن
- ڕاستگۆیی
- گوێڕایەڵی
- لێبوردن
- بەخشندەیی
- دڵسۆزی.
- ئەمانەت.
- لەخۆبوردەیی.
- چاکەکردن.
- هاوکاری.
- بێفیزی.
- پشت بەخوا بەستن.
- خۆشەویستی.
- ئارامگری.
- داد پەروەری.
- وەفاداری.

دەکـــــــات.




ژمارەی سپاردنی ١٤٧٣ی ساڵی ٢٠٠٩ پێ سپێردراوە.

رخی حەوت هەزا دینا